# هەناسە
# و
# هەوراز

رۆمانە یاد



سەعدی عەلی




هەولێر٢٠١٣

# هەناسەو هەوراز
## (ساتە سەختەکانی تەمەن)


نووسەر : سەعدی عەلی
بابەت : ئەدەبی
پیتچنی: نووسەر
هەڵەچنی : جەوهەر خۆرشید
نەخشەسازی ناوەڕۆك : سۆزان محەمەد عەزیز
نەخشەسازی بەرگ : ئامانج ئەمین
تیراژ : ٥٠٠ دانە
چاپ : چاپخانەی رۆشنبیری
نرخ : ٣٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (٢٧٧٢) ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر
هەولێر - گەڕەکی ڕاستی / تەنیشت گەراجی بەغدا
باڵەخانەی بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٦٦٢٢٥٨٥١١٣

# من و بەغداو سەربازی

لە ( رئیس عرفاء-حەمەدەمین)م پرســـی بۆ کوێ گوازراومەتەوە...؟ ئـــەو هەر ئەوەندەی پێ وتم کە لە کەرکوک تێپەڕ دەبین، (رئیس عرفاء -حەمەدەمین)ئەو کابرایە بوو کە ئەگەر ســـەربازێک یان چەند سەربازێک لە یەکەیەکی ســـەربازی بۆ یەکەیەکی تر بگوازرابوونایەوە یەکێکی خەت لـــە قۆڵیان لەگـــەڵ ڕەوانە دەکرد کە پێ یـــان دەوت (مەئموور).. ئەو مەئموورە بەرپرســـیار بـــوو لە گەیاندنی ئەو ســـەربازە یان ئەو چەند ســـەربازە تازەیە بۆشوێنی مەبەســـت، هەر خەتێک نیشانەی پلەیەکی ســـەربازی بوو. یەک خەت سەربازی یەکەم، دوو خەت نائب عریف، سێ خـــەت عریف و چـــوار خەتیش رئیس عرفاء بوو. خەتەکانی ســـەربازی بـــە پێچەوانەی خەتی پۆلیس بوون چونکە خەتە کانی قۆڵی پۆلیســـە دەرەجەدارەکان لە شـــێوەی ژمـــارە ( (٨)) بوون بەڵام ئەوانیش هەمان پلە بوون.

رئیـــس عرفـــاء-حەمەدەمین) لـــە تەمەنی ٣٥ تا ٤٠ ســـاڵ دەبوو، خەڵکـــی نزیکی کەرکوک بوو، زۆری پێ خـــۆش بوو کە بۆتە (مەئموور) چونکە دوای ئەوەی منی دەگەیاندە شـــوێنی مەبەست ئەو دوو ڕۆژی تر دەچۆوە ناو ماڵ و مناڵەکەی و پشـــووی دەدا. جگە لەوەی پارەی ئیفاد بوونیـــان بۆ خەرج دەکرا... ئـــەو ڕۆژە ١٩٧١/٥/٢٦ بوو من مانگێک و ڕۆژێک بوو بەرگی ســـەربازیم لەبەر کردبوو لە ناوەندی مەشـــقی هەولێر بووبوومە (سەربازی موکەلەف) کە ئەو یەکە سەربازیە بۆ مەشق پێکردنی ئەو ســـەربازانە بوو کە تازەو بۆ یەکەم جار دەبوونە سەرباز و دەکەوتە ناوەڕاســـتی ئۆردی هەولێر. ئیستا شوێنەکەی بۆتە گەڕەکی بەختیاری و پارکی سامی عەبدولرەحمان. من دەبوا ١٩٧٠/١/١ پەیوەندی بە خزمەتی ســـەربازیم بکەم بە پێ ی یاســـای سەربازی ئەوساکە، بەڵام بەهۆی ئەو گۆڕانکاریەی بەسەر کوردســـتاندا هات بە لاساری مەسەلەکەم وەرگرت،

چونکە لە ســـاڵی ١٩٦٩ دوای ئەوەی پۆلی سێ ی ناوەندیم تەواو کردو لە خوێندن بەردەوام نەبووم دەبوا ســـەردانی (تجنید)بکەم و دەفتەری خزمەتی سەربازی وەربگرم چونکە وازم لە خوێندن هێنابوو. دوای بەیانی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ لێبوردنێک بۆ هەموو کوردە لەخزمەتی ســـەربازی ڕاکردووەکان لە خزمەتی ســـەربازی دەرچوو کە دوای ســـاڵێک واتە تا بەهاری ساڵی ١٩٧١ دەرفەتیان پێ درا و ئەوانەی سەردانی (تجنید) یان کرد لە دەفتەرەکەیان ئەو ماوەیە دیاری کرا . . منیش هەر لەســـەر ئەو قەناعەتە بووم کە ئەو بڕیارە منیش دەگرێتەوە بۆیە بێ خەم لێم پاڵداوە بـــێ ئەوەی بچمـــە (تجنید) و لە دەفتەرەکەم تۆمـــار بکرێ. . لە دوای ســـاڵێک کە ســـەردانی تەجنیدی هەولێرم کرد و دەفتەرەکەم وەرگرت، لەســـەر دەفتەرەکەم نووســـرابوو(متخلف عن الفحص و السوق) چونکە ساڵی پێشوو سەردانیانم نەکردبوو تا لە دەفتەرەکەم تۆمار بکرێ.

لە نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٧١/٥/٢٥ من و دوو کەســـی تر بووین ئێمەیان گەیاندە ناوەندی مەشـــق پێکردنی هەولێر و لە قەڵەم نووســـراوەکەیان وەرگرت و پێ یان وتین ئەمشـــەو بچینـــەوەو بەیانی لێرە ئامادە بین. . بۆ بەیانی کە چووینەوە ســـەربازگە یەکســـەر سەریان سفر کردین و هەر یەکەو جلێکی ســـەربازیان پێ دایـــن، ( (کلیم)) و (بەتانی) یەک و هەر ئەو ڕۆژەش ئێمەیان بۆ گۆڕەپان بەڕێ کرد. دوای چەند ڕۆژێک ئەوانەی ســـاڵی پار بۆ ســـاڵێک مۆڵەتیان پێ درابوو بوونە ســـەرباز و ئەوانیش ســـەریان ســـفر کرا و هاتنە گۆڕەپانەکە . هەندێکیان تەمەنیان لە کاتی خۆی تێپەڕ بووبوو. (ڕەحمان) ی کوڕی پوورم و چەند کەسێکی خەڵکی گوندی (ترپە ســـپیان) لەناو ئەو خەڵکانە دابوون کە تەمەنیان لە نێوان ٢٥ تا ٣٠ ساڵ زیاتر بوو. لە ڕاکردنی بەیانیان کێشەیەکی زۆریان هەبوو، زۆریـــان قەڵەو بوون نەیاندەتوانی لەگەڵ گەنجـــە لاوازەکانی وەک ئێمە ڕابکـــەن. ڕۆژێکیان کوڕێکی گوندی (گرد عازەبـــان) کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە لە کاتی ڕاکردن من و ئەو لە ڕیزی پشـــتەوە بووین، هەر هێندە

دەســـتمان بە ڕاکردن کرد ئیتر ئەو هەناسە سوار بوو چونکە زۆر قەڵەو بوو..! بە هەناســـە برکێ ناوە ناوە دەیگوت ((کوڕە ســـەعدی بە جێم مێڵـــە)) منیش ناچار بووم لەبەر تکای ئەو خۆم دوابخەم.. ئەو خەت لە قۆڵەی کە مەشـــقی پێ دەکردین هات و یەکەو داری لێداین، ناچار بووم جێ ی بهێڵم.

مـــن لە منالیمـــەوە وا ڕاهاتبووم کە کارێکم دەکرد ســـەری زمانم لە دەمم دەردەهێنا، لە کاتی چەپ و ڕاست و مەشق کردن دیارە من ئاگام لـــە خۆم نەدەما زمانم دەردێنا. عەریفێکی عەرەب مەشـــقی دەداین هەر جارێکی دەیدی من زمانم دەردێنم چاوی دەچووە پشتی سەری و هاواری بە ســـەرم دا دەکرد.. ڕۆژێک لە ڕیزەکە دەریکردم وتی (ولک لیش تطلع لســـانک) منیش تێگەیشتم کێشـــەکە چیە. چونکە عەرەبیم نەدەزانی تا بـــە عەرەبی وەڵامی بدەمەوە بە کوردی وتم (عەریفی ئەوە فێربوومە.!) لە یەکێکی پرســـی دیاربوو دەیزانی ئەو ســـەربازە عەرەبی دەزانی وتی (شیگول) ئەویش قسەکەی بۆ تەرجومە کرد.. بەڵام هەڕەشەی لێ کردم ئەگەر ئەو جارە زمانم دەربینم (زحف)م پێ دەکا. لە سەربازی (زحف)، یەک لە ســـزایە ناخۆشەکان بوو کە سزادراو لەسەر زگ و ئانیشک دەبوو بـــۆ ماوەیەک بخشـــێ. بەڵام خوا کردی بـــۆ ڕۆژی دوایی ئەو (عریف)ە نەهاتەوە بۆ مەشق پێ کردن.

لەبەر ئەوەی ڕێکەوتن لە نێوان شۆڕشـــی کـــورد و ڕژێم هەبوو بۆیە بارودۆخـــی کورد لە ســـەربازی زۆر خراپ نەبوو. ئەفســـەرێکمان هەبوو کە ئەستێرەیەکی لە شـــان بوو، ئەو پلەیە پێ ی دەوترا (ملازم ثاني). دەیانگـــوت ئەوە پێشـــمەرگە بووەو بـــە پێ ی ڕێکەوتـــن پلەکەی پێ دراوەتەوەو بۆتە ئەفسەر ناوی (ملازم ح. خ) بوو. پیاوێکی بە هەیبەتی بـــاڵا ڕێک و توندوتیژ بوو. زۆر جاران ئێـــواران بەناو هۆڵەکاندا دەگەڕا. لە کاتێک کە ئێمە پێخەفمان لە هۆڵەکاندا ڕادەخســـت. من فێرە مەشقی ســـەربازی و خواردنی ســـەربازی نەبووم. ئەو خواردنەی کە دەهات بە

تایبەتی شـــلەکەی زۆر چەور بوو، ڕۆژانی سەرەتایی یەکان زۆر کاری تێ کـــردم و تەندروســـتی تێک دام دوایە ڕاهاتم و بـــاش بووم. ماوەی یەک مانگ لە ناوەندی مەشق کردن مامەوە، مەشقە سەرەتایی یەکانمان تەواو کردبوو. نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٧١/٦/٢٦ من بۆ (قصعة) واتە بەشە خواردن چوویـــووم کە نۆرەی من بوو. لە گەڕانەوەم پێ یان گوتم (رئیس عرفاء حەمەدەمین) کاری پێتە. منیش (قصعة) کەم برد لە پێشـــم دانا کە لە هۆڵەکە لەســـەر چوار پایەک لەگەڵ یەکێکی تر دانیشتبوو. گوتی (ئەمە چیە..؟). ســـەربازێک لە پشتم وەســـتابوو لەجیاتی من وەڵامی دایەوە گوتی (رئیسی ئەمە ج. م سەعدی عەلی یە) ئیتر تێ ی گەیاندم کە من کاتێ لێ یان پرسیوم چ پیشەیەک دەزانم من ناوی خۆم بە (سەرتاش) تۆمار کردوە بۆیە ئێســـتا گوازراومەتەوە بۆ ئەو یەکەیەی پێویستیان بە سەرتاشـــە. بەڕاســـتی ڕۆژێکی ناخۆش بوو. من شارەزاییم لە چ شارێک نەبـــوو. تەنیا هەولێرم دیبوو. ئیتر دوای نان خـــواردن، وابزانم من بۆم نەخورا، بۆ وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر بەڕێ کەوتین . لە ڕێگا هەر دڵی دەدامەوە کە من دەچمە شوێنێکی خۆش و لە کۆڵ مەشق و ئێشک گرتن دەبمەوەو دەچمە سەر کارەکەی خۆم. ئەو لە ڕاکردنی من دەترسا چونکە بەرپرســـیار دەبوو. کە لە وێستگەی شـــەمەندەفەریش پرسیارم لێ ی کرد بە ڕاســـتی وەڵامی نەدامەوە. پێ ی وابوو ئەگەر شـــوێنەکەم پێ بڵێ پێم دوورە کە یەکەکەی من بۆی گوازرابوومەوە (امریە معســـکر ابـــی غرێب) بوو لـــە ڕۆژئاوای بەغدا. . من بە هیچ شـــێوەیەک بیرم لە ڕاکردن نەدەکردەوە بەڵام کێشـــەیەکم هەبوو کـــە کۆتایی مانگ بوو من هێشـــتا یارمە تیەکەی ئەو مانگەم وەرنەگرتبـــوو، پارەم پێ نەمابوو..!
هاوڕێـــم کاک (جمـــال مولود) کـــە چەند مانگێک پێش مـــن لە (معمل میدان الخامس)ی هەمان ســـەربازگە لە خزمەتی سەربازی دابوو، ڕۆژانە دوای ئەوەی دەوامی خۆی تەواو دەکرد ســـەری لێدەدام. ئەو ڕۆژەش بە پایســـکلەکەی هاتبووە لای من، لەوێ پێ یان گوتبوو چۆتە وێســـتگەی

شـــەمەندەفەر چونکە گوازراوەتەوە. لە کاتێ لەســـەر کورسیە دارەکەی وێســـتگە بە کزی و پەشموردەیی نەخشەی ئەو ســـەفەرەم لە مێشکدا دەکێشـــاو هەژماری دوو قرۆشە کەمەکەی گیرفانم دەکرد. ئەو برادەرەم وەک فریشـــتەیەک بە پایسکلەکەی لە سەر ســـەرم ئامادە بوو.. نازانم چۆن وەســـفی ئەو ساتە خۆشە بکەم کە چاوم بە کاک جەمال کەوت..! زوو تێـــم گەیانـــد کە تەنیا یـــەک چارەگە دینارم لایـــە. ئەویش پارەی پێ نەبوو، ســـواری پایســـکلەکەی بوو دوای کەمێـــک گەڕایەوە و نیو دیناری بۆ هێنابووم. دوایی زانیم ئەو نیو دینارەی لە (حەیدەر قادر)ی خۆشـــنووس قەرز کردبوو. بەڕاستی ئەو نیو دینارە فریام کەوت چونکە کە چوومە (امرية معســـكر ابي غريب) لەوێ خـــواردن (قصعة) نەبوو. حانووتێکـــی بچووکی لێ بوو دەبوا لەســـەر گیرفانی خۆت نان بخۆی..

من شـــارۆچکەی (پردێ) شـــم نەدیبوو کەرکوک و بەغداو چ شارێکم نەدیبوو.. بە تەمەنیشم سواری شەمەندەفەر نەبووبووم. دیار بوو سەفەر کردنی سەربازو دەرەجەدارەکان بە پارەیەکی زۆر کەم بوو، بۆیە (رئيس عرفاء حەمەدەمین) دەیویست زۆرترین پارەی بۆ بمێنێتەوە.

ســـەعات چواری ئێوارە شـــەمەندەفەر دەســـتی بە چکە چک کرد و دووکەڵ و هەڵمەکەی بە ئاســـمانی وێســـتگە دا پەخـــش کرد و هۆڕینە زلەکـــەی لێ دا کە هەموو هەولێر گوێ یان لێ دەبوو بۆ ئەوەی ئەوانەی لـــە نزیک ڕێگایەکەیەتی چۆلی بکەن. وەک مارێکی درێژ بۆ ناو گەڕەکی ئازادی خشکەی کرد و ڕووی لە خوارووی هەولێر کرد. یەکەم وێستگەی گوندی هەمزە کۆر بوو.. من نەم پرســـیوە شەمەندەفەر کەی بۆ هەولێر هاتووە بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەو کارانە زیاتر کاری بەریتانی یەکان بووە کاتی خۆی بۆ گواستنەوەی ســـەرباز و کەل وپەلی سەربازی دروستیان کردبوو. شـــەمەندەفەرەکەی هەولێر تا لە شار دوور دەکەوتەوە ئەوەندە لەسەرخۆ دەجووڵا کاروانچیان دەیانتوانی بێنە خوارەوەو جگەرەیەکیش دابگیرســـێنین ئەوسا فریای ئەوەش دەکەوتن ســـوار ببنەوە.. من یەکە

یەکە شوێنەکانم لە رئیس حەمەدەمین دەپرسی ئەویش وەڵامی دەدامەوە. دەمەو ئێوارە بوو گەیشتینە وێستگەی پردێ. من نەمدەزانی ئەوە (پردێ) یە لە رئیس حەمەدەمینم پرسی ئەوە کەرکوکە..؟ دوایە کە زانیم پلەی غەشـــیمیم زۆر بەرزە خۆم لەو پرسیارانە دوورخستەوە. کە دەگەیشتمە هەر شـــوێنێک هەوڵم دەدا لافیتەیەک نووسراوێک بخوێنمەوە تا بزانم چ شـــارێکە.. شەمەندەفەری هەولێر سەعات چواری عەسر بەڕێ دەکەوت و ســـەعات هەشـــتی بەیانی دەگەیشـــتە بەغدا. بە پـــردێ و کەرکوک و داقـــووق و توزخورماتوو جەلـــەولا و مقدادیەو ســـەعدیەو باقوبەدا تێ دەپەڕی و دوا وێســـتگەی ڕۆژهەڵاتی بەغدا بـــوو.. دیمەنی ئەو منااڵانەم هـــەر لەبیرە کە لە نیوەی شـــەودا بە تایبەتی لە جەلـــەولا و مقدادیەو ســـەعدیەو باقوبە کە شـــەمەندەفەرەکە دەوەســـتا ئـــەو منااڵانە بەناو فارگۆنەکاندا سەردەکەوتن بۆ فرۆشتنی کوبەی گەرم و کفتەی برژاو و ســـەندەویژ و چەند شتی تر. یان هەندێکیان لەسەر شۆستەکاندا شتیان دانابوو. بۆ من ئەو ســـەفەرە کە بۆ یەکەم جار بوو سواری شەمەندەفەر ببم و یەکەم جارم بوو ئەو شـــوێن و شـــارانە ببینم هیچ لە گەشتەکەی (فاسکۆ دیگاما) و (کۆلۆمبس) کەمتر نەبوو..!

کە لە کەرکوک تێپەڕین ئەوســـا خوا خێری بنووسێ جەنابی رەئیس حەمەدەمیـــن پێ ی وتم بۆ بەغدا گوازراومەتـــەوە. زۆرم لێ کرد کە بۆ شوێنی دوورتر نی یە؟ بەڵام ئەو سوێندی خوارد کە بۆ بەغدایە. لە ڕاستیدا من ســـەرتاش نەبووم، هەر لە گوند چەند جارێک سەری چەند کەسێکم بە کۆنە مقەســـت و مووس چاکردبوو. واتە بە مقەست شتێکی کەمم لێ دەزانی.. ڕۆژێکیان (مەغدیدی مام سمایل نەخۆش) مقەست و مووسێکی هێنایە سەر گردی قورشاغلو تا سەری بتاشم. چوینە ناو حەوشی خانووە ڕووخـــاوەکان، وابزانم ئەو بەهارە بوو کە من تیایدا بوومە ســـەرباز بە مقەست سەرم چاکرد، مووسەکەی دامێ تا پشتە ملی بۆ ڕێک بخەم پێم وت (ئاخر ئەوە بێ ئاو نابی..!) وتی (ئەو گیا سەوزە هەموو خوناوە دە

هەندێک بقرتێنەو ملم پێ تەڕ بکە.!) منیش هەندێک گیام قرتاند و ئەوەندە بە توندی لە پشتی ملم سواند پشتی ملی هەمووی کەسک (سەوز) بوو..

ئیتـــر من هـــەر ئەوەندە سەرتاشـــیم دەزانی بەڵام بە قســـەی کاک جەمال مەولود کە پێشـــتر پێ ی وتبووم ئەگەر لە ســـەربازگە وتیان چ پیشـــەیەک دەزانی بڵێ سەرتاشین ئیتر لە شوێنێک دەبیتە سەرتاش و دەحەســـێیتەوە. هەرواش بوو کە بوومە سەرباز لە دوای چەند ڕۆژێک هەمووومان کۆکراینەوە و هەریەکە ئەگەر شتێکی بزانیایە دەینووسی بۆیە منیش ناوی خۆم بە سەرتاش تۆمار کرد. من چوزانم بەو دەردەم دەباو دەمباتە (ئەبو غرێب)..

ئـــەو بەیانی یەی کـــە ڕەئیس حەمەدەمین منی بـــردە ژووری (ڕائد عزیـــز)ی یاریدەدەر، بە یەکێکی گوت با ســـەری یەکێک بتاشـــێ بزانن ڕاستە سەرتاشـــە ئەگەر نەیزانی بۆ شوێنی خۆی دەیگێڕینەوە. ڕەئیس حەمەدەمین لە من زیاتر پەشۆکا، چونکە ئەگەر من بگەڕێنێتەوە هەولێر ئەوا شەو چەرەکەی لەگەڵ ژنەکەی لە دەست دەچێ..

منیان هێنایە پشـــت هۆڵێکـــی درێژ. ژوورێکی بە تەنەکە دروســـت کرابوو گوایە سەرتاشـــخانەیە. سەرتاشـــێکی لێ بوو ناوی (کازم) بوو چاوێکی کوێر بوو خەڵکی شـــاری (حلە) بوو. سەرتاشێکی زۆر کارامە بوو، ســـەربازێکیان لە پێشـــم دانا، منیش دەستم دایە شانەو مقەست دەستم کرد بە سەرتاشینی.. بەڵام سەرتاشینەکەم وەک سەرتاشینەکەی (مەغدیـــدی مام ســـمایل) بـــوو..! کازم پێ ی گوتم (بـــۆ بە مەکینە ناتاشـــی..؟) کە (ڕەئیس حەمەدەمین) تەرجومەی بۆ کردم ناوی خوام لێ هێناو دەســـتم دایە مەکینە کە بۆ یەکەم جار بوو دەستم بەر مەکینە بکـــەوێ. لە دڵی خۆم دەم گوت (ئـــای جەمال چت لێ کردم..؟) من مەکینەم بەکار نەهێنابوو، بۆیە کە مەکینەم لە پشت سەری سەربازەکە گیر کرد و جوڵاندم کابرا وەکو ((گا)) قۆڕاندی (اخ یابە) کە مەکینەکەم لە سەری دوورخستەوە یەک بە دەوی مەکینەکە سەری ڕووت بووبووەوە

مووەکانم هەندێک تاشـــی بوو هەندێکیش لەگەڵ ڕاکێشـــانی مەکینەکە بـــۆ ئەوەی لە ســـەری دوور بخەمەوە لە بن و بۆتکـــەوە هەڵقەندرابوو.. کازم لەبەر ئەوەی لە ســـەروبەندی تەواوبوونی خزمەتی ســـەربازی بوو دەیویســـت یەکێک لە شـــوێنی هەبێ بۆیە مەکینەکەی لـــێ وەرگرتم و شـــوێنەکەی چاک کرد و سەری سەربازەکەی ڕێک خست و بۆ لای (رائد عزیز) گەڕاینەوە.. کە بە جوانی ســـەیری تاشـــینەکەی کرد لێ ی ڕازی بوو. نووســـراوەکەی لە (مەئمـــوور) وەرگرت و ئەویش (تحیە) یەکی بۆ کـــرد.. دیار بوو کاک رەئیس حەمەدەمین زەردەخەنەی دە هاتێ چونکە دەیزانی چ سەرتاشـــێکی بلیمەتیان بۆ جـــێ دێڵێ..! خواحافیزی لە من کرد و قوچاندی. منی لەناو ئەو عەشـــاماتە ســـەیرانە بەجێ هێشت. لە هەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو کە من عەرەبیم نەدەزانی. (کازم الحلاق) کە وایان بانگ دەکرد وەک وتم خەڵکی شاری (حلله) بوو ڕۆژانە هاتووچۆی دەکرد، لەوێ لەگەڵ باوکی دووکانی سەرتاشیان هەبوو. لەو ماوەیە پێش تەواو بوونـــی جا لە بیرم نەماوە مانگێک بوو یان زیاتر زۆر هەوڵیدا من دەستم لە بەکارهێنانی مەکینە ڕابێ و چۆنیەتی سەرتاشین و پشتی مل چـــاک کردنی فێرکردم.. تا ئەو دەرچوو من بوومە ســـەرتاش کە بتوانم سەری سەربازان بتاشم..

ئەو یەکەیەی کە من لێ ی ســـەرباز بووم (امریە معسکر ابی غریب) زیاتر ئەو ســـەربازانە بوون کە خاوەن (واسطە) بوون چونکە یەکەیەکی جێگیر بوو گواستنەوەی تیا نەبوو. فەسیلێکی لێ بوو فەسیلی (انضباط داخلي) فەسیلێکی تری لێ بوو پێ یان دەگوت (فصیل الشغل) کە هەندێ جار بۆ گاڵتە دەیانگوت (فصیل عوران) واتە فەســـیلی کوێرەکان چونکە ئەو فەســـیلە (غیر مسلح) بوون و بەشێکیان کە زۆریان بوون چاوێکیان کوێر بوو.. ئێمەش سەرتاش و دارتاش و سایەقەکان فەسیلێکی بچووک بوویـــن. تازە حزبی بەعس لەناو هێزی ســـوپا دەیویســـت خۆی بەهێز بـــکا لەنـــاو یەکەکەی ئێمە (حضیرة امن) یان هەبـــوو کە چەند جێگری

ئەفسەری لێ بوو لە حزب گەورە بوون و ئەفسەرەکان لەوانە دەترسان..
دێرە شـــیعرێکی صالح مهدی عماش ئەندامی سەرکردایەتی حزبی بەعس لەهــــەر هۆڵەکە نووســـرابوو بەرانبەر (باب نظام) کە ئێستاش لە بیرم ماوە نووســـرابوو (لا لن اغضض الطـــرف عن الام امس - یا طریق البعث عبدناك رمســـا فوق رمـــس) واتایەکەی ئەوەیە (نا نا قەد چاوپۆشـــی لـــە ئازارەکانی دوێنێ ناکەم - ئەی ڕێبازی بەعس بە گۆڕ لەســـەر گۆڕ قیرتاومان کردی)

کێشـــەی سەرەکی من لەوێ نەزانینی زمانی عەرەبی بوو.. ئەوەندەی لـــە خوێندن فێر بووبـــووم فریای زمانی جولفی عێراقـــی نەدەکەوت. . لەبەر ئەوەی ئەو یەکە ســـەربازیە تەنیا دوو سەربازی کوردی لێ بوو بە ناچاری زوو فێـــرە زمانەکە بووم. وەک بۆماوە بۆمان ماوەتەوە لە باوک و باپیرانمانەوە کە دەبـــێ بە ناچاری فێرە زمانی ئەو نەتەوانە ببین کە دەمانچەوســـێننەوە. کورد بە ناچاری فێرە زمانی عوسمانی و عەجەم و فارس و عەرەب بووە.

کارەســـاتەکە لەوە بوو کە فێریش دەبوون شـــانازیان پێوە دەکرد.. زمـــان زانین کارێکی باشـــە بەس ناچار بکرێ ی کـــە فێربی.. ئەوەیان خراپە..

منیـــش لە ناچاری ئەوەندە گرنگیم بە ئاخاوتنی زمانی عەرەبی دا بە شـــێوەیەک دوای ســـاڵێک ئەگەر خۆم نەمگوتبا کوردم کەس نەیدەزانی کەکـــوردم.. ئێمە خوێندنمان بەعەرەبی بـــوو ناچار بووین فێرە (جار)و (مجـــرور) و (حرف علله) (ادات جزم و نصب) ببین بە خۆشـــی یان بە ترشـــی با دەبوا مێژووی (قەعقاع) و (خالد بن ولید) جوگرافیای وڵاتی عەرەبـــی فێر بین. لە ئێران دەبێ ((کۆرش)) بە فریاد ڕەس و لەتورکیا ((کمـــال ئەتاتورک)) بە باوکی تورک و تورکیـــا بزانن. . بۆیە من ئەو عەرەبی یەی لە قوتابخانـــە خوێندبووم جیابوو لەگەڵ ئەو عەرەبی یەی قســـەی پێ دەکرا. قسەکانیان بێ (حرف جر) و (حرف علله) و (جارو مجرور) بوو.



نووسەر ۱۹۷۲/۱۰/٥ هەینی بغداد

دوو ســـەربازی کـــوردی لێ بوو یەکێکیـــان نـــاوی (شـــامل جمیل اســـماعیل) بوو مام جمیل کە پێش چەند ڕۆژێک لە نووسینی ئەو دێرە لە چایخانـــە بچووکەکـــەی کۆتری سەلام لە هەولێر کەوتە بەرچاوم بە تۆپێ ڕیشـــی سپیەوە.. مام جەمیل کرێکاری وێســـتگەی شەمەندەفەری هەولێـــر بـــوو.. شـــامل کوڕێکـــی چاوکراوەی عەرەب زمان بوو بە پێ ی ئەوەی کـــە بە منالّی لە ناوچەی عەرەبـــان ژیـــاون. زمانەکەی باش بوو.. بۆ من پالّپشتێکی چاک بوو.. ســـەربازی دووەم ناوی (محەمەد) بوو ئەگەر بـــە هەلّە نەچووبم ناوی (محەمـــەد ڕەحمان) بـــوو خەلّکی گوندی (کوشاف)ی سەر بەناحیەی گوێر بوو. ئەو گوندەش لە عەرەب و کورد پێک دێ بۆیە ئەویش عەرەبی یەکی باشـــی دەزانـــی تەنیا من لە سەرەتاوە عەرەبی یەکەم دووکەلّێکی باشـــی دەکرد و ئەوان بۆیان چاک دەکردمەوە..

## تەلارەكانی بەغدا

ناخۆشـــترین کاتەکانـــی ســـەربازیم مانگی یەکـــەم و دووەمی دوای گواســـتنەوەم بوو بۆ (امریە معســـكر ابی غریب) لەبەر ئەوەی زمانەکەم نەدەزانی و هیچ هاوڕێ و تەنانەت کوردیشـــم لەگەڵ نەبوو تەنیا ئەو دوو کەسەی سەرەوە ناوم هێناون ئەوانیش بەپێی جیاوازی (فصیل)ەکەیان کـــە هەردووکیان لە (فصیل شـــغل) بوون نەمدەتوانـــی زۆر لە گەڵیان بم. دووەم هەســـتم بە غەریبی یەکی زۆر دەکرد.. لەو بەغدایە گەورەیە لەناو ئەو هەموو شـــەقامی پان و تەلاری بەرز، من بۆ گوندە وشـــکانی یە بێ ســـەوزایی یەکە دەســـووتام..هەر دوای گەیشـــتنم بۆ ئەو یەکە سەربازیە دیارە غەریبیم بۆ گوندەکەمان وای لێ کردووە کە ئەو پارچە شـــعرەی خوارەوە بهۆنمەوە کە هەندێکی لێ دەنووســـمەوە بەروارەکەی ١٩٧١/٦/٢٦ نووسراوە بەڵام دەبی ئەو بەروارە ڕاست نەبێ و دوای ئەو بـــەروارە بە چەند ڕۆژێک بێ چونکە ١٩٧١/٦/٢٦ ئەو ڕۆژەیە کە من لە هەولێر گوازرامەوە .بەڵام لە دەفتەرە کۆنەکەم وا نووسراوە.

((**لە یادتم** – ١٩٧١/٦/٢٦))

**وا تـــێ مەگـــە دەرچووی لە یـــاد لە یادمـــی هەتا ماوم**
**ئـــەو خەیاڵە ی بەلای تۆیـــە دەرناچێ لـــە فکری خاوم**
**بـــە شـــەو و ڕۆژ لە یـــادگاری دانیشـــتنی ســـایانی تۆم**
**هـــەر چـــاوەڕێ ی هەڵســـان و خۆرەهەڵاتـــی بەیانی تۆم**
**لێـــم دیار نی تـــا ببینم خانووی قوڕ و چەهرەی گەشـــت**
**گەلـــێ دوورم بەدڵخـــەوە ناتوانـــم بێـــم بـــۆ باوەشـــت**
**ســـەد مەڵبەندی ئاوارەیی ســـەد هەزار جار قوربانت بێ**
**بەقوربانـــی کاولە خانووی ســـەر گرد و تـــەک ماڵانت بێ**

**خانوويەكـــت لە خشـــت و قوڕ لايەك ڕزيـــو لايەك ڕوخا**
**نايدەم بە (زێ) و بە تەلار و گشـــت ديمەنى شـــارى بەغا**
**كاتـــێ كـــەوا چـــاوم چوقـــا كاميّرايـــە بـــۆ لاشـــەكەت**
**وەرنەگـــرێ وێنـــەى گـــرد و قوتابخانەو تاك ئاشـــەكەت**
**چاو هەڵدينـــم بەداخەوە لەســـەر كورســـى ڕات كردووە**
**هيـــچ نەبوو بـــەس ئەوە نەبـــێ دڵى منت بـــاش بردووە**

لە دواى ئەو دوو مانگە و دواى ئەوەى زمانەكە و سەرتاشينەكە كەم كەم شـــارەزا بووم و برادەرى ســـەربازى عەرەبم پەيدا بوو ئيتر غەريبى و ســـۆزە كەم،كەم كەم بەريدام.جار جار لەگەڵ ئەو دوو برادەرە كوردە ڕۆژانى پێنج شـــەممان دادەبەزينە بازاڕ..ئەوەى نيگەرانى كردم و تەنگى پـــێ هەڵچنيم ئەو دادگا ســـەربازيە بوو كە لە بەغـــدا بە مەئمور منيان هێنايەوە (المحكمة العسكرية في أربيل) و دادگاييان كردم لەسەر ئەوەى دواكەوتووى ســـەربازيم.بەو پێ يە يان دەبوا شەش مانگ زيندانى بكرێم يان ١٦٠ دينار ســـزا بـــدەم.. لە ڕێگا مەئموورەكە ئـــەوەى پێ وتم كە ســـزاى زيندانى و پارە دادەنێن تۆ سەرپشك دەكەن كاميان هەڵبژێرى. پێويســـتە تۆ ســـزاى پارەكە هەڵبژێرى، ئەوساكە شتێكى كەم لە ڕاتبى عەســـكەريەكەت دەگێڕنەوە .ئيتر بە قســـەى ئەوم كـــرد و كە حاكمى عەســـكەرى وتى ( كامـــەت دەوێ) وتم (پارەكە دەدەم) بەو شـــێوەيە مانگانەدينارو نيويك لە موچەكەم دەبرا، كە خۆى حەوت دينارو نيو بوو .مانگانەكەم تەنيا شـــەش دينار مايەوە ...بەو پێيە دەبوو من خواردنى زۆر خراپ بخۆم تا ئەو شـــەش دينارەبەشى خواردنى يەك مانگ و كرێ ى هاتووچۆى مانگى جارێكم بكا كە لە بەغدا بە مۆڵەت دەهاتمەوە..ئەو بەد خۆراكى يە كێشەيەكى گەورەى تەندروستى بۆ نامەوە كە لە كۆتايى باجەكەيم دا..

کاتی کۆڵانەکانی مەیدان و نەهزە و شۆریجەو عەلاوی و بابولشەرقی و شـــوێنەکانی تر شـــارەزا بووم کـــە کۆڵانە کۆنەکانم دەدی هەســـتێکی خـــۆش گیانـــی دەتەنیم.. پێـــم خۆش بوو لـــەو کۆڵانانـــە بمێنمەوە..

(حديقة الزوراء) یەکێک لەو شوێنە خۆشانە بوو کە ئەگەر دابەزیبووینایە ناو شـــار دەبوا سەردانی ئەو شوێنە بکەین .ئەوساکە لە (علاوی حلله) بوو..ئێمە گەنج بووین حەزمان لە شـــوێنێک دەکرد کە کچی تیا بووا.. بازاڕێک هەبوو پێ یان دەوت (ســـوق البنات) ئەوا جارێکیش ســـەرمان لەوێ دەدا..بەغدای پایتەختی عەباســـیەکان و شـــاری (ئەبو جەعفەر) بەو هەموو تەلارە بەرزەو شارســـتانیەتەی ئەوساکە هەولێر لەچاو ئەوێ شـــارۆچکە بوو. ئەوەی نیگەرانی دەکـــردم هەندێک لەو کوردانەی بەغدا بوو کە بە پیشـــەی بچووکی ناشایســـتە خەریک بوون.. زۆر جار لەسەر شۆســـتەی شـــەقامی بەرانبەر (جامع مرجان) و (عـــلاوی الحلله) دەم دین.. یان ســـەندەویچی ســـیپەلک و جگەریان دەفرۆشت یان پینەدۆز و کەوش فرۆش بوون..یان بۆیاخچی پێڵاو بوون.. لەو شـــعرەی خوارەوەم بە دیاردەکەوێ کە هەســـتی نەتەوایەتیم لـــە ناخەوە دەیجوولاندم.. پێم ناخۆش بوو.. من ئەوساکە لێکدانەوەکەم ئاوابوو..

## ( کورد و شاری بەغدا ١٩٧٢/١/١ )

**شادمانم بە کڵاو بە پاڵتۆی دڕاو- بە چۆغەی کۆن وکڵاشی پەڕۆی خاو**
**بە شاخ وداخ وبە بەفری زستان- بە چای سەرخەڵووز بە نان و دۆشاو**

**چونکە ئەوانە بەرهەمی خۆمە - بەری ئاژەڵ و ناو چەمی خۆمە**
**دەست کردی باوک و باپیرمە گشتی — بۆیە شادمانم هاودەمی خۆمە**

**سەرزلی نەزان گوێلاک بە تۆزە - نە گەنج و نە پیر سەرو ریش بۆزە**
**گەر لە کورد گەڕای لە شاری بەغدا - یا کەوش فرۆش یا پینەدۆزە**

## به پانتۆڵی ڕەش لە ڕاژەی خوایە - لە بسمار لێدان یەکەم وەستا
## بۆ نیو درهەمی سـبووغی کەوشێ - زمانی کوردی لەیاد نەمایە

جگە لەو دوو سـەربازە کوردەی کە لە سەرەوە ناوم هێنان جێگری ئەفسـەرێکی کوردی لێبوو ناوی ((کمال)) بوو خەڵکی شـەقڵاوە بوو. پیاوێکـی ڕووخۆش و دەم بـە پێکەنین بوو لەگـەڵ (عریف) ێکی تر خەڵکی هەورامان بوو کە لە حانووتەکە کاری دەکرد..لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٢ هەسـتم کرد ((کمال)) هاتووچۆی لقی پێنجی پارتی دیموکراتی کوردسـتان دەکا لە بەغـدا.. دوایە لە ئەنجامی بـاوەڕ پێکردنەوە ئەو برادەرەی هەورامان ئەو ڕاستی یەی بۆ درکاندم کە کاک کمال بەرپرسی پارتی دیموکراتی کوردسـتانە لە هەموو سەربازگەی ئەبوغرێب بەڵام زۆر بە نهێنی چونکە ئەگەر بەعس بزانن دەیگرن.. وەک ئەو وتی حزبایەتی لە سەربازی تەنیا بۆ حزبی بەعسە.. منیش داوام لێ کرد لە ڕیزەکانی پارتی وەرم بگرن چونکە پێشـتر لە یەکێتی قوتابیان ئەندام بوومە.ترساندمی و وتی ئەگەر ئاشـکرا بین گولله باران دەکرێین.. من بەو نرخەش ڕازی بـووم بۆیە بەڵێنی دا بە کاک کمال بڵێ.. ئێوارەیەک هەردووکیان لەناو باخچـە پڕ لە چیمەنەکە تاوڵەیان دەکرد کـە کاک کمال زۆری حەز لە تاوڵە بوو. منیش لەگەڵیان دانیشـتبووم.تەنیا هەرسـێکمان بووین.ئەو برادەرە بە کاک کمالی وت (سـەعدی ئەیەوێ ناوی لە خەسـتەخانەکە بنووسین..) دیارە کاک کمال لە مەبەستەکەی تێ گەیشت وتی ((جارێ با پەلە نەکا..)) ئیترهەر ئەو پەلە نەکردنەم بوو چ وەڵامێکم وەرنەگرت . ئێسـتا نازانم ئەو پیـاوە لە ژیان ماوە یـان نا..نازانم دوای هەرەس هێنانی گفتوگۆ لە سـەربازی مایەوە یان پەیوەندی بە شۆڕشەوە کرد.. ڕۆژێکیـان پێ ی وتم کە ئامۆزایەکـی لە بەندیخانەی (ئەبو غرێب)ە کە زۆر لـە ئێمە دوور نەبوو لـە جیاتی ئەو دیدەنـی بکەم.ناوی زیندانی یەکـەم لە یاد نەماوە. بەڵام ڕۆژەکە ڕۆژی دیدەنی گشـتی نەبوو بەڵکو

دیدەنی تایبەتی بوو.. نەدەچووینە ناو بەندیخانە،لە ژوورێک چاوەڕێ ی زیندانی یەکەمان دەکرد و دەیانهێنایە ئەو ژوورە .من و چەند کەسێک لە ژوورێکی گەورە دانیشتبووین، هەر کەس و زیندانی خۆی هاتە لای.دیارە ئەو زیندانی یەی من کە هاتبووە ژوورەوە بە یاساولەکانی گوتبوو (من دیدەنیم نەهاتووە بۆ بانگتان کردووم..؟) لەبەر ئەوەی کەسی نەناسی بوو..بۆیە یاساولەکە ناوی زیندانی یەکەی گوت و هاواری کرد کێ هاتۆتە دیدەنی (.....) من لە شوێنی خۆم ڕاست بوومەوە وتم (من..) بەسەری دا هاوار کردم وتی (هاتوویتە دیدەنی و زیندانی یەکە ناناسی..؟) لەگەڵ زیندانی یەکە خۆمان بە یەک ناساند و وتم لە لایەن ((کمال)) ی ئامۆزاتەوە هاتووم..بۆ جاری دووەمیش بۆ دیدەنی چوومە لای.بەڵام ئەو جارە ڕۆژی دیدەنی گشتی بوو لە ژوورەکەی خۆی لەگەڵی دانیشتم هەر ئەو ڕۆژەش دیدەنی یەکێکی خەڵکی گوندەکەمان بە ناوی (زرار مەلا شەلە) یادی بەخێر کە ئێستا لە ژیان نەماوە کرد. هەر لەوێش بۆ یادگاری وێنەیەکمان بەیەکەوە گرت.



**لە ڕاستەوە: زرار مەلا شەلە قورشاغلو نوسەر**

## ئاڵودەی بەغدا بووم:

لە دوای ئەوەی شـــارەزای بەشـــێکی باشـــی بەغدا و زمانی بەغدایی یەکان بووم ئەوەندە ئاڵودەی بەغدا بووم ئێستا جۆرێک لە خۆشەویستی و غەریبی لە ناخمدا بەدی دەکەم بۆ دوو شت:

١- خانـــووە کۆنەکان و حەســـارو کۆڵانە باریکەکانی ناو هەندێک لە گەڕەکە کۆنەکان

٢- گۆرانی ڕیفی عێراقی و مەقاماتی عێراقی و مەوال.

ئەو هەستە لە ناخمدا هەر ماوە.. زۆر جار وا بە خەیاڵم دادێ کە من ڕۆژێک لە ڕۆژان مناڵ بوومەو ماڵمان لە حەسارێکی پشت (فندق سامان و فنـــدق اربیل)ی ئەوســـاکە بووە کە پێ ی دەڵێـــن مەیدان. من لەگەڵ باوکم لە دووکانێکی پیشـــەیی کارمان کردووەو دەمەو ئێوارەیەکم لەبیرە لـــە ڕۆژ ئاوابوون بوو لەگـــەڵ باوکم بۆ ماڵەوە هاتووینەتەوەو تا چووینە ناو حەوشی حەسارەکە لە بیرم ماوە.. بۆیە ئێستاش ئەگەر بچمەوە ئەو شـــوێنە وا دەزانم لەوێ ژیاوم. ژیانی بەرجەستە بوویی لە ئاینی ئیسلام جێـــگای نابێتەوە. ئەگەرنا من قەناعەتـــم وایە جارێکی تر و لە ژیانێکی ترو لە ســـەردەمێکی تر وەک مناڵێکی خاوەن پیشـــە لە بەغدا ژیاوم.. ئەگینا شار و شوێنی ترم زۆر دیوە بۆ کە چوومە ئەو شوێنە وەک ئەوە بوو تیایدا نامۆ نەبم..من دڵنیام لەوەی شتێکی شاراوە هەیە.بەڵام جارێ لۆژیک پەسندی ناکا.. ئاخر ئەو ئێوارەیەم وەک فیلمێکی ئاسایی لەبیرە و دەرگای حەسارەکەشم لەبیرە و ئێستاش بچم شوێنەکەی پێ دەزانمەوە ئەگەر تەنیا کۆڵانەکە مابێ.. من ئێســـتاش تامەزرۆی بەغدام. تامەزرۆی خانـــووە کۆنەکان و ڕســـتەو پەیڤە بەغدادیە کۆنەکانـــم.. نازانم بۆ لەو ئێوارەیە زیاتر لەبیرم نی یە.. ئەگەر بەگوێرەی دەروونناســـی بێ مرۆڤ زیاتر پەرۆشی ئەو شوێنە دەبێ یان ئاڵوودەی دەبێ کە یادگاری خۆش و شـــیرینەکانی لێ جێهێشـــتبێ.. بەڵام من لە بەغدا یان سەرباز بوومەو

ئازاری سەربازی و برسی یەتیم چەشتووە یان لە ژوورە تاریکەکان و ناو دیوارە بەرزەکانی زیندان بوومە..نازانم کامیان یادگاری خۆشن..؟کەچی ئەو هەستەشـــم بەرانبەر بەغدا هەیە. بۆیە پێم وایە شـــتێکی شاراوە لە ژیانی مندا هەبووە.ئێستاش ئەو هەستەم کەم درکاندووە.. گریمان ئەوەی من لەسەرەوە باسم کرد هەڵوەسەیە،ئێ خۆ ناکرێ ئەو هەڵوەسەیە هەتا هەتایە هەر هەبێ.. بە تایبەتی من لە سەردەمی ئێستا ژیاوم و شوێن و جێگاو زنجیرەی ژیانم دیارە.. ئەو سروشتەی لە هەڵوەسەکەم دا هەیە پێ دەچێ ســــەردەمێک بێ کەبەغدا.بچووک بێ و ئاو و کارەباو تەلەفزیۆن و رادیۆ بێ.. سەیارە نەبێ تەنانەت پایسکلیش نەبێ.

ئێســـتاش کە سەردانی بەغدا دەکەم کە دوا جار پێش ئەو نووسینەم دووجار بووە یەکەمیان لەدوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣ بوو دووەم لە ٢٠١١/٧/١٩ بوو هەرچەندە لە دواجار بەغدام وەک کەلاوەیەک هاتە بەرچاو بەڵام هەمان هەستی ئاڵوودە بوونم بە شەقامەکانی و خانوو بینایە کۆنەکانی هەبوو..

## من و نەخۆشی:-

بەهــۆی ئەوەی کــە پارەکەم یەکجــار زۆر کەم بوو.لــە ماڵەوەش گوزەرانمـــان خراپ بوو نەدەکرا هاوکاریم بکرێ،بە ناچاری پەنام بۆ کەم کردنەوەی خواردنی ڕۆژانەم برد.خواردنی ســـەرەکیم تەماتەو ڕۆن بوو. هەندێک جار هەوڵم دەدا ناوە ناوە لەسەر ژەمێک پاز بدەم و لەبیر خۆمی بەرمـــەوە جگە لە تەماتەو ڕۆن خواردنی گشـــتیم نان و چایە بوو کە لە حانووتە بچووکەکەی یەکەکە دەمکڕی..لە پایزی ساڵی ١٩٧٢ هەستم کرد گیانم بەرەو بێ هێزی و بێ توانایی دەچێ و کێشی لاشەم کەم دەبێتەوە و بەردەوام گیانم گەرم دادێ..لە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩٧٣ هەســـتم بە ئازارێکی بەردەوامی شانی چەپم و سنگی لای چەپم کرد..شەوانە ئازاری دەدام و خەوم زۆر کەم بوو بەر لە کۆتایی هاتنی خزمەتی ســـەربازیم بە

تەواوەتی برشتم لێ براو بێ هێز بووم، ژانی لای سنگی چەپم بە ئاشکرا هەڕەشەی لێ دەکردم.. تا دوا ڕۆژەکانی تەواو بوونی خزمەتی سەربازیم دانـــم بە بەخۆ گرت. بەردەوام پلەی گەرمی لاشـــەم لە زیادبووندا بوو.. شەوانە خەوم زۆر کەم بووە وە.. چاک تێگەیشتم نەخۆشی یەکی خراپم تووش بووە. هەر دانم بە خۆ داگرت.ئەو دوو ســـەربازە کوردە (شامل و محمــد) هەردووکیان خزمەتیان تەواو کردبوو دەرچووبوون. من بە تەنیا وەک ســـەربازی کورد لەو یەکە مابوومەوە دوایە سەربازێکیان هێنا ناوی (حەمەدەمین) بوو خەڵکی ســـلێمانی بوو لەبەر ئەوەی خەتی زۆر خۆش بوو لە نووســـینگەیان دانا. هەر ئەوە بوو هەواڵی پێدام کە بروسکەیەک هاتووە لە سزای پارەکەم بەخشراوم بەڵام بێ پارەیی کاری خۆی کردبوو تازە چەندی بەچەندی..؟

کاک حەمەدەمیـــن ڕادیۆیەکی لا بوو بەردەوام بۆ پیاســـەو لە کاتی نووســـتن ئەو ڕادیۆیەی پێ بوو.ســـاڵی ٢٠٠٨ بۆ فرۆشتنی پارچە زەوی یەکم کە لە (بەکرەجۆ) هەمبوو چووم بۆ (کاتب عدل) ی بەکرەجۆ لەوێ عەریزە نووسەکە ناوەکەی خوێندمەوە گوتی: (تۆ لە ئەبوغرێب عەسکەر نەبووی..؟) منیش بە بەڵێ وەڵامم دایەوە وتی: (من حەمەدەمینم تۆش سەعدی نامناسیتەوە..؟) ئەوســـا ناوەکەم بە بیرهاتەوە و پیاسەی ژێر دارخورماکانـــی ئەوێم بە بیر هاتەوە بـــەڵام هەردووکمان پیر بووبووین.. ڕۆیشـــتنی دوو برادەرەکەی تر ئەوەندە کاریگەریان نەمابوو،چونکە چەند برادەرێکی خۆشەویســـتم بۆ دروســـت بووبوون نـــاوی دوانم لەبیر ماوە یەکێکیان (سید جاسم سید صبیح) خەڵکی شاری (شەترەی ناسریە بوو ئەویتریـــان ناوی (صبیح جودە) بوو .کە ئەو ڕۆژەی نوســـراوی دەرچونم وەرگرتەوە ویستم بۆ هەولێر بگەڕێمەوە هەردوکیان دەستیان لەملم کردو زۆر گریان.قسەیەکی (صبیح جودە)م لە بیرە کە پێ ی دەوتم (بەڕاستی بەجێمان دێڵی..) لە دوای دەرچوونیشـــم (سید جاسم) چەند نامەیەکی بۆ ڕەوان کردم . بەداخەوە دوایە هیچ هەواڵیم نەزانی.

لە ماوەی سەربازی شیعرێکی زۆرم نووسی لەبەر ئەوەی لاواز بوون و بۆ ئێستا نەدەگونجان زۆربەیانم فەوتاند. یەک لە شعرەکان کە لە دەفتەرە کۆنەکەمدا مابێ ئەو شـعرەیە بە کچە جوانەکانی (سـوق البنات)م دا گووتـووە. دیارە دیمەنی شـۆخەکانی ئـەو بازارە هەسـتی گەنجێتی ئەوساکەیان وروژاندوم لەگەڵ ئەوەی کە تەندروستیم خراپ بوو..

**(شانۆی تازە ١٩٧٢/٢/١١)**

**گۆنای سـووری قـژی ئاڵـی- ئەبـرۆی قەڵەم چـاوی کاڵی**
**لە ژێر سـیقۆن مەمکی خاوی- ئەفسـوونی سـحری چاوی**
**سـەد سـوێند دەخۆی گوێزی خاوە- لە قۆزاغـەی گوڵی ماوە**
**لـە باوەشـی دەسـت ڕائـەکا- بـە ڕۆیشـتن سـەما ئـەکا**
**بـە لەنجـەو لار بـە نەونـازی- دەنگـی باریک نەغمەسـازی**
**قـەد باریکـی وەک لاولاوە- لـە قەدیـا گـوڵ پێچـی داوە**
**کراسـی کورتە تەنـک و شـلە- وەک وا بڵێ ی پـەڕی گوڵە**
**تـا لـە ئەژنـۆی بەسـەرەوە - قاچـی سـپی بـەدەرەوە**
**ئاسـانترین هێـزی ئـەوێ- لاشـەی هەمـوو دەرئەکـەوێ**
**لـە دژ ژینـی دڵـی سـووتام- ئەکا ڕەوتێ لەسـەر شـەقام**
**ڕ ڕەوتێکـی جـوان و ڕێکە- بـە چوار هەنگاو هـەر مەترێکە**

## * چەند دیمەنێک کە لە یادم مابێ

**١- عاشورا:-** حزبی بەعس لەدوای بەیانی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ زۆر بە خشـــکەیی هەوڵی دەدا پێگەی جەماوەری خۆی قایم بکا و ئەو ڕووە ناشــیرنەی کە لە کودەتای ١٩٦٣ نیشانی خەڵکی دا دەمامکی بدا.بۆیە لە لایەک دەیویست سوپایەکی بەعسیانە وەک دەڵێن (الجیش العقائدی) دروســت بکا و حزبی بەعس بە تەواوی بچێتە ناخی ئەو ســوپایەو لە پیشــە بەرزەکەی کە پیشەی ســەربازی و ئینتیما بۆ نیشتمان بگۆڕێ بۆ دڵســۆزی و ئینتما بۆ (الحزب القائد) بەمەش لەســەرخۆ چووە ناو ناخی ســەربازی.بەوەی ساڵانە کۆمەڵێک ئەفسەری دەرەجەدار لە بواری جیاجیــا وەک فرۆکەوان و دەریاوان و ئەرکان و ئەفســەری موخابەرات دروست دەکرد.شوێنی ئەو ئەفســەرانەی پێ پڕ دەکردنەوە کە بەعسی نەبوون.تــا وای لێ هات فەرماندەی هیچ یەکەیەکی ســەربازی نەما کە بەعســی نەبێ و دوایەش کەس لە کۆلیژی سەربازی وەرنەدەگیرا ئەگەر پێشــتر بەعسی نەبووبێ..ئیتر لە کۆتایی سوپا بووە ئۆرگانێکی گەورەو فــراوان و مشــەخۆری پڕ چەکی حزبی بەعس نەک ســوپای عێراق.لەو یەکەیــەی کە من لێ ی ســەرباز بووم وەک لە ســەرەتاوە باســم کرد (حضیرة الامن) هەبوو،هەموو ئەفسەرەکان و سەربازەکانی بەعسی سەر بەو حەزیرەیــە بوون کە زۆربەیان جێگری ئەفســەر بوون.بەڵام هەموو ئەفســەرە دەرەجەدارەکانی سەرجەم ســەربازگەکە لە ژێر دەستی ئەو جێگر ئەفســەرانە بوون و بە فەرمانی ئەوان دەجووڵانەوە.وشەی نهێنی شــەوانە هەموو ڕۆژێ دەبوا عەریفی ئێشــکگری هەموو یەکە سەربازی یەکان پێش ڕۆژئاوابوون لەو حەزیرەیە ئامادە بن بۆ وەرگرتنی ئەو وشە نهێنی یەی شــەو.لە ســاڵەکانی کە من تیایدا ســەرباز بووم خەڵکێکی زۆریان لە سەربازی (مکلف) و (مطوع) کردە بەعسی.شامل جەمیل یەک لەو دوو سەربازە کوردانە بوو کە پێش من لەوێ بوو ئەویش زۆر لێ یان نزیک بوو.هەرچەندە قســەی لای من نەدەکرد بەڵام پێ دەچوو سەر بە

ئەوان بێ.بەر لەوەی من بۆ یەکجاری خزمەتی سەربازیم تەواو بێ (سید جاسم سید صبیح) کە لە هاورێ یە نزیکەکانم بوو بە خەم و پەژارەوە پێ ی ڕاگەیاندم کە لە ژێر پاڵەپەستۆ و هەڕەشەوە کردوویانە بە بەعسی.من بە هەڕەشـــەکە باوەڕم نەکرد و زۆر زۆر لێ ی نیگەران بووم تا ماوەیەک لەگەڵی سارد بوومەوە..

لە لایەکـــی تر حزبی بەعس بۆ ئەوەی دەرفەتی کارکردن و خۆ قایم کردنی هەبێ لەو ماوەیە هەوڵی دەدا هیچ کێشـــەیەکی بۆ دروست نەبێ نە لە کوردســـتان لەگەڵ کوردو نە لە خوارووی وڵات لەگەڵ (شـــیعة). بۆیە یادی کوشـــتنی حسێن کە لە دەی مانگی موحەڕەمی کۆچی هەموو ســـاڵێکە قەدەغەی نەکردبوو. لە کوردســـتانیش هەوڵی دەدا لەو چوار ســـاڵەی ماوەی دیاری کـــراوی جێ بەجێ کردنـــی مادەکانی ڕێکەوتنی بەیانی یانزەی ئازار کێشـــەیەک دروســـت نەبێ و کـــورد بە فرت و فێڵ ڕابگرێ.

من مەراســـیمی عاشورای شـــیعەکانم نەدیبوو.ڕەئیس عورەفایەکمان هەبوو ناوی (عەبدولزەهرە) بوو کە ئەو ناوە لە ناو شـــیعەکان زۆر باوە نازناوی (الزهرة) وەک لە ســـەرەوە دیارە لە شـــوێنی ناوی خوا دانراوە دەگەڕێتـــەوە بۆ ناوی (فاطمة الزهراء)ی کچی پێغەمبەر کە شـــیعە بە دایکە گەورەی خۆیان دەزانن.. من لەو هۆڵە دەخەوتم کە (عەبدولزەهرە) لێ ی دەخەوت. ماوەیەکی زۆر بوو بەیەکەوە بووین.شەو زۆر باسی ڕۆژی عاشوراو کوشتنی (حوسێن) و ئەو شتانەمان کرد.زانی ئەو مەسەلانە زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم بۆیە داوای لێ کردم بەیانی لەگەڵی بچمە (کەربەلا) بۆ بەشدار بوون لەو بۆنەیە.. بۆ بەیانی چووینە گەراج و سواری سەیارەکانی کەربەلا بووین دیاربوو ســـەیارەیەکی زۆر ئامادە کرابوو بۆ ئەومەبەستە. من شـــاری کەربەلای نزرگەی (حوسێن) و (عەباس)م نەدیبوو کە نزیک کەربەلا بووینەوە خەڵکێکی زۆرم دی بە پای پەتی و بە ڕۆیشتن بۆ ناو شـــاری کەربەلا بەڕێوە بوون. کەربەلا ئەوســـاکە شارێکی گەورە نەبوو،

بەڵام وەک شــارێکی پیرۆز تەماشا دەکرا.کە چووینە ناو شار ئیتر دەبوا بە پیادە بە شـــەقامەکاندا گوزەر بکەین چونکە ئاپۆرەی خەڵک ئەوەندە زۆر بوو وەک شارە مێرووله بوون .ژن و پیاو بەیەکەوە بوون، هەموویان دەچوونە ناو نەزرگەی ئیمامی حوســێن و ئیمامی عەباس و ئەوانی تر. دەنگی گریان و (قراءه استشــهاد حســین) دیمەنێکی پڕ لە ماتەمینی ئەو شــارە بوو..ناوە ناوە ناوەڕاستی شەقام چۆڵ دەکرا دەیانوت (اجا الموکب) واتە مەوکب هات..هەمووش لافیتەیان پێ بوو کە ئەوە مەوکبی فلانە شــوێنە،بە ســەدان گەنجی نیوە ڕووت بە نەغمەو جوولانەوەیەکی تایبەتی هەریەکەو پارچەیەک زنجیریان بەدەســتەوە بوو جارێک بە لای ڕاســت جارێک بە لای چەپی سەریان بەو زنجیرە لە پشتی خۆیان دەداو پشتی هەموویان وەک ساجی سووری لێ دەهات..بەشێکیشیان خوێن لە پشتیان دەهات .خەڵکەکەی ئەولاو ئەولاش بە گریان سەیریان دەکردن. لە هەموو شــەقامەکان و لە هەر شــەقامێک چەند عەمامە لەسەرێک لە شــوێنێکی بەرز وەستا بوون ئەو پەخش نامەیان دەخوێندەوە کە باسی شەهید بوونی (حوســێن) دەکا.عەمامەلەسەرو خەڵکەکە هەر لە نێوان چەند دێرێک دەســتیان بە گریان دەکرد.ئەوەی لە دوای کەوکەبەکانیش بڕۆیشــتبایە دەبوا بە مست لە ســنگی خۆی بدابایە.دەستی چەپیان بە خۆیاندا شــۆڕ دەکردەوە و بە دەســتی ڕاســتیان دەیانکێشا بە سنگی خۆیاندا.عەبدولزەهــرە هەرجارەی ئاوی لە من دەدایەوە کە من ســنگ ناکوتم هانیشــکێکی لێ دەدام و دەی وت (لطم..لطم) واتە بە مســت لە خۆت بدە.من ئەوســاکە دوو لێکدانەوەی سەیرم کرد،یەکەمیان ئەوە بوو ئەو خەڵکە لەدوای هەزارو چوارسەد ساڵ هێشتا بەو گەرم و گوڕیە یادی کوشتنی (حوسێن) دەکەنەوە ئاوا بۆی دەگرین دەبێ ئەوە چ بیرەوەری یەکی بەهێز هەبێ کە پاڵیان بدا خەڵکی نەزان و ڕۆشنبیرەکە بەیەکەوە بە زنجیر لە خۆیان بدەن و ئاوا بەکووڵ بگرین..؟ دەبێ ئینتمایان بۆ ئەو قەناعەتــە چەند بەهێز بێ..؟ بەتایبەتی کە دەمدی لەناو (موکب)ەکاندا

جگە لە عەرەب نەتەوەی تریشـــی تیا بوو وەک فارس و کوردو تورک و پاکســـتانی و ئەفغانی و خەڵکی تر..نەمدەزانی مەبەســـتیان چی یە.لەو یادەوەریـــە تاڵە بەو قەوارە زلە..؟ دووەمیان پێم ســـەیر بوو خەڵکێکی ڕۆشـــنبیر لە سەردەمی زانست و پێشکەوتنی ساڵانی حەفتا بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن و تەنیا بۆ خوێندنەوەی پەخشـــانێک ئەو گریانە بەسۆزەی بێ.. هیچ مانایەکی شارســـتانیم بۆ ئەو یادە نەدەدۆزی یەوە. پێم وابوو ئەگـــەر ئەو خەڵکە کەمێک وشـــیارتر بێ لەوانەیە ئەو شـــتە نەکەن کە بەڕاستی زۆر کارێکی نا شارستانی و نا هاوچەرخە..کە حزبی بەعس ئەو بۆنەیەی لە ســـاڵی ١٩٧٧ قەدەغە کرد پێم وابوو کارێکی باشی کردووە بەڵام ڕۆشنبیر بوون وپێشکەوتن دوای ٣٥ ساڵ هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهـــات لە دوای ڕووخانی ڕژێم لەســـەردەمی ئەنتەرنێـــت وکۆمپیوتەرو زانســـتەکانی تر و لە دوای ئەوەی کە شـــیعەکان بە ســـەدان و هەزاران بڕوانامەی دکتۆرایان لە دەرەوەی وڵات هێنایەوەو دەســـەڵاتیان لە عێراق گرتە دەست دەبینم زۆر لە جاران زیاتر و بە قەوارەی گەورەتر ئەو یادە دەکەنـــەوە باکیـــان بەو هەموو تەقینەوانەش نی یە کە خوێنی ســـەدان کەســـی تیا بە هـــەدەر دەڕوا..! ئەمجارەیان بـــە بەرنامەڕێژی ئەو یادە دەکەنـــەوەو توانایەکی مادی و مرۆیی بـــۆ تەرخان دەکەن و حکوومەت ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکا،سوپا و پۆلیس دەچنە خزمەت ئەو بۆنەیەو دەبنە مجێور.

٢- باینجان:

که منداڵ بووین باســـی پیســـی و پۆخڵی ماڵ و قاپ و قاچاغ و نان خواردنـــی عەرەبانیان دەکرد بەو پێ یـــەی گوندەکەمان و ناوچەکەمان هاموشـــۆیان لەگەڵ عەرەبان هەبوو.هاوینان عەرەب بە گاڕانی وشترەوە ڕوویان لە ناوچەکەمان دەکرد.بۆیە شـــارەزایی یـــان لە چۆنیەتی ژیانی عەرەبان هەبوو. پێمان وابوو ئەوە لە سەردەمێک بووە کە ئاو کەم بووە

نان کەم بووە، خەڵک نا وشیار بوونە نەک لەو سەردەمەی کە من تیایدا سـەرباز بووم.. ئەوانەی لە ئێمە گەورەتر بوون نموونەیان بۆ پیسـی و نارێکی خواردن و جل و شتی تری عەرەبانیان زۆر هەبوو.زۆر جار باسی ئەو نموونانەیان دەکرد،لێرە بە پێویستی نازانم باسیان بکەم. چەند ڕۆژێک بوو پیاوێک ناوی (حوسـێن) بوو لەناو (امریە) باخچەوان بوو کە جگە لە حوسـێن یان ئەبو عەلی چەند کەسانێکی تری باخچەوان و کارەباچی لـێ بوو.داوای لێ دەکردم ڕۆژێک بەخۆم و مەکینەی سەرتاشـین بچمەماڵیان و سەری دوو کوڕەکەی بتاشم. ئەو باخچەوانانە وچەند خەڵکێکی تر لەناو سەربازگە وەک دوو گوند خانووی بە قوڕ و تەپۆلکەیان دروست کردبـوو. لەو دوو گونـدە چەند چایخانەیەک و هەندێـک خواردنگەیان دروست کردبوو دانی ئێواران سەرباز لەو چایخانەیە دادەنیشتن و نانیان لـە خواردنگەکان دەخوارد.ئەبو عەلی دەبـێ ئەوەمان لە بیر نەچێ لە ناو عەرەبەکانی بەغدا و خوارووی بەغدا ئەوەی ناوی حوسێن بێ پێ ی دەڵێن ئەبو عەلی ئەوەی ناوی موحەمەد بێ پێ ی دەڵێن ئەبو جاسـم حەسـەن ئەبو فەلاح و فەلاح ئەبو حەسەن و عەباس ئەبو فازڵ و فازڵ ئەبو عەباس.. ڕۆژێک ڕازی بووم لەگەڵ ئەبو عەلی کە دەوام تەواو دەبێ بچمە ماڵیان و نانی نیوەڕۆ لەوێ بخۆم و سـەری دوو مناڵەکەشـی بۆ بتاشـم..لەبەر ئەوەی گوندەکە لێمان دوور نەبوو بە پیادە چووین. ئەو ڕۆژە زۆر هەوڵـی لەگەڵم دا لـە حانووتەکەدا نان نەخۆم چونکە نیوەڕۆ میوانی ئەوم.. کە گەیشـتینە ناو حەوشەی ماڵیان ئاماژەی بۆ ژوورێکی بچکۆڵە کرد کە بچینە ئەوێ.. لە سـەرەتاوە وامزانی بۆ ئەوەی سـەری مناڵەکان لەوێ بتاشم نەک خۆمان لێ ی دانیشین.. بەڵام کە چووین دیم عەسیر دانراوە بۆ دانیشتن و زەوی یەکەش ئاو ڕشێن کراوە. لەبەر ئەوە دەرگاکـە زۆر بچووک بوو منیش بـاڵا بەرز بووم خۆم دوو لا کردەوە تا چوومە ژوورەوە.. لەبەر بۆنی ڕیخی چێل ئارامم نەبوو..ئەبو عەلی چووە دەرەوەو کردیـە هاوار بانگی نانی کرد. ژنێک بە عەباوە سـینی یەکی

گەورەی لێو درز بردووی هێنا .مەسەلەی عەبایەکە کەوا پێشتر چووبوومە ماڵی تر ژن تا عەبایان لە خۆیان نەپێچابا نەدەهاتن بەخێر هاتنی میوان بکەن .ژنەکە سینی یەکەی دانا تەنیا یەک قاپی لەسەر بوو لەگەڵ هەندێ نان قاپەکە باینجانی لە ڕوون ســـوورکراوە بوو.دوایە دۆلکەیەکی نایلۆنی پـــڕ ئاو لەگەڵ جامێکی بچووکی فافۆنیان لەبەر دەممان دانا کە جامەکە هەمووی قڕێژ بـــوو. باینجان و ڕۆنەکە لە قاپێک کرا بوو وەک ئەو قاپە بوو کە ئێمە بۆ جووجەڵە پرپۆڵەمان تیا دەکرد واتە قاپی فرێدراو..ئیتر فەرمووی لێ کردم.منیش بە چاو چووقان دوو پاروووم خوارد،زۆر هەوڵی دا زیاتر بخۆم بەڵام لە بەر بۆنی ڕیخ و پیســـی قاپ و جام و دۆلکەکەی بـــۆم نەکرا پاروویەکی تر قووت بدەم کچێکی شـــەش تا حەوت ســـاڵی دەبـــوو هاتە ژوورەوە پێ ی وت: (برۆ دۆمـــان بۆ بینە) ئەویش چوو لە جامێکی تر هەندێک دۆی هێنا کە لەسەر چینچک دانیشت تا دۆیەکەمان بۆ لەسەر سینی یەکە دانێ ناو گەڵی ڕووتی کەوتە ئەوگۆڕە..!ئەبو عەلی وەک ئەوەی نەبای دیبێ نە باران زۆر بە ئاسایی وەری گرت. گومانی لە کەمی خواردنم هەبوو، سوێندم بۆ خوارد کە پێش ئەوەی بۆ ماڵیان بێم لەفەیەکـــم خواردووە.. ئیتر لەو ڕۆژەوە کە دەکاتە پایزی ســـاڵی ١٩٧٢ تا کاتی نووســـینی ئەو باسەم کە پایزی ساڵی (٢٠١١)یە من و باینجان دوو دووژمنی باوک کوشتەی یەکترین و دەمم لە باینجان نەداوە.. گەلێ جار بۆ تاقی کردنەوە کوزێ باینجان بە خاوی یان لەناو شـــلەم خستۆتە دەمم یەکســـەر هێڵنجـــم هاتووتێ.. ئۆباڵ بە ئەســـتۆی (ئەبو عەلی).. ئـــەوەم لە بیر نەچێ تا ئێمە لە نان خـــواردن بووینەوە مانگایەک چەند جارێک ســـەری دەهێنا ژوورەوەو ئەبو عەلی وەحەی لێ دەکرد.. من لە زمانی مانگا و هەڵوێســـتەکەی دەگەیشـــتم..تێ ی گەیشتم وا بە زمانی خۆی پێمان دەڵێ: (خوام کرد بە گژتانا بەخیلیتان بە شوێنەکەی منیش برد..؟ئێ بۆ یاخەم بەرنادەن..؟ من و میوانیان گوتووە..؟).

* **کار:**

لە دوای ئەوەی لە سعات ((١١))ی بەیانی ڕۆژی ١٩٧٣/٤/٢٥ کە لە (تەجنید) دەفتەری خزمەتی سەربازیم وەرگرتەوە، لەو ساتەوە دەبوا من بیر لە دەست پێ کردنی ژیانێکی تازە بکەمەوە. بەڵام بەر لەوەی بیر لە کار و کاسـبی بکەمەوە وا پێویست بوو بیر لە تەندروستیم بکردابایەوە. چونکە سـەعات بە سـەعات بەرەو بێ هێزی و بـێ توانایی دەبردم .. تەنانـەت ئەو چەنـد ڕۆژە کەمەی کە پێم وابوو لـە حەفتەیەک کەمتر بوو کـە گەڕامەوە گوند نان خواردن و خـەوم نەبوو بۆیە بەیانیەک بۆ هەولێر هاتم بۆ سەردانی پزیشک.. ئێوارە چوومە لای (د. ئاگوب نیشان پێناسـیان) کە پزیشکێکی مەسیحی بەتەمەنی خاوەن ئەزموون بوو. کە باسی ئازارەکەی خۆمم بۆی کرد یەکسەر پێ ی وتم: (بڕۆ تیشکی سینگتم بۆ بگرە..) بەداخەوە لەدوای پشـکنین و سـەیر کردنی تیشـکەکە کە هەواڵێکی کەمەر شکێنی پێ ڕاگەیاندم کە (هەوکردنی سیەکانم هەیە).. ئەو نەخۆشـیە ئەوساکە نەخۆشـی یەکی ترسناک بوو. جگە لەوەی کە زۆربەی تووش بووەکان ئەنجامیان مردن بوو چونکە هیچ چارەسـەرێکی ئەوتـۆ نەبوو خەڵکیش لـێ ی دوور دەکەوتنەوەو پارێزیان لێ دەکرد و وازیان لە نەخۆشـەکە دەهێنا. من ئەوساکە نەمدەزانی ئەو نەخۆشی یە پلەی زۆری و کەمی یان باشـی و خراپی هەیە. یان جۆری ترسـناک و ئاسایی هەیە. هەر ئەوەندە دەزانم لەگەڵ هەواڵەکە دونیام بەسەر وێران بوو هەرچەندە پێشـتریش پێشـهاتی ئەوەم دەکرد کە نەخۆشی یەکەم گـران بێ.. بە تایبەتی من تازە لە سـەربازی دەرباز بووبووم. دەمزانی هـەژاری و بەدخۆراکی کاری خۆیان کرد و ئەو گورزە کوشـندەیان لێ دام.. دکتۆرەکە دڵی دامەوە کە ئەو نەخۆشی یە ئێستا چارەسەری هەیە بەو مەرجەی بچم لە نەخۆشـخانە بخەوم و لەژێر چاودێری پزیشک بم.. من دەبوا لایـەک هەڵبژێرم. یان ئەوەتا گوێ نەدەمە قسـەی خەڵک و بێزاریـان لێم. گوێ نەدەمە ئەوەی خزم و دۆسـت و بـرادەر لێم دوور

دەکەونەوەو بچم خۆم بە دامێنی ژین شـــۆڕ بکەمەوەو بچمە نەخۆشخانە تا چاک دەبمەوە ئەگەر قسەکەی دکتۆر ڕاست بێ..! یان ئەوەتا بە پچڕ پچڕ چارەسەری یەکان وەرگرم و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا زیاتر چاوەڕێی مەرگ بکەم و دەنگ و باسی نەخۆشی یەکەم و دیزە بەدەرخۆنە بکەم.. من ئەوســـاکە لە بەهـــاری تەمەنم دا بووم لە نێوان (٢٢ تا ٢٣) ســـاڵ دا بووم، کۆمەڵێک هیواو ئاواتم لە کەشـــکۆڵم دا حەشـــار دابوو.. بۆیە لە چەنـــد چرکەیەکدا بڕیاری خۆم دا کە دەچمە نەخۆشـــخانە.. دکتۆر پســـوولەی داخل بوونی بۆ نووسیم و ڕۆژی پاشتر چوومە نەخۆشخانە. وەک لە ســـەرەتاوە وتم من خەو و خۆراکم زۆر کەم بوو. هێزم نەمابوو. ژانی جەســـتەم ئارامی لێ هەڵگرتبووم. بەڵام هەر لە پانزە ڕۆژی یەکەم دا ئەوەندە تەندروستیم باش بوو وام زانی هیچ نەخۆشیم نی یە. خواردن و خـــەوم باش بوو. ئازارەکان زۆر کەم بوونەوە. ئەوســـاکە هیوایەکم بۆ گەڕایەوە کە لەوانەیە لە مل ملانێکە من لە نەخۆشی یەکە ببەمەوە.. ئەو دونیایە زۆر بێ ڕەحمانە حوکمت بەســـەر دەسەپێنێ. مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدا لە کاروان دا دوا نەکەوێ یان بەدەم ڕێگاوە نەکەوێ، لە ســـواری دا نەگلێ. ئەگەر گلا یان کەوت زوو ڕاســـت بێتەوە چونکە لە کاتی کەوتن ئەوەی لە دواوەیە لە جیاتی ئەوەی ڕاســـتی بکاتەوە بەسەری باز دەدا.. یاســـای ژیان وایە. من ئەو ئەزموونەم زۆر دیوە.. لە تەمەنی لاوی.. لە ژیانی فەرمانبەری. لە حزبایەتی و کوردایەتی.. لە هەژاری و پارە داری.. من مل ملانێ یەکی زۆری مەرگ و ژیانم کردووە. بەرگەم گرتووە.. بڕیارم دا کـــە بژیم و گوێ نەدەمەهەندێ تێکشـــکان کە لە دەســـەڵاتی خۆمدا نەبووە.. ئەو نەخۆشـــی یەم بووە هـــۆی ئەوەی گەڕان بەدوای کارکردنم دوا بخـــەم. بەڵام دوای ئەوەی تەندروســـتیم باش بوو، لە پایزی هەمان ســـاڵ لە بازاڕی ســـەوزەو میوەی هەولێر کە (گوومرگ) یان پێ دەووت بە عەرەبی پێ ی دەڵێن (علوة المخضرات) کارێکم بۆ دۆزرایەوە لە لای (ئەحمـــەد تاقی) کە کابرایەکی هەولێری بوو لە تەمەنی ٦٠ ســـاڵ یان

کەمتـــر بوو بە مانگانە بە ((١٢)) دینار بوومە (کاتبی گومرگی). ئەوە یەکەم کارم بوو کە دەســـتم پێ کرد. دەم ویســـت سیناریۆی ساڵەکانی بێ کاری پێشـــترم دووبارە نەبێتەوە و بە هیچ شێوەیەک نابێ جارێکیتر بچمەوە لادێ.. لە خانووەکەیماڵی (مام حەمەد) کە ئامۆزای باوکم بوو خانوویەکی بچووکی لە حەوشەکە هەبوو. چەند قاپ و کەل و پەلم لەناو دانـــا، وەک حاجی قادری کۆیی بڕیارم دا بە ڕەبەنی ژیان ببەمە ســـەر.

بارودۆخی سیاســـی ئەوساکە لە کوردستان ئارام بوو. هەرچەندە ئەو چوار ســـاڵەی کە وەک کاتی دیاری کراو بۆ جـــێ بەجێ کردنی بڕیاری یانزەی ئازار دیاری کرا بوو بەرەو کۆتایی دەچوو، بەڵام هێشتاکە هەولێرو شـــوێنەکانی تر دەسەڵاتی پارتی دیموکراتی کوردستانی پێوە دیار بوو. پارێزگار (عەبدولوەهاب ئەتروشـــی) بوو کـــە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتـــی بوو بەڕێوەبەری پۆلیس (شـــێخ ڕەزا) بـــوو ئەویش ئەندامێکی بـــەرزی پارتی بوو. لق و ناوچە لە شـــارەکان بەو پـــەڕی ئازادی یەوە کاریـــان دەکردو بەعس ڕۆڵێکی ئەوتـــۆی نەبوو.. من چەند مانگێک لای (ئەحمەد تاقی) مامەوە، لەو ماوەیە فێری نووســـین و کڕین و فرۆشتنی ســـەوزە و میوە بووم. جگە لەوەی فێرە لێدانی قەپان (تەرازوو) بووم. قەپان ئامێرێک بوو بۆ کێشانی میوە کە ئەوساکە بریتی بوو لە شیشێکی درێـــژ کە بـــە خانە خانە کیلۆ و پێوەرەکانی لەســـەر دیـــاری کرا بوو. ســـەرێکی چەنگاڵێکی پێوە بوو کە لە قـــەوارەی میوەکە گیر دەکرا لە نیوەی چارەگی شیشـــەکە شوێنێک هەبوو ئەویش چەنگاڵ بوو کە چەند ســـانتیمەترێک لە شیشـــەکە دوور بوو ئەو چەنگاڵە لە دارێکی درێژ گیر دەکرا. دوو کرێکار ئەو لاو ئەولای دارەکەیان بەرز دەکردەوە کە میوەکە لە زەوی بەرز دەبووەوە. لە لا درێژەکەی شیشەکە. قورسایی یەکی دوو کیلۆیی پێوە بوو دەبوا ئەو قورســـایی یە لە شـــوێنێک بوەستابایە کە شیشەکە بەشـــێوەی ئاسایی دەوەستا بەپێ ی ئەو پێوەرەی کە لەسەر شیشـــەکە بوو قورسایی یەکەی لەسەر دەوەستا کێشی میوەکە بە کیلۆ

دیاری دەکرا. ئەمە کارێکی فیزیاوی یە. ئەوەی شارەزایی لە فیزیا هەبێ دەزانــێ چۆن دوو کیلۆ بەرانبەر ٢٥ کیلۆ بۆ نموونە هاوســەنگ دەبێ. لە زســتان وا بوو (ئەحمەد تاقی) کاری نەدەکرد بۆیە ئێمەش کارێکی ئەوتۆمان نەما دەبوا چاوەڕ ێ ی مانگانەکانی بەهار بکەین تا سەر لەنوێ کارمـــان بێتەوە. (مامەند ڕەمەزان) کە تاقە دەلاڵی دەشــتەکی بوو لەو گومرگە چونکە دەلاڵەکانی تر ی ئەوساکە هەمووی شارستانەکان بوون. کە ئێمە ئەوســاکە پێمان دەوتن هەولێری یەکان.. ڕۆژێک بە (ئەحمەد تاقــی) دەڵێ:- (تۆ کارت کەمە پێم باشــە ســەعدی بێتە لای من.. ) مامەند ڕەمەزان تازە مەحەلی کردبووەوە و لە شــاری موســڵ سەوزە و میوەی دەهێنا. ئیتر لای ئەو کابرایە دەستم بە کار کرد. بەڵام بەداخەوە لە نیوەی ســاڵی دواتر هەستم کرد ئەو پارەیەی من وەری دەگرم لەگەڵ ئەو حســاباتانەی کە لە دەفتەرەکەم دایە لــە کاتی گەڕانەوەی پارەکە بۆ ناوبراو تا لە موســڵ شــتی تر بهێنێ جیایەوکەم دەکا . دو کرێکارم لەگەڵدابــوو یەکێکیان ناوی (مەزۆ) بووخەڵکی بەســتەییازەبوو، ناوی دوەمیان م لەبیر نەماوە. من ئەوندەی سەرم دەهێناو دەبرد ئەو نهێنیەم لا ئاشــکرا نەدەبوو.! بۆچی ئەو پارەیە لەگەڵ حساباتی ناو دەفتەرەکەم یەکسان نابی.. ؟شــەو و ڕۆژ لێکدانەوەم بۆی دەکرد. دەمویست نهێنی یەکە بزانم و چارەسەری بۆ بدۆزمەوە. نەدەکرا بە (مامەند ڕەمەزان) بڵێم. چونکە هەمووی لە ئەستۆی من بوو. واتە من پارەکەم بردووە.. ڕۆژێکیان (١٠٠) دینارم لەناو چەکمەچەی مێزە ئاسنەکە دانابوو کە کلیل تەنیا لای خۆم و مامەند بوو. لە بازاڕ لە کۆکردنەوەی پارەی ڕۆژانەی لای ســەوزە فرۆشــەکان دەگەڕامەوە . لە ڕێگا مامەندم لەناو پیکابێک دی ڕای گرت و وتی:- (من دەچمە موســڵ ٩٠ دینار لەناو چەکمەچەکە بوو بردم لای خۆت بنووســە..) وتم:- (کاکە ١٠٠دینار بوو..!) سوێندی خوارد کە ٩٠ دینار بووە. من باوەڕم پێی کرد چونکە درۆم لێی نەدیبوو. کە گەڕامەوە بانگی دوو کرێکارەکەم کرد پێم وتن:- (دە دینار لەناو چەکمەچەی ئەو

مێزە دەرهاتووە. نازانم چۆن دەرهاتووە وا دەچمە بەردەرگای گومرگ و تا دەگەڕێمەوە ئەو دە دینارە نەدۆزرێتەوە ئێوە تاوانبارن.. ) هەردووکیان لە تەمەنی (١٦-١٨) ساڵی بوون. کە گەڕامەوە دە دینار لەسەر مێزەکە دانرا بوو. ئەوەکەی کە ناوم لەبیر نەماوە وتی÷ (ئەوە مەزۆ دەڵێ لەبن مێزەکە دۆزیومەتەوە) ئیتر من گومانم لا دروســـت بوو.. دوایی هەر ئەو ڕۆژە لە دەرفەتێک دا ئەو کوڕە پێ ی وتم÷ (هەموو جارێ کە تۆ لێرە نی مەزۆ بە بیانووی خاوێن کردنەوە دەچێتە ژێر مێزەکە لام وایە لە پشتەوە دەســـتی دەچێتە ناو چەکمەچەکە..) کە مـــن خۆم چوومە ژێر مێزەکەو لە پشـــتەوە بۆشـــایی یەک لە نێوان چەکمەچەکەو بانی مێزەکە هەبوو دەست بە ئاسانی دەچووە ژوورەوە. ئەوساکە تێگەیشتم کە چ کوتکێکم لێدراوە.. بۆ بەیانی بە مامەندم وت÷ (دەبێ مەزۆ لێرە دەربکرێ..) دوای ڕۆیشتنی مەزۆ کرێکارەکەی تر بە تەواوی تێ ی گەیاندم کە مەزۆ ڕۆژانە زۆر لـــەو پارەیەی زیاتر خەرج دەکرد کە ئێمە لە کارەکەمان دەســـتمان دەکـــەوت.. زوو زوو دەچووە ژێر مێزەکە.. مـــن هیچ بەڵگەیەکی ڕوونم لەبەر دەست نەبوو. دەم ویست ماوەیەکی پێ بچێ و بزانم پارەکە چەند کەمی کردووە. بەڵام دەرفەتی چارەســـەریم لەبەردەم نەمایەوە. مامەند ڕۆژێک پێ ی وتم÷ (دەمەوێ کارەکەم وازبێنم حساباتەکەم لەگەڵ بکە..) من ڕاســـتەوخۆ بێ حســـابکردن پێم وت نزیکەی ٤٠٠ دینار لە حسابەکە کەمـــی کردووە و نازانم بۆ کەمی کردووە. ئەویش وەک ئەوەی پێشـــتر ئەو گومانەی هەبووبێ بۆیە بیانووی ئەو حساب کردنەی پێ گرتم.. بەو شـــێوەیە من بوومە تاوانبار و ئەویش دوای دەمە دەمێکی زۆر خەڵکمان لێ کۆبووەوە. بەرەو پۆلیســـخانە چوو سکاڵای لەسەر تۆمار کردم.. هەر کەسێک لە شـــوێنی ئەو بووا وای دەکرد. من بەخۆم فرۆشیار و بەخۆم خاوەنی پارەکە بووم. هەر بەڵگەیەکیشم بهێنابایەوە کە بۆ کەمی کردووە هەر لەسەر من حساب بوو.. بە داخەوە کێشەکە لەوەدا بوو کە من یەک دینـــاری ئەو پیاوەم نەبردبوو کەچی هەر قســـەیەکم بکردبایە و باســـی

پاکی خۆم بکردایە فلســێکی ســووتاوی نەدەهێنا چونکە ئەو پرسیارە دەهاتە گۆڕێ (ئەو پارەیە چی بەســەر هات.. ؟) ئەوەی جێگای داخە بۆ من کە ئێستا نازانم مامەند ڕەمەزان ماوە یان نا نەمتوانی بۆی ڕوون بکەمەوە کە من بە دینارێکی ئەو ئاگرم تێ بەردەبێ و پارەی ناشــەرعی بە درێژایی تەمەنم نەچۆتە گیرفانم و نە دەرفەت دەدەم بچێتە گیرفانم.. لەبەر ئەوەی ســکالاکەی لاواز بوو بۆیە لە پۆلیســخانە نەگیرام.. چەند ڕۆژێــک بوو بەو ئازارە دەتلامــەوە.. ئەوەندەم پێ ی وت÷ (ئەگەر من پارەکەم بردبا ئەوا بە ئاسانی دەمتوانی برۆم یان بچم ببم بە پێشمەرگە یان لەو شــارە خۆم ون بکردبایە نەتدەدۆزیمــەوە.. بەلام من خۆم پێم وتــی ئەو پارەیە کەمی کردووە خۆشــم نازانم بۆ.. ؟ئەوەندە دەزانم من بەرپرسیارم.. ) بەلام کە بەڵگەیەکم نەبێ ئەو پارەیە چی بەسەر هاتووە کەواتە زمانم کورت دەبێ..

دوای چەند ڕۆژێک برادەرێکــی (مامەند ڕەمەزان) ناوی (عەبد) بوو کابرایەکی زمان لووس و لە کردار وەک ڕێوی بوو.. کە قسەی بۆ دەکردی لات وایە فریشــتەیە بەلام لە ناخی دا شــەیتانێک خۆی مەلاس دابوو.. دیارە مامەندی تێگەیاندبوو کە لە ڕێگای دادگا بەو شــێوەیە هیچی پێ ناکرێ چونکە بەڵگەیەکی یاســایی یان (مستمسک) ی نی یە بۆیە بیری لە ڕێگایەکی تر کردبووەوە. ڕۆژێک بە یەکێک کە لەبیرم نەماوە کێ بوو، هەواڵێکــی بۆ ناردم کە حەزی لێ یە چاوی پێم بکەوێ و کێشــەکە بە هێمنی چارەسەر دەکا.. چایخانەیەکی بچووک لە نزیک مزگەوتی (شیخ اللــە) هەبوو لەو چایخانەیە کە ئێســتا حەبل و نایلۆنی لێ دەفرۆشــن بەیەکەوە دانیشــتین. قەناعەتی پێ هێنام کە مامەند لە موسڵ قەرزارە چیتر میوەو ســەوزەی نادەنێ، ئەویش لای وان گوتوویەتی منیش قەرزم لای خەڵکــە، تۆ ئەگەر کۆمپیالەیەکی ٤٠٠ دیناری بۆ بنووســی ئەوا لە موسل ئەو کۆمپیالەیەیان نیشان دەدا و ئیتر سەوزە و میوە دێنێ و لەو تەنگەژە دەربازی دەبێ و باخەی تۆش ناگرێ.. من لە یاسای کۆمپیالە و

ئەو شـــتانەم هیچ نەدەزانی قسەکانی ئەو دانیشتنەم تەواو لە بیر نەماوە بەڵام دەزانم بە قســـەی ئەو کابرایە کۆمپیالەیەکی ٤٠٠ دیناریم بۆ کردو زەمەنـــی دانەوەی قەرزەکەیان بە پانـــزە ڕۆژ دانا.. ئەو کابرایە (عەبد) هەر دڵنیای دەکردمەوە کە چاکەیەکە لەگەڵ مامەند دەکەیت تا سەوزەو میوەی بە قەرز پێ بدەن و هیچی تر نی یە..

لە دوای بیســـت ڕۆژ هەر هێندە لە کت و پڕی ئاگادار کرامەوە کە لە دادگا سکاڵام لەسەر تۆمار کراوە کە من قەرزاری ئەو کابرایەم تا بە پانزە ڕۆژ قەرزەکەی بدەمەوە ئێســـتا قەرزەکەی نادەمەوە.. ئەوســـاکە زانیم عەبد تۆڕی بۆ دانابوومەوە.. بەو شێوەیە ئەو ٤٠٠ دینارە لەسەرم بوو بە قەرز و مانگانە شـــتێک دیاری کرا کە دەبێ بیدەمەوە دادگا و ئەوانیش بیدەنەوە مامەنـــد.. ئەوانە هیچیان گرنگ نین ئەوەی لای من گرنگ بوو قەناعەتی ئەو کابرایە بوو. دوایە نەمدۆزیەوە تا باسی مەزۆی بۆ بکەم.. لە ســـاڵەکانی کۆتایی هەشـــتاکان. ئێواریەک باســـی ئەو ڕووداوەم بۆ (ئیسماعیل حاجی رەسول) کرد کە یەکێک لە برادەرە نزیکەکانمە، ناوی ئەو مەزۆیەم هێنا. یەکســـەر هاواری کـــرد:- (هۆ.. ئەو کاتەی مەزۆ لە گومرگ ئیشی دەکرد دراوسێ ی ئێمە بوون. بەردەوام شتی گران بەهای دەکـــڕی. کە پێـــم دەوت ئەو پارەیەت لە کێ بـــوو.. دەیوت لە گومرگ پارەیەکی چاکم دەست دەکەوێ..) بەڵام دزی چاکی دەست دەکەوت..

من لە ژیانم دا تاڵی و ســـوێریم زۆر چەشـــتووە، ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان غەدریان لێم کرد بەشـــی هەرەزۆریان لەســـەر زەوی خوای تاک و هۆشی پاک تۆڵەی بۆ سەندیمەوە.. لە دوای ئەوەی من لەو کارە نەمام. مەزۆ لەو شـــوێنەی کە کاری تێـــدا دەکرد ڕووداوێکی لێ ئاشـــکرا بوو لەگەڵ خاوەن شـــوێنەکە کە لە ڕووم نایە لەو نووســـینە باسی بکەم.. خۆزگە جارێکیتر کرێکارەکەی دووەمم بدۆزیبایەوە دەســـتم بگرتبایە بم بردبایە لای (مامەند رەمەزان) ئەگەر لە ژیاندا مابێ تا باســـی دزی ژێر مێزە ئاســـنەکەی بکردبایە. بەڵام ڕۆژگار لاپەڕەکانی خۆی پێچاوەتەوەو زەحمەتە جارێکیتر بە من بکرێتەوە.



**٨ /٧/ ١٩٧٤ نوسەر / ئەو مێزەی کە دزی تیا کرا**

*** قەرۆی هاوڕێم : -**

ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی ســـەرەتای سالّی پەنجاکان خانەوادەیەک لە مام عـــەولّا و خێزانەکەی و کچێک و کوڕێک پێــک دێ بەداخەوە مام عەولّا زوو ســـەردەنێتەوە وژنە ڕووسوورەکەشـــی ناچار دەبێ بۆ بەخێوکردنی جووتە منالّەکەی شوو بە پیاوێک بکا لە گوندێکی دەوروبەری بەحرکە.. دوای ئـــەوەی منالّێکی لەو پیاوە دەبێ ژنە تووشـــی نەخۆشـــی دەبێ. نەخۆشـــی یەکەی کوشـــندە دەبێ،پیاوەکەی جێ ی دێلێ.ڕۆژێکیان کە ژنەکە لەبەر ئازاری گیانی هۆشـــی لە خۆی نامێنێ و لە گیانەلادا دەبێ و لەبـــەر ئـــازاری ڕوح دان گەوز دەدا. ئەو منالّەی کـــە کۆرپە بووە لە تەنیشـــتی یەوە درێژ کراوە دەکەوێتە ژێری و بەرلـــەوەی دایکی گیانی دەرچـــێ منالّەکە لە ژێری دەخنکێ.. ئەوە قەرۆی هاوڕێم بۆی گێڕامەوە وتـــی:- (من منالّەکەم دی کە لەژێر دایکمیان دەرهێنا،کەفی ســـپی لە دەمـــی هاتبووە دەرەوە و گیانی لەبـــەر نەمابوو..) ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو

دوو منداڵـــە بێ دایک و باوکە بێ خاوەن و بێ داڵدە دەمێننەوە و کەس نازانـــێ خزم و کەســـیان کێ یە.. قەرۆ کە بە تەمەن لە خوشـــکەکەی گەورەتـــر بوو دێتە شـــار و نازانێ خوشـــکەکەی چی بەســـەر دێ.. لە هەولێـــر لە ماڵی مام فەتـــاح و چەند ماڵێکی تر لە ســـێتاقان داڵدەی دەدەن و خواردنی دەدەنێ و جلی بۆ دەشـــۆن تا گەورە دەبێ و هێواش هێواش دەست بە کارو کاسبی دەکاو خۆی گوزەرانی خۆی دەدا.. دوایین کاری لە بازاڕی ســـەوزە و میوە دەبێتـــە کرێکار.کە ماڵی مام فەتاح و ماڵەکانـــی تر کە داڵدەیان داوە دەکەوێتە پشـــت ئەو بازاڕە.. شـــایانی باســـە بازاڕی ســـەوزەو میوەی ئەوســـاکە دەکەوتە بەرانبەر پەیمانگای مامۆستایان نزیک پردەکەی سەیداوە لە سەرەتای گەڕەکی سێتاقانی کۆن



**قەرۆ و هاوسەرەکەی ١٩٧٩/٣/١١**

قەرۆ کوڕێکی باڵا کورتی تێک چەقی ناوشان پان بوو، ڕەش ئەسمەر بوو. جگە لە کرێکاری ماوەیەکی باش وەرزشـــی ئاسنی کردبوو. یەک لە لەش جوانەکانی گەڕەکی سێتاقان بوو. قەرۆ کوڕی هەموو ماڵەکان بوو لە هەموو ماڵەکانی ئەو گەڕەکە خاوەن ماڵ بوو بێ سێ و دوو دەچووە ژوورەوە. هەموو خۆشیان دەویست. هەرچی گەنجی ئەو گەڕەکە بوو کە هاوتەمەنـــی خۆی بوو برادەری قەرۆ بوون.. لەو کاتەی کە گەورە دەبێ بەردەوام لە خەیاڵی ئەوە دا دەبێ چۆن ســـۆراغی (فاتە) ی خوشـــکی بکا.. ئاخۆ مایە یان مردووە.. باشە ئەگەر مایە لەکوێ یە..؟ تا لە ساڵی ١٩٧٢ خێرە و مەندێک هەواڵی پێ دەدا کە خوشـــکەکەی ماوەو لە مەلا ئۆمەر لە ماڵی پیاوێکی خوا پێداوە..

قـــەرۆ وای بۆ باس کردم (لە دوای ئـــەوەی کە ماڵەکەم دۆزی یەوە ڕۆژێک چووم لە دەرگای ماڵەکەم دا، کچێکی شارستان کە جلی سفوری لەبـــەر بـــوو دەرگای لێ کردمەوە بە توندی پـــێ ی وتم چیت دەوێ..؟ منیـــش تێـــم گەیاند کە کارم بە خـــاوەن ماڵ هەیـــە.. ئیتر کە چوومە ژوورەوە ڕاستی یەکانم پێ یان گوت. بەڵام ئەوان باوەڕیان نەکرد. دوایە چەند کەســـێکم لەگەڵ خۆم برد. خاوەن ماڵەکە ڕێگەی دام خوشکەکەم کـــە هەر ئەو کەســـە بوو کە جاری یەکـــەم دەرگای لێ کردمەوە لەگەڵ خۆم بهێنمەوە.. بەڵام فاتەی خوشـــکم ئامادە نەبوو لەگەڵم دا بێتەوە، هەرچەندە هەڕەشـــەم لێ ی کرد بێ ســـوود بوو ئیتر بە دڵی شکاوەوە گەڕامەوەو لە هێنانەوەی بێ ئومێد بووم..

دوای چەند ڕۆژێک کە من لە فاتەی خوشکم بێ هیوا بووبووم هەواڵی بـــۆ ناردم کە بچمـــە دوای لەگەڵم دێتەوە.. بەو شـــێوەیە فاتەم لەگەڵ خۆم داهێنایەوە. لە ڕێگا لەناو پاســـەکە شـــەرمم کرد لە تەکی دانیشم من لەســـەر کورســـی یەک و ئەویش لەسەر کورســـی یەک دانیشت.. لە شوێنێک کە پاسەکە ڕای گرت یەکێک سەرکەوت و لە تەنیشتی دانیشت. مـــن زۆر تووڕەبـــووم و چوومە ســـەر گوێلاکی کابرا و پێم وت: شـــوێن براوە لێرە دانیشـــتی..؟ ئەویش زۆر پێ ی ســـەیر بوو کە من چیم داوە

بە شــوێنی دانیشــتنی ئەو کابرایە.. بەڵام کە تێم گەیاند ئەوەی تەکی خوشــکمە، کابرا زۆر پێکەنی و وتی ÷ ئەگەر خوشــکتە بۆ لە تەکی دانانیشی.. دیاربوو فاتەی خوشکم کە لە من شارستانی تر بوو زۆر بەو هەڵسوکەوتەم نیگەران بوو لە دابەزین سەرزەنشتی کردم..

من ئەو برادەرانەی کە هەمبوون هەموویان برادەرانی منالی و خەڵکی گوندەکەمان بوون.. دوای ئەو بارودۆخەی کە بەسەرم داهات دوانیان بە دڵســۆزی لەگەڵم مانەوە ئەویش (جەمال مەولود) کە لە سەرەتاوە زۆر باســم کردووە لەگەڵ خوالێخۆش بوو (عبدالرحمن عزیز) بوون. لە شار هیچ برادەرێکم نەبوو. لەدوای ئەوەی لە بازاڕی ســەوزە و میوە دەســتم بــە کار کرد. یەکەم کەس کە بووە هاوڕێم ئەو (قەرۆ) یە بوو. کە بووە هاوڕێم. ژن وماڵی هەبوو لەگەڵ عەلی کوڕی حەمەد ئاغا لە ســێتاقان ژن بــە ژنی کردبوو. حەمەد ئاغا برا گەورەی کانەبی چاو شــین بوو.. قەرۆ تا بلێ ی کوڕێکی دەروون پاک و دەســت پاک و بە وەفاو ڕاستگۆ بوو. پێم وایە لە دڵپاکی هاوتای نەبوو. هەر ئەو دڵپاکی یەش لە کۆتایی هەندێک کێشــەی بۆ دروست کرد.. ئەو برادەرە نەخوێندەوار بوو، بەڵام لە قســە کردن شارەزایی یەکی باشی هەبوو، لە ماوەیەکی کەم من فێرە خوێندەواریم کرد. دەفتەرێکی هەبوو یادگاری یەکانی دەنووســی یەوە، لە یادگاری یەکانی نووســی بووی (لە ماوەی ٣ مانگ لەســەر دەستی سەعدی برام فێرە خیندن و نووسین بووم..) ئێستاش سەرم سوڕما چۆن لەو ماوە کەمە ئەو برادەرە فێرە خوێندن و نووســین بوو.. بەردەوام بۆ خوێندنەوە شــتی بە دەســتەوە بوو. پارچە کاغەزێکی دەست بکەوتایە خەت خەتۆکەی دەکرد و نیشانی منی دەدا کە چ هەڵەیەکی کردووە..

ئەوەندە خولیا و شــەیدای نووسین و خوێندن بوو ئەو شەیدا بوونە وای لێ کرد لە ماوەیەکی زۆر کورت فێر ببێ.. بۆ یەکەم جار کە چوومە ماڵیان فاتەی خوشکیشــی لەوێ بوو، فاتەی خوشکی و گوڵەی خێزانی هەرچەنــدە یەکەم جار بوو من ببینن بەڵام وەک ئەوە بوون کە چەندین ساڵە خوشک و برا بین.. پرسیاری زۆریان لێ دەکردم بە زۆر بە قسەیان

دەهێنـــام. دوایـــە قەرۆ بۆی باس کردم کە پێش ئەوەی من بچم ئەو بە هەردووکیانی وتبوو کە سەعدی زۆر شەرمنە ئەگەر خۆتان زۆر نەیدوێنن شـــەرمەکە دەرناکا.. پارە لای قەرۆ بەڕاستی هۆ بوو نەک ئامانج ئەگەر دینارێکـــی لە لا بووا تۆ باســـی ئەوەت بکردبایە کە پـــارەت نی یە بێ سـلمینەوە یان دینارەکەی لە دەست دەکردی یان لەگەڵی دەکردیە نیوە بە نیوە.. نازانم هەرچەندە باسی باشی و چاکی و مەزنی ئەو هاوڕێ یەم بکەم هێشتا دڵم ئاو ناخواتەوە. وا دەزانم مافی تەواویم پێ ی نەداوە..

لـــە دوای تێک چوونی نێوان ســـەرکردایەتی شۆڕشـــی ئەوســـاکە و حکوومەتـــی عێراق (قەرۆ) لەگەڵ (خولـــە)ی مامی خێزانەکەی دەبێتە پێشـــمەرگە و تا هەرەسی شـــۆڕش ئەو هەر پێشمەرگە بوو.. قەرۆ هیچ شـــتێکی لە من نەدەشاردەوە . بەو دوایی یە کێشەیەکی ناو خێزانەکەی هەبوو کە نەدەبوو کەس بزانێ. بەڵام ئەو بە ووردی و لە ســـەرەتاوە بۆ منی باس کرد.. بەداخەوە خەمێکی زۆری بەو کێشـــەیە خوارد.. دونیای لەپێش ڕەش بوو..

قەرۆ زۆر حەزی لە ســـینەما بوو، بەردەوام سەیری فیلمە خۆشەکانی دەکرد، کـــە زۆربەی جارەکان بەیەکەوە دەچووین.. زۆر حەزی لە چاکە دەکـــرد بەبێ بەرانبەر و چاوەڕێ کردنی پـــاداش. برادەرانی خۆی لەبیر نەدەکرد. برادەرێکی هەبوو ناوی (تەحســـین) بوو بە شـــەهید بوونی لە ساڵی ١٩٧٤ جۆری شـــەهید بوونەکەی زۆر نیگەران بوو، زۆر داوای لێ کردم کە بە شـــعر باســـی چۆنیەتی شەهید بوونی بکەم دوای ئەوەی کە باسی چۆنیەتی شەهید بوونەکەی بۆ کردم. منیش شعرەکەم بۆ نووسی دوایە بە دەنگی (جەلال سەعید) وەک گۆرانی تۆمار کرا. جەلال سەعید زۆر برادەری بوو.. بەداخەوە نە گۆرانی یەکە و نە شعرەکە ماون.. قەرۆ حـــەزی لە هونەری گۆرانی بوو زۆر بە (جەلال) سەرســـام بوو. دەنگی خۆش بوو بەڵام شـــارەزایی لە هونەری گۆرانی گووتن نەبوو، داوای لێ کردم شـــعرێکی بۆ بنووسم کە پاشـــگری (ئەمان زاڵم ئۆف زاڵم ) بێ، یـــەک دوو جار بە ئاواز بۆی دووبارە کردمـــەوە زانیم چ جۆرە وەزنێکی

دەوێ منیش ئەو پارچە شـــعرەی لای خوارەوەم بۆی دانا کە پانزە ڕۆژ بەر لە شـــەهید بوونـــی کە دوا مۆڵەتی ســـەربازی و دوا دیداری لەگەڵ مـــن و منداڵەکانـــی بوو لەگەڵ خۆی برد.. بە داخـــی زۆرەوە ئەو هاوڕێ یە خۆشەویســـتەم مەرگ دەرفەتی نەدا ئەو شـــعرەم بکاتە گۆرانی و لە کۆتایی مانگی مایســـی ســـاڵی ١٩٨٣ لە شـــەڕی نێوان عێراق – ئێران لـــە گردمەندیل شـــەهید دەکرێ و بۆ هەتا هەتایـــە ماڵئاوایی لێ کردم.

**مەکـــە لۆمـــەی گرینی مـــن.. ئۆف ئـــۆف ئەمان زاڵم – یـــارم زاڵم**
**کـــە نازانی لـــە ژینی من.. ئـــۆف ئۆف ئەمـــان زاڵم – یـــارم زاڵم**
**چەنـــد بـــە ژانە برینـــی من.. ئۆف ئـــۆف ئەمان زاڵم – یـــارم زاڵم**

**لێـــم نزیکـــی بـــۆم ناگری.. ئـــۆف ئۆف ئەمـــان زاڵم – یـــارم زاڵم**
**بـــۆچ ڕێـــزی دڵم ناگـــری.. ئـــۆف ئۆف ئەمـــان زاڵم – یـــارم زاڵم**
**دەســـووتێ گەر خـــۆی ڕاگری.. ئۆف ئۆف ئەمـــان زاڵم – یارم زاڵم**
**لـــە دونیـــای دڵ گەلـــێ گـــەڕام شـــۆخێ نەهـــات بـــە هـــاوارم**

**کەســـێ نەبـــوو نـــازم بگـــرێ کـــە مـــن بـــە چـــی گرفتـــارم**
**گیانەکـــەم کـــەی ئەمـــە ڕاســـتە کـــە تـــۆش وەکـــو ئەوانـــی تر**
**دەم پەنجێنـــی و نـــام دوێنـــێ نازانـــی چەنـــد بـــە ئـــازارم**

**گیانـــە خۆ تۆ ئەوینم بـــووی.. ئۆف ئۆف ئەمان زاڵـــم – یارم زاڵم**
**ئاســـۆی دڵـــی غەمگینم بووی.. ئۆف ئۆف ئەمـــان زاڵم – یارم زاڵم**
**مانـــای هەوێنـــی ژینم بووی.. ئـــۆف ئۆف ئەمان زاڵـــم – یارم زاڵم**

کەچــی هەروا بێ وەڵام بووی.. ئۆف ئۆف ئەمــان زاڵم – یارم زاڵم
بۆ هەســتی من هەر نەفام بووی.. ئۆف ئۆف ئەمان زاڵم – یارم زاڵم
دوژمنی ویســت و هیوام بووی.. ئــۆف ئۆف ئەمان زاڵم – یارم زاڵم

(١٩٨٣/٥/٧ شوقەکانی زانیاری- هەولێر)

ئــەوە دوا یادگاری ئــەو هاورێ یەمە لەگەڵ چەنــد وێنەیەک کەلام ماوە...

## * من و پارتی و شابانە دۆم: -

یەکی ئایاری جەژنی کرێکارانی ســاڵی ١٩٩٣ بوو. ســەعات نزیکەی یانــزەی بەر لە نیوەڕۆ بوو، لە مەڵبەندی ســێ ی یەکێتی نیشــتمانی کوردســتان بۆ ناو بازاڕ بە پێ یان دەهاتمەوە کە ئەوســاکە بارەگاکەی لەناو شوقەکانی ئیسکان بوو.. من وەک ئەندامی مەڵبەند لەناو مەڵبەند دەوامم دەکرد ئــەو ڕۆژە لە هەولێر گردبوونەوەو خۆپیشــاندانێکی زۆر کــرا بەو بۆنەیە ئــەو کات خەڵک بۆ ئەو بۆنانە بە گەرم و گوڕی یادیان دەکردەوە. دیاربوو مەراســیمەکە کۆتایی پێ هاتبوو، خەڵک لەناو شار دەگەڕانەوە. ئەو ڕۆژە من لە مەڵبەند مامەوە کارەکان وا دابەش کرابوون دوای دەرچونم لە مەڵبەند بە پیادە بەرەو بازاڕ هاتم . لەناو گۆرســتانی (چراغ) لە دوورەوە (شابانە دۆم) م بینی ئاڵایەکی گەورەی لوول دراوی بە دەستەوە بوو بۆ لای ئیسکان و هۆڵی گەل دەگەڕایەوە. شابان پیاوێکی ئەسمەری باڵا بەرزی پڕ بوو، ئارەقە لە سەروچاوی تریسکەی دەدایەوە بە گەرمی سڵاوم لێ ی کرد و ئەو بە ساردی وەڵامی دامەوە. لە سەرەتاوە نەیناسیم بەڵام کە چەند مەترێک لێم دوورکەوتەوە، هەڵوەستەیەکی کرد هــاواری کرد (ئەرێ..) ناوەکەی منی لە یاد نەمابوو.. من ڕاوەســتام و ئاوڕم دایەوە یەکسەر بۆم هات و چاک وچۆنی یەکی زۆر بە گەرمی لەگەڵ

کردم. زوو وتی ÷ (باوکەکەم تۆ لەکوێ ی.. ؟ئەوەندە بەدواتدا گەڕام..)
شابانماڵی لە کۆڵانی دۆمەکان بوو لە سەیداوە. پیاوێکی کورد پەروەری دڵسۆزی پارتی و ڕێبازەکەی بوو. زۆر ڕقی لە باڵی مەکتەبی سیاسی ئەوساکە دەبووەوە. نەخوێندەوار بوو، بەڵام بەشی خۆی قسەی دەزانی و وەک کادرێک ناسرا بوو، بەتایبەتی لەناو دۆمەکان.

بۆ یەکەم جار کە ئەو پیاوەم ناسی لە نیوەڕۆیەکی کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ بوو کە بەروارەکەیم بە تەواوی لە یاد نەماوە. ئەوساکە لە بازاڕی سەوزە و میوە کارم دەکرد. نیوەڕۆ بوو لەناو شوێنەکەی خۆم دانیشتبووم یەکێک هات و پێ ی وتم÷ (شابان لە دەرێ کاری پێتە.. ) من نەمدەناسی شابان کێ یە ئەو وتی شابانە دۆم.. دڵم داخورپا چونکە مانگێک دەبوو کچە دۆمێک هەبوو زۆر سەرنجی ڕاکێشا بووم. گەنج وایە بە قومە ئاوێ بە مەلە دەکەوێ. ئێستاش نازانم ئەو کچە بۆ سەرنجی ڕاکێشابووم. ئەو هیچ ئاگای لە من نەبوو. یان من وا تێگەیشتبووم کە ئاگای لە من نی یە.. بەڵام بەیانیان کە بۆ شت فرۆشتن دەچووە بازاڕ لەگەڵ دایکی بەلای بازاڕی سەوزەکە دا تێدەپەڕین و دەمزانی چ کات بەوێ دادێن، دەچوومە سەر ڕێگای. چەند جارێک لە بازاڕ کە لەگەڵ دایکی بە دیار شتەکانەوە دادەنیشتن دەچوومە سەریان و بەبێ هۆ مامەڵەی شتەکانم دەکرد. جارێکیان دایکی هەستی کرد من گێچەڵ فرۆشم ئیتر بە تووڕەیی وتی÷ (ئەرێ تۆ بۆ یاخەمان بەرنادەی دەزانم شت ناکڕی و وازمان لێ ناهێنی..!) زانیم هەستی بە شتێ کردووە.. کە نیوەڕۆیان دەگەڕانەوە زۆر جار لەو شوێنە نزیک دەبوومەوە کە پێ ی دادەهاتن. دایکی بە تووڕەیی سەیری دەکردم، کچەکەش مێش میوانی نەبوو.. لە دەفتەرە کۆنەکەم شعرێکم ماوە دیارە ئەو کچە دۆمە کاریگەری لەسەر سۆزم هەبووە وەک لە شعرەکە دیارە ئەو کاتە نووسراوە کە من وازم لە جوولانەوە بێ ماناکانم هێناوە..

## (ئەی کۆچەری -١٩٧٢\١٢\٣١ - هەولێر)

**گیانی شــیرین پەشــێوتم، شــەیدای تــۆ بووم ئــەی کۆچەری**
**ئەمن شــاری و تــۆش کۆچەری، چــۆن توانیــت وا دڵم بــەری**
**ئــەی کۆچــەری وا مــــەزانــە ئەمــن لــە تــۆ زۆر ژیرتــرم**
**بــەڵام بەخــوا بەرامبــەر تــۆ گەلــێ لــە تۆ بــێ بیرترم**
**چونکــە بیر و هۆش و هەســتم هەمــووی لەناو دەســتی تۆیە**
**ئــەو پەیکەرەی تــۆ دەیبینی گشــت کاتێ سەرمەســتی تۆیە**
**ئێســتا هۆشــم کەمێ مــاوە کە ئەو شــعرە دەنەخشــێنم**
**تــا خوێنــەری ئــەو پارچــــەیــە لــە داهاتــوو بگریێنــم**
**چونکــە کچــە کۆچەری یەکــە وا پێ دەچێت بۆت شــێت ببم**
**ببمــە فیــدای عیشــــوە و نازت فیــدای خاکــی بەرپێت ببم**

جا ئەو کاتەی گوتیان شـــابانە دۆم لە دەرەوە کاری پێتە، یەکســـەر بیرم بۆ ئەوە چوو کە دۆمەکان ئەمەیان زانیوە و هاتوون بەو تەپشـــووە تیژانەی کە خۆیان دروســـتیان دەکرد بمکەن بە گۆشتی قیمە..! بازاڕی سەوزەکە ئەوساکە حەوشەیەکی هەبوو دەرگایەکی گەورەی بەرانبەر قەڵا هەبوو. دیارە ئەو بینایە ئێستاش لە شوێنی خۆی ماوە.. من چوونەکەم دواخســـت. دوایە جارێکیتر لە دووم هاتن.. ئیتر پێم لە گیانی خۆم نا و بـــەرەو مەرگ هەنگاوم نا.. بیرم لەوەش کردەوە ئەگەر تاویان دامێ بەر لەوەی یەکەم تەپشوو بە تەوقی سەرم بکەوێ و دوولەتی بکا ڕابکەم و خـــۆم بگەیەنمە ئەو مەخفەرەی کە چەند مەترێـــک لە دەرگاکەوە دوور بوو تا پۆلیس بە هانامەوە بێن. ناحەقم نەبوو چونکە زۆر باســـی شەڕی دۆمەکانیان دەکرد کە بە سیکاردو چەقۆی گەورەو تەپشوو تاویان داوەتە یەکتر.. کە هاتمە دەرەوە دوو پیاویان پێ نیشان دام یەکێکیان ئەسمەری باڵا بەرز بـــوو دەمانچەیەکی پێ بوو. ئەوی تریان یەکێکی قەڵەوی چاو

ئەبڵەقی سمێڵ بابڕ بوو.. من پێم وابوو ئەوەی بیرم لێ دەکردەوە قەوما. سـەیری ئەولاو ئەولای خۆم کرد تا بزانم قاچە درێژەکانم فریام دەکەون ئەگـەر ڕابکەم، بەڵام دانم بەخـۆم داگرت. ئاخر خۆ من هیچم نەکردبوو دەمتوانی پارێزگاری لە خۆم بکەم. قەرۆی هاوڕێشم ئەو دەم لەوێ نەبوو تا فریام بکەوێ.. شـابان ناوی منی پرسی کە هەوم یان نا. کاتێ دڵنیا بوو من ئەو کەسەم کە ئەو مەبەستی یەتی، یەکسەر پێ ی وتم: (تۆ لەگەڵ ئێمەی لە ڕێکخستن.. ناوەکەت هاتۆتە لای ئێمە..) ئاوێکی ساردو فێنک بە جەستەم داکرا و هۆشم هاتەوە بەر خۆم و هەناسەیەکی دوورو درێژم هەڵکێشـا.. بە بیرم هاتەو من و کاک (قادر مەلا کاکە ڕەسـولە درێژ)ی کۆیە بەیەکەوەماوەیەک بوو چووبووینە ناوچەی هەولێری پارتی دیموکراتی کوردسـتان کە ئەوساکە بارەگاکەی لە پشت سینەما سیروان بوو ناوی خۆمان وەک لایەنگر تۆمار کردبوو. من ناونیشانی شوێنی کارم پێدان بوون و بە کاک قادریان گوت دەبێ بچێتە ناوچەی کۆیە.. ئەوەشم پێ ڕاگەیاندبوون کە من لەساڵی ١٩٦٨ یەکێتی قوتابیانی کوردستان و لە سـاڵی ١٩٦٩ بوومەتە ڕێکخسـتن و بەهۆی سـەربازیم لە ڕێکخستن پچڕاوم. پـێ یان وتم کە ئەو ماوەیەم بۆ هەژمـار دەکەن. بەڵام دوایە بەدیار کەوت کە ماوەکانیان بۆ تۆمار نەکردبووم. بەو شـێوەیە ناوەکەی منیان دابووە شابانە دۆم کە بەرپرسی کۆمەڵێ خەڵک بوو لە سەیداوە.. من لە سەرەتاوە باوەڕم نەکرد کادری پارتی بن، بەڵام کەنهێنی یەکەیان وت ئەوجا باوەڕم کرد..

لـەو ڕۆژەوە من و شـابانە دۆم لە هەموو کۆبوونـەوەکان بەیەکەوە بوویـن زۆربەی دۆمەکانی سـەیداوە و هەندێکی نزیک مزگەوتی شـێخ مەلا ڕەشـید لە ڕێکخسـتنەکان بوون. ماڵێکی تریش هەبوون لە پشت وەزارەتی شارەوانی ئێسـتاکە. شوێنەکە بۆتە گەراج و شەقام. ئەوکات کۆلانێکی قوڕی چاڵ بـوو، کۆبوونەوەمان لەو ماڵەش دەکرد. من لەبەر ئـەوە بـەردەوام لە کۆبوونەوەکان لەگەڵ شـابان بـووم وەک وەزیری دەستەڕاسـتی بووم چونکە پەیڕەوی ناوخۆم بۆ دەخوێندەوە. ڕۆژێکیان

یەکێک ڕەخنەی لە شـــابان گرت کە بۆچی منی کردۆتە جێگری خۆی و لە هەموو کۆبوونەوەکان بەشـــدارم.. زۆر بە توندی وەڵامی دایەوە وتی:- (ئەو کابرایـــە بەتوانایە پەیڕەوی ناوخۆتان بۆ دەخوێنێتەوە و لە هەمان کاتیش بۆتان شـــی دەکاتـــەوە. خوێندەوارێکی چاکە.. کێ وەک ئەوی پێ دەکرێ با بفەرموێ.. ) ئەو کاتی لە تەنیشتی دانیشتبووم و دەستی لەسەر شانم دانابوو.. لە هەمووی سەیرتر یەکەم کۆبوونەوەمان لە ماڵی ئەو کچە بوو کە بووە هەوێنی ئەو شعرەی سەرەوەم. بەڵام دوای ناسینی کاک شابان منیش وازم لە جوولانەوەکان هێنا..

من لە ڕێکخستنەکان بەردەوام بووم. بۆیان نووسیم ببم بە پاڵێوراو. وابزانم بوومە پاڵێوراو بەڵام یانزەی ئازاری ١٩٧٤ ڕێکخستنەکانی ناو شار لەبەر یەک پچڕان ئەویش بەهۆی چوونە دەرەوەی جەماوەرو ڕێکخستن و دەست پێکردنوەی شەڕ. پێش چوونە دەرەوە کاک شابان پێ ی ڕاگەیاندم کە من زۆر ئاشـــکرا نیم بۆیە پێ ی باش بوو بمێنمەوە دوایە پەیوەندیم پێوە دەکەن بۆ دروست کردنەوەی ڕێکخستن لەناو شار..

دوای مانگێک لە چوونە دەرەوەی خەڵک بۆ پاڵ شۆڕش، ئێوارەیەکی درەنگ بە ئەسپایی لە دەرگای ژوورە بچکۆڵەکەم درا، کە دەرگام کردەوە کاک شـــابان بوو، ئیتر یەکترمان لە باوەش گـــرت و چایەکی گەرمم بۆ لێنا.. کات درەنگ بوو، ئەو لەسەر دیوار هاتبووە حەوشە و ماڵی (مام حەمـــەد) ئاگایان لێ نەبوو.. پێـــم وابوو هاتووە ئـــاگادارم بکاتەوە تا پەیوەندی بە خەتێک بکەم یان سەرپەرشتی خەتێک بکەم.. بەڵام تێ ی گەیاندم کە هێشتا ڕێکخستنەکان لەناو شاردا دروست نەکراونەتەوە هەر کاتێک دروســـت بوونەوە ئاگادارم دەکاتەوە. بەڵام تا هەرەســـی شۆڕش جارێکی تر ڕێکخستن لەناو شار دروست نەبووەوە..

دۆمەکان بۆیە زۆربەیان لە ڕێکخســـتن بوون چونکە ئەوان هاتووچۆی ئێرانیان دەکرد ئەگەر ناســـنامەی پارتیـــان نەبوواڕێگەیان پێ نەدەدرا ئەوبەر و ئەوبەر بکەن. ئەوە قسەی کاک شابان بوو..

ئەو شـــەوە دوای چا خواردنەوەکە، کە شابان ڕۆیشت نەم دۆزیەوە

که شۆڕشــیش نســکۆی هێنا وا ڕێک نەکەوت یەکتر ببینین. بۆیە ئەو ڕۆژەی لە گۆڕستانی چراغ لە ساڵی ١٩٩٣ کە دەکاتە دوای ١٩ ساڵ منی بە ئاسانی نەناســی یەوە.. تەنانەت ناوی منیشی لە یاد نەمابوو. بەڵام دەیزانی ئەوە وەزیرە دەستەڕاستەکەیەتی بۆیە تەنیا بە (ئەرێ..) بانگی کردم. کە پێ ی گوتم تۆ لەکوێی..؟پێم وت (من لە هەولێرم) وتی (ئەی بۆ دیار نی..؟) بە سەرسامی یەوە تێم گەیاند لە کوێ دیار بم..

وتی÷ (بۆ لای خۆم لە ڕێکخراو..) تێ گەیشــتم کاک شــابان نۆزدە ســاڵە زەمەن لای ئەو وەســتاوە. هــەر بۆ ئەوەی بزانــێ مرۆڤەکان و سرکردنەوەکانی نۆزدە ســاڵ لەمەوبەر مەرج نی یە لە شــوێنی خۆیان قەتیس مابن وتم (کاک شابان ئاخر بە چی بێمە ڕێکخراو خۆ زەمانی جاران نی یە و دنیا گۆڕانکاری زۆری بەســەردا هاتووە..) وەک جاران دەستێکی خستە سەر شانم و هێشتا ماندووبوون و هەناسە سواری بەری نەدابــوو بەو پــەڕی دڵنیایی یەوە وتی ÷ (جا مــن و تۆ لەگەڵ یەکتر ناگۆڕێ ین.. تۆ وەکو جاران خۆشەویســتی منی.. پشتگیریت دەکەم بۆ ئــەوەی پلەی خۆت بدەنەوە و یەکســەر دەتکەینە ئەندام و هەر لەگەڵ خۆم بە..)

پێم ســەیر بوو ئەو برادەرە هیچ تێبینی یەکی لە قسەکەم وەرنەگرت و سەیری دەمانچەکەشی نەکردم کە لەبەر پشتێنەکەم بە زەقی دیاربوو.. نازانــم بۆ بیــری نەکردەوە کە من ئەو چەند ســاڵە چیم کردووەو لە چ ئەشکەوتێک خەوی نۆزدە ســاڵەم لێ کەوتووە. یان لە کوێ بوومە. لە دوای ســاڵی ١٩٧٥ چەندین حزب و ڕێکخراو دروســت بووبوون. تا دوا قسەی هەر ئەوە بوو، (ئاخر بەیانی دەبێ بێ ی چاوەڕێتم.. بارەگاکەمان لە فڵانە شــوێنە..) دوا جار لەبەر دڵی ئەو کە بەڕاستی خۆشم دەویست وتم: - (هەوڵ دەدەم بێم.! بەسەرچاو..) کە دووریش کەوتەوە پەنجەی بۆ دەشــەقاندم (لەبیر نەکەی لە ئیسکانین.. بلێ دەچمە لای شابان..) ئیتر بە دەســت هەڵتەکاندن لێم دوورکەوتەوە. دواجار کە کاک شــابانم دیتەوە لە ســاڵی ١٩٩٦ بوو لەناو مەڵبەندی ســێ ی هەولێری یەکێتی

نیشتمانی کوردستان دوو پێشمەرگەی لەولاو لەولا دەڕۆیشتن . ئەویش یاتاغێکی لە بن هەنگڵ بوو بۆ نزیک ژوورەکەی لێپرسـراوی مەڵبەندیان برد.. ڕدێنی هاتبوو زۆر بێ تاقەت دیاربوو.. نەفرەتم لە شەڕی خۆکوژی و بـرا کوژی و کورد کوژی و پێشـمەرگە کوژی کـرد.. ئەوە کەی ڕەوایە کـە ئەو دوو حزبە وا لە کادری یەکتر دەکـەن.. چونکە هەردوولا کادر و ئەندامـی یەکتریـان دەگرت. هەزار جارنەفرەتـم لە ئینتما بۆ حزب. کردو کرنۆشـم بۆ ئینتیما بۆ خاک برد.. چوومە پێشی و چاک و چۆنیم لەگـەڵ کرد کە ئەو کاتە لە دالآنەکە دایان نابوو.. بە سەرسـوڕمانەوە سـەیری کردم.. دوایە چووم لە پێشـمەرگەکانم پرسـی کە شابان بۆ گیراوە..! وتیان قسـەی زۆری بە یەکێتی گوتووە بەلآم بڕیاری بەردانی دەرچووە.. ئەوەم لەبیر چوو لە ژووری لێپرسراوی مەڵبەند بانگیان کردم و ناویان هێنام. ئەویش گوێ ی لە ناوەکەم بوو. دیارە ئەوساکە ناوەکەی منـی بەبیر هاتەوە. کە هاتمە دەرەوە دیم شـابان لـە دالآنەکە بەدیار یاتاغەکەیەوە بە کزی دانیشـتووە و چاوەڕێ ی ئەنجامێکی نادیار دەکا. بانگی کردم و بە زمانی پاڕانەوە و نزا و تکا وتی:- (سەعدی شتێکم بۆ بکە فەوتام..) بە دڵنیا یی یەوە پێم وت:- (خاترجەم بە ئێسـتا بەرت دەدەن..) ئیتـر ئەو ڕۆژە ئازادیان کرد. زۆر دڵم بۆ شـابان و ئەوانەی وەک شـابان لە هەردوولایان سووتا.. بەلآم ئەو جارەش کاک شابان لێ ی نەپرسیم من لە مەڵبەندی جەلالیان چیم دەکرد.؟

من پێم وابوو ئەوەی بە هۆیەک لە هۆیەکان بەشـداری لە خەبات و تێکۆشان لە پێناوی نەتەوەکەی نەکا، کورد نی یە، بۆیە پێم وابوو وەک چۆن نوێژ و ڕۆژی ئەرکە و نابی نەکرێ لە ئیسلام دا. کوردایەتیش لەسەر هەموو تاکێک ئەرکە. بۆیە لە سـاڵی ١٩٦٨ ەوە من بەدوای ڕێگایەک دا گەڕاوم کە کوردایەتی تیا بکەم. لە سـاڵی ١٩٧٣ خۆم دووبارە چوومە ناوچە ی هەولێری پارتی دیموکراتی کوردسـتان تا ببم بە پارتی. دوای ئەوەی بەهۆی سـەربازی لە ڕێکخستنەکان پچڕا بووم. ئەوە قەناعەت و بیرو بۆچوونی من بوو تا نسـکۆی شـۆڕش. پێم وابوو ئەوەی قسەیەک

به خوالێ خۆش بوو مەلا مســــتەفای بارزان بڵێ ســێ به ســێ تەلاقی دەكەوێ، ئەوەی پارتی نەبێ كورد نی یە. بەڵام دەبێ قەناعەت بەپێ ی هەڵ و مەرج لەگەڵ راددەی هۆشــیاری دا بگونجێ چونكە شتێک نی یە لای مرۆڤ پێ ی بوترێ قەناعەتی چەســپاو یان قەناعەتی هەتا هەتایە. بەڵام لەوە خۆشــتر نی یە تۆ سەداسەد بێ دوودڵی و راڕایی قەناعەتت بە شــتێک هەبێ ئەگەر زۆر ڕاستیش نەبێ.. خۆشە کە لە قەناعەتەکەت گومانــت نەبێ.. هەر كاتێكیش بەهــۆی لۆژیک و عەقڵ و زەمینەی جیا زانیت قەناعەتەكەت لە جێ ی خۆی نی یە. لەوە خراپتر نی یە كە خۆت بە دامێنی ئەو قەناعەتەت شۆڕ بكەیتەوە.. من نەتەوەكەی خۆم ئەوەندە خۆش ویستووە ئەگەر كڵاو ڕۆژنەیەكی بچووكیشم شک بردبێ، ئەگەر لە بنمیچی خانوویەكی بەرزیش بێ كە زانیم ئاســۆی كوردایەتیم لێ بەدیار دەكەوێ، هەوڵم داوە بگەمە ئەو كڵاو ڕۆژنەیە.. ئەو كاتە كەمانەی لەناو پارتــی بوومە. ئەگەرچی هەر لایەنگریش بوومە.. بەڵام پێم وایە ویژدانی ئەوساكەی خۆمم ئاســوودە كردووە وخۆم لە بەرەی گەل دۆزیوەتەوە.. یادت بەخێر كاک شابان وابزانم ئێستا لە ژیان نەماوە بەڕاستی دڵسۆزی قەناعەتەكەی خۆی بوو..

## تەنیایی :

من و مەعشــوقە هەمیشــەیی یەكەم (خەیاڵ) دەمێک بوو تەنیایی جێی ژووانمان بوو.. دەمێک بوو خولیای تەنیایی بووین تا دەردی دڵمان تیایدا بكەینەوە. من قەرزاری مەعشووقەكەمم، چونكە لە هەموو سات و كاتێ وازی لێ نەهێناوم. من و خەیاڵ لە دووری یەک نازین و نەژیاوین. ئەگەر لێم بپرســن خۆشەویسترین شت لای تۆ چی یە..؟ دەڵێم هاورێ دێرینەكەم (خەیاڵ)ە. من لە ژیانم دا ئەگەر داهێنانێكی بچووكیشم هەبێ ئەوا بە هاوكاری و دەستەوایی خەیاڵ بووە. كێ هەیە لە مرۆڤی داهێنەر قەرزاری خەیاڵ نەبێ. كەواتە خەیاڵ بەشــێكی گرنگ و زیندووە لە ژیانم دا نەک بە ناواقع و دوور لە ڕاســتی بزانین.. !لە ســەربازی كاتێک بە

شـــەو دەبوومە ئێشکگر و پاسەوانی (مەشجەب) یان (بابولنیزام)، ئەو تا کاتی نۆرەم تەواو دەبوو لەگەڵ خەیاڵ دەست لەملانێ و ڕامووسانماز بوو.. زۆربەی جارەکان بە خەیاڵ ســـەربازیم تەواو دەکرد و لە گەڕەکێک لــە گەڕەکەکانی بەغدا یان هەولێر بە تەنیایی خانوویەکم بەکرێ دەگرت و ژیانم دەبردە سەر ئە گەر تەندروستیم تێک نەچووبا ئەوا بڕیاری خۆم یەکلایی کردبووەوە کە لە بەغدا نەدەگەڕامەوەو هەرلەوێ ژیانی تەنیاییم هەڵدەبژارد. بۆیە ئاواتی تەنیایی لای من دەمێک بوو ســـەری هەڵدابوو. پێم وابوو تەنیایی دەمکاتە حاجی قادری کۆیی. دەمکاتە داهێنەر. کەمتر زۆر کەمتـــر بیرم لە ژن هێنان و پێکـــەوە نانی خانەوادە و گەرم کردنی کوانو دەکردەوە..

دوای ئەوەی لە بازاڕی ســـەوزەکە دەست بەکار بووم لە خانوویەکی بچووکی حەوشـــی ماڵی (مام حەمەد)ی ئامۆزای باوکم گیرسامەوە، ئەو ژوورە لە کەرپووچ دروســـت کرابوو. خانووەکەی ماڵی (مام حەمەد) بە گشـــتی لە قوڕ و خشت و کاریتە و شـــەقلە بوو. ژوورە بچووکەکەی من گوایە بەکرێ لێم گرتوون زۆر بچووک بوو وابزانم ٢X٢، ٥ بوو یان تۆزێک زیاتر. وەک لە خەیاڵەکانم کە پێشـــتر چاوم لە تەنیایی بڕیبوو ئاوا بوو. بەڵام ژوورەکەم وەک پێویســـت نەبوو. تەباخێکی نەوت و چاپەســـتێکی چاو یەک دوو قاپ و کەوچک و مەنجەڵ و پێداویســـتیم لەناو دانا.. دوو جەمـــە نانم لە دەرەوە دەخـــوارد. ئیتر ژیانێکم بۆخۆم دروســـت کرد، پێم وابوو ئاســـوودە بووم و کێشـــەیەکی ئەوتۆم نەبـــوو.. دوای ئەوەی لەگەڵ قەرۆ بووینە هاوڕێ گەلێ جار شـــەوان دەهات و سەری لێ دەدام (پلکە نەخشـــین)ی خێزانی مام حەمەد زۆر بۆم باش بوو (تا کاتی ئەو نووسینەم لە ژیان ماوە بەڵام زۆر بەتەمەنە لەوانەیە لە سەد ساڵ نزیک بووبێتەوە..) زۆربەی ئێوارەکان خواردنی بۆ دەهێنام. خانووەکەی ماڵی مام حەمەد دەکەوتە سەر بەستەکەی سەیداوە ماڵی (نەزهە) و (تەرفە) کە دوو خوشـــکی عەرەب بوون دەکەوتە پشـــت ماڵەکـــەی ئەوان. ئەو شوێنە وەک لە بەشەکەی تر باسم کردووە چەند ماڵە عەرەبێکی لێ بوو

که پێشـــتر گامێشەوان بوون. بەڵام لەو بەروارەی باسی دەکەم گامێشی لێ نەمابوو. من لەو ژووره بچووکە کە شـــوێنی حەوانەوەم بوو هەر لەو ژوورەش کوردایەتی و پارتایەتیم دەکرد و زۆر جار شـــعرم دەنووســـی. یەک لەو شـــعرانەی کە لەو ژوورەم نووســـیوە شـــعرێکە لە دەفتەرەکەم ماوە بەناوی (ســـکاڵا) دەزانم ئەو شعرەم کاریگەری لەسەرم هەبووە کە شعرێکی ڕەخنە ئامێزە بەڵام لە بیرم نەماوە بەچ بۆنەیەک نووسیومە. وا لە خوارەوە زۆربەی شعرەکە دەنووسمەوە:-

**(سکاڵا - ١٩٧٣\١٢\٨ - هەولێر - سەیداوە)**

**ئەی گوڵ بوولبولی ئاوازی هەستم-تۆشـــی شـــەرابی دەروونی مەستم**
**تاکەی وا ڕیســـوا بۆت دێوانە بـــم- تاکەی تامـــەزرۆی ئەو لێوانە بـم**
**تاکەی قوربانی خاکی بەرپێت بم- تاکەی بێ پەیمان لە چاوەڕێت بم**
**تاکەی بە فیدای عیشوە و نازت بم- تاکەی بێ ئەنجام بەندی ڕازت بم**
**تاکەی بە هیـــوای وتەی زارت بـــم- نامەوێنی بۆچی گرفتـــارت بم**
**گیانە گەر دیل بام ڕزگارم دەبـــوو- لە پاش ڕزگار بوون ڕۆژگارم دەبوو**
**گەر کچە کورد بای یا هەر ئینسانێ - یا لاشەیەک بوای خاوەنی گیانـــێ**
**تەنیا بـــە پەیڤێک دەهاتـــیـــە وەلام- بۆ دڵنیایی دەروونی شـــێوام**
**لات وایە شـــــەیدای چاوی کاڵتـــم- شـــەیدای زوڵفەکەو لێوی ئاڵتم**
**زۆر بە هەڵە چووی کە دەڵێ ی وایە- چونکە شـــەیدا نیم دڵم شەیدایە**
**کە دڵ شەیدات بوو ئارامی نەمـــا- کە تۆ دەبینێ بۆت دێتە ســـــەما**
**شەوم کردە ڕۆژ ڕۆژم کردە شـــەو- چاوم نەدەبووە میوانخانەی خـــەو**
**هەروام دەزانی . شادم . بەختیارم- وەکو گەنجی تر منیش دڵـــــدارم**
**ڕۆژ تا ئێوارە لە بیری تۆ بـــووم - بێ هەتوان خاوەن زامی بەسۆ بووم**
**ئەی ماڵت ڕمێ.. کە ماڵم ڕمـــا- خوا هۆشت بەرێ کە هۆشـــم نەما**
**چاوت کز کردم پشـــتت چەماندم - بە نووکی خەنجەر دڵت خورانـــدم**

**دونیام کچ نەبووا باشتر ژیر دەبووم - چوارەمەندی ئێستا خاوەن بیر دەبووم**
**بەڵام گرانە تەرازووی کچـــان - لای سەنگی هۆشم کەوتۆتە ئاسمان**
**گومانم نی یە لە بێ ویژدانیـــت - لە شانازیتا بە شــۆخی و جوانیت**
**خۆزگە دێوانەی چۆڵ وەهەردێ بـام - نەکتووشـی داوی گەردەن زەردێ بام**
**گیانە دەزانم کڵاوی بـــا بردووی - ئەندێشەی شعری هیوای لەدەست چووی**
**بەڵام چارچی یە بێ دەســـەڵاتم - تۆ شای شاری دڵ.. من بەندە و لاتم**
**نەفرەت لەو ڕۆژەی بە گۆشـەی چاوت - ئاورت دایـــەوەو من کەوتمە داوت**

جگە لەو شعرە چەند پارچە شعرێکی ترم لە دەفتەرە کۆنەکەم ماوە کە زۆربەیان شعری نیشـــتمانی و نەتەوەیی بوون، بەڵام ئەوەندە ساکار بوون پێم خۆش نەبوو بیانخەمە ناو ئەو یاداشتە.

هـــەر لـــەو ژوورە بچکۆڵەیەم گەلــێ جار کاک ( شـــابان) دەهات و بەرنامەی کۆبوونەوەکانمان دادەڕشـــت و باســـی دوایین پێشهاتەکانمان دەکـــرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕوون بووەوە کــە ڕژێم لە بەڵێنەکانی پاشـــگەز بۆتەوو ەو ئەوەی لە بەیانی یانزەی ئازاردا هاتووە جێ بەجێ ناکا.. ئەوساکە لەسەرکردایەتی شـــۆرش دوو بۆچوون هەبوو یەکێکیان پێی وابوو شـــەڕ نەکرێتەوەو لەگەڵ حکومەت تا دوا تنۆک هەوڵ بدرێ، هەرچی بەدەســـت هات لە شەڕ باشـــترە.. بۆچوونی دووەمیان کە زیاتر دەست ڕۆیشتووەکانی ناو پارتی بوون پێیان وابوو دەبێ شەڕ لەگەڵ ڕژێم بکرێتەوەو ڕژێم ناچار بکرێ هەموو خاڵەکان جێ بەجێ بکا..

ئەوانـــەی خاوەنی ئـــەو بۆچوونە بـــوون زیاتر ئەوانە بـــوون کە لە بارزانی نزیک بوون و ڕاستەوخۆ بە ڕێنمایی دەسەڵاتی شاهانشای ئێران دەجوولانەوە. بەڵام بۆچوونی (ســـەیدا سالح یوسفی) و چەند کەسێکی تر لەگەڵ بۆچوونی یەکەم دا بوون کە شەڕ نەکرێتەوە.. دوایەش بەدیار کەوت بۆچوونی شـــەڕ نەکردنەوە ڕاست تر و دروست تر بوو. قسەیەکی ســـەیدا ساڵح یوسفی دەگێڕنەوە دەڵێن کە لە ساڵی ١٩٧٥ مەلا مستەفا

بڕیاری دا کۆتایی به شەڕ بهێنن و شۆڕش تەواو بوو. ئەو وتبووی: (له کاتێک که پێویســـت بوو شەڕ نەکەین شەڕمان کرد.. ئێستاش پێویسته شـــەڕ بکەین شـــەڕ ناکەین..) بۆیه بۆچوونی شـــەڕ کردنەوه و ڕێنمایی یەکانی دەســـەڵاتی ئێران ســـەری گرت و له ســـەعات هەشتی ئێوارەی ١٩٧٤/٣/١٠ به دەنگی (ئەحمەد حەســـەن ئەلبەکر) یاســـای ئۆتۆنۆمی لـــە ڕادیۆی بەغدا خوێندرایەوه. گوایه حکومەتی بەغدا بەڵێنەکانی خۆی هێنایـــە جێ و لەدوای چوار ســـاڵ ئەوا بڕیاری دا جـــێ بەجێ ی بکا.. هەرچەنـــدە ئەو ئۆتۆنۆمی یه کۆمەڵێک کەم و کوڕی تیا بوو له هەمووی گرنگتر کۆمەڵێ ناوچەی گرنگی له کوردســـتان دابڕیبوو وەک کەرکوک و خانەقین و ســـنجارو تەلەعفەرو ئاکرێ و ناوچەی کفری و توزخورماتووو شوان و شێخ بزێنی.. بەڵام ئەگەر سەرکردایەتی پارتی سیاسەتی (یان هەموو، یان هیچ) ی بەکارنەهێنایە لەوانەیە بارودۆخەکه به شـــێوەیەکی تر هەڵدەســـووڕا.. له کاتێک دا هەموو دەسەڵات له شارەکان به دەست کوردەوه بوو ئێســـتاش نازانم بۆ له بەرەبەیانـــی یانزەی ئازاری ١٩٧٤ هەموو شـــارەکانیان چۆڵ کردو دام و دەزگاکانیان پەک خســـت و چۆڵ کران شـــارەکان بوونه شاری بێ حاکم. به هەزاران خێزان و خەڵکی تاک ڕوویان له شـــاخەکان کرد.. وەزیرەکانی سەر به پارتی و پارێزگارەکان وەزیفەکانی خۆیان جێهێشت و ڕوویان له شاخ کرد.. دەکرا ئەو دەسەڵاتەی کـــە له شـــارەکان هەیانبوو چۆڵی نەکەن و ئـــەو ئۆتۆنۆمی یەی ڕژێمی بەعس بڕیاری لەســـەر دا ئەوان هەرچەندە لەســـەری ڕازی نەبوون بەڵام وەک پرنســـیپ قەبوولیان بکردایەو شوێن بۆ خەڵکی خۆفرۆش و بەکرێ گیراویان چۆڵ نەکردایه تا ئەو دامەزراوەیه بگرنه دەست و له خزمەتی تـــەواوی ئایدۆلۆژیای حزبی بەعـــس بەکاری بهێنـــن.. هەوڵیان بدابایه بەردەوام پاڵەپەســـتۆ بخەنه سەر ڕژێم بۆ چاکتر کردن و فراوان کردنی ناوچەکه.. نەک شـــارەکان بۆ خەڵکی جـــاش و خۆفرۆش چۆڵ بکەن و یاری به چارەنووسی خەڵکەکه بکەن..

لەگەڵ کشـــانەوەی دەســـەڵاتی کوردی له هەرسێ شاری سلێمانی و

هەولێرو دهۆک. ڕژێم دەسـەڵاتێکی کارتۆنی بەناوی ئەنجوومەنی یاسـا دانان بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی و ئەنجومەنی جێ بەجێ کردنی دانا و بەکرێ گیراوەکانی خۆی کردە بەرپرس لە دام و دەزگاکان و شـەڕێکی سەخت هەڵگیرسـایەوە و ئێران تا کاری بە شـۆڕش هەبـوو یارمەتی مەمرەو مەژینـەی داو کە بەرژەوەنـدی یەکانی لەگەڵ شۆڕشـی کورد نەما بە هەرزانترین نرخ فرۆشتی!!!

لـە دوای ئـەوەی کە بـارەگای پارتی لە هەولێر نەمـا. هیچ جۆرە ڕێکخسـتنێک لەناو شار دروسـت نەبووەوە.. ئێمە زۆر چاوەڕێمان کرد تا پەیوەندیمان پێوە بکەن بەڵام بێ سـوود بوو. سـەیر لەوە دابوو بە هیچ شـێوەیەک خەیاڵم بۆ لای ئەوە نەدەچوو کە ڕژێم دەسگیرمان بکا. ئەو هەسـتە نەتەوایەتی یەی ئەوساکە هەم بوو ئەوەندە پلەی بەرز بوو ئەوەنـدە مەزن بوو ئەوەندە گەرم بوو. ئاگام لە گرتن و کوشـتن نەما نەفرەت لەوانەی ئەو هەستەیان لاواز کرد.

## * کوورانی دەشتەکیان و خانووەکەی حاجی ئامینە:-

کووران ئەو گەڕەکە مللی یە کۆنەی هەولێر کە دەکەوێتە باشـــووری ڕۆژئاوای شار،لەسەر شەقامی شەست مەتری دەست پێ دەکا تا دەگاتە خانووەکانی نەســـیج و گەڕەکی کوردستان. لە ڕۆژهەڵاتەوە لە شەقامی ســـەرەکی مەخموور تا چوار سایدی گەڕەکی نیشتمان لە ڕۆژئاوا..من بە چەندین جۆر ئەو کوورانەم بینیوە،یەکەم جار لە ناوەڕاستی شەستەکان دیومە کە کەمتر لە ٣٠٠ ماڵ بوو، هەموو خانووەکان قوڕو خشت و تاک تاکە کەرپوچ بوون. سەری هەموو خانووەکان (کاریتە)و (شەقڵە) بوون و ئاو و کارەبـــای نەبوو،بیرێکی ئیرتوازی لە ناوەڕاســـتی کووران هەبوو، هەموو کچەکانی ئەو گەڕەکە ڕۆژانە بە بەرمیلی ئاوی پێنج گالۆنی ئاویان لە تانکی یەکەی ئەو بیرە دەهێنا کە تایبەت بوو بۆ ئەو مەبەســـتە زۆر جار پەیمانـــی دڵداریش لە ڕێگای ئەو ئاو هێنانـــە بەیەک دەدرا.تا بەو دوایەش بەو کۆڵانەیان دەوت کۆڵانی تانکی..جگە لەو کۆڵانە زۆری تریش ناوی تایبەتی خۆی هەبوو وەک (کۆڵانی سەر کەندێ) و (کۆڵانی شێمەی قەساب) و (کۆڵانی شێران) و (کۆڵانی پیستە) و (کۆڵانی مەعمەل بەفر) دوایە بووە (کۆڵانی شوقەکان) و (کۆڵانی بەرین) و چەندین کۆڵانی تر. کووران بەر لە دروست بوونی شوێنەکەی دەکەوتە سنووری شارەوانی و پڕ بوو لە کوورەی کەرپووچ کردن واتە کارگەی کەرپووچ دروســـت کردن کە هەولێری یە کۆنەکان ئەو کارەیان دەکردو ئەو پیشەیە تا ئێستا بۆتە ناوی تیرەیان چونکە هەولێری یە کۆنەکان بە پێ ی پیشـــەیان لە یەک جیا دەکرانەوە وەک کوورەچی – چەخماخچی – قەساب – دۆغرەمەچی - نـــەداف – بـــەزاز و چەندین پیشـــەی تر..بۆیە کوورەچـــی یەکان لە شـــوێنی کوورانی ئێســـتا کوورەی کەرپووچیان هەبوو،گەڕەکەکەش لە سەرەتاوە لە چەند ماڵێک دروست بووە هەربەناوی شوێنەکە ((کووران)) واتـــە کۆی (کـــوورە) ناونراوە کە پێشـــتر پـــێ ی وتراوە کـــووران..

من که پاتاڵەکانم لە سـەیداوە گوازرایەوە کووران ئەو ژوورەی بۆیان گرتبووم ڕاستەوخۆ دەکەوتە سەر ئەو چاڵە قووڵ و فراوانانەی کە کاتی خۆی کوورە چی یەکان گڵیان لێ هەڵکەندووە بۆ دروست کردنی کەرپووچ و ئەو کەرپووچانەش بە پشتی بارەبەر دەگوازرایەوە بۆ شوێنی کار لە هەر جێگایەک بووا .ئەو کەندە گەورانە کە ئێستا شوێنەکەی بۆتە ماڵ لە نێوان کوورانی کۆن و شـەقامی شەست مەتری.ئەوساکە وەک خۆیان بە چاڵی مابوونەوە . کە شەست مەتری دروست کرا بەناو ئەو چاڵانەدا تێ پەڕی. دوایە چاڵەکانی تریش وەک زەوی فرۆشان و ماڵەکان ناچار بوون ئەو چاڵانە یان بکەنە ژێر زەمین یان پڕی بکەنەوە و بە دەیان قەلاب گڵی تێ بکەن. ئەو کۆڵانەی خانووەکەی لێ گیرا بە کۆڵانی سەرکەندێ ناسرا بوو.ئەوساکە یەکەم کۆڵانی کووران بوو کە لە لای شەسـتی یەوە دەستی پێ دەکرد.

کە جاری دووەم کوورانم دیتەوە لە ساڵی ١٩٦٩ بوو لە پۆلی سێ ی ناوەندی دەمخوێند و خانوویەکمان لە گەڕەکی کووران بەکرێ گرت وەک لە بەشی یەکەم باسم کردووە .بەڵام ئەمجارەیان کە هاتمەوە کووران جاری سێ یەم بوو.ئەوجارەیان بە شێوەیەکی جیاواز کە زۆر فراوان و گەورە بووبوو.

بۆیە وتوومە کوورانی دەشـتەکی یان چونکـە خەڵکەکەی زۆربەیان خەڵکی گوندەکانی کەندێناوەو قەراج و مرکی یەی دەشتی هەولێر بوون. لە هەولێر دیاردەیەکی ناوچە گەڕێتی لە دروست بوونی گەڕەکەکان خۆی دەنوێنێ،ئەوانەی خەڵکی گوندەکانـی باکووری هەولێر بوون بەتایبەتی شەقڵاوە و مەسیف و ئەولاتر، لە گەڕەکەکانی شۆڕش و برایەتی و بەشێکی تەیراوە نیشتەجێ بووبوون. ئەوانەی خەڵکی بەرانەتی بوون لە گەڕەکی تەیراوە و گوندەکانی ڕێگای گوێڕ لە گەڕەکی سایلۆ و گوندەکانی ڕۆژهەڵاتی هەولێر لە باداوەو ئیسـکان و مەنتکاوە و بەشێکی ئازادی و ئەوانەی لە سـنووری مرکی یەی دەشـتی هەولێر و شـەمامک و کەندێناوەو قەراج بوون لە کووران و نەورۆزو بەشـێکی ئازادی نیشتەجێ بوون. شارستانە کۆنەکانیش جگە لە گەڕەکی قەڵا لە تەعجیل و عارەبان و سـەعدوناوەو

خانەقا و بەشـــێکی کەمی تەیراوە و ئازادی و ئیسکان نیشتەجێ بوون..

ئەو پێکهاتەی دانیشـــتوانی هەولێر کە ئێســـتا بەهۆی فراوانی شاری هەولێر ئەو شێوە نیشتەجێبوونە گۆڕانی بەسەردا هاتووە .کووران بەهۆی بێ کاری لە گوندەکان و بارودۆخی پاڵەپەســـتۆی ڕژێم لەســـەر خەڵکی گوندەکان تا چەک دژی شـــۆڕش هەڵگرن بەتایبەتی دوای ساڵی ١٩٦١ زیاتر فراوان بوو.لە ســـەرەتاوە بەهۆی ئەوەی گەڕەکێکی هەژار نشـــین بووە خوێنـــدەواری تیادا بە ڕێژەیەکی بەرچاو کەم بووە .لە ســـەرەتاوە هیچ قوتابخانـــەی لێ دروســـت نەکراوە .تـــا دوای حەفتاکان .بەڵام ئەو گەڕەکە دوایە چەندین خەڵکی نووســـەر و ڕوناکبیرو سیاسەتمەداری لێ هاتـــە بەرهەم کە لە ئینســـوکلۆبیدیای هەولێر بە درێـــژی باس کراوە .

من کە لە گەڕەکی ســـەیداوە بووم دوای ئـــەوەی کارەکەم لە بازاڕی ســـەوزەکە بەهۆی ئەو کێشەیەی کە باسم کرد نەما .ئیتر دوو مانگی زۆر ناخـــۆش لە ژیانم بەبـــێ کاری مامەوە .لەو ماوەیە لە دوو لا مەســـت و حەیران بووم،لە لایەک بەدوای ئەوەدا دەگەڕام چۆن کێشەکەم چارەسەر بکەم لە لایەکی تریش چۆن کارێک بدۆزمەوە .چونکە کارەکەم لە دەست دا خاوەنـــی هیچ نەبـــوزم و پارەی خەرجی دوو مانگ یان ســـێ مانگ زیاتـــرم لا نەبوو. .ئێوارەیەک لە کاتی نوێژی عەســـر بوو لە فولکەکەی بەرانبەر بازاڕی ســـیروانی ئێســـتا بۆ لای قەڵا دەسووڕامەوە، کە ئێستا ئەو گۆشـــەیە بەرانبەر  بازاڕی نیشتمان و گۆڕەپانەکەیە .یەکێک بانگی کـــردم کە ئاوڕم دایەوە (کێخوا عەلۆ) ی گوندی قورشـــاغلو بوو کە بە پەلە بۆ لای گەراجی جەلال خەلیل دەهات (لە بەشـــی یەکەم باسی ئەو گەراجەم کردووە) .کێخوا عەلۆ سەد جار یادی بەخێر زۆر جار بە (باعەلۆ) بانگمان دەکرد،پیاوێکی چاک و دڵپاک و سنگ فراوان بوو کوڕی حاجی ڕەســـول بوو کە یەکێک بووە لە پیاوە ناودارەکانی گوندی قورشاغڵو و ســـاڵانێکی زۆر موختار ی گوند بووە لە گەڕەکی بندیانان. دوای مردنی حاجی ڕەســـول کێخوا عەلۆ لە شـــوێنی دەبێتە موختـــار و برا گەورە .

پیاوێکی بەڕێز و خۆشەویست و قسە خۆش بوو.. ئەو کاتی باسی دەکەم تەمەنی لە سەرووی شەست سالان بوو. منیش بۆ لای گەڕامەوە وچاک و چۆنیمان کرد..پێ ی وتم ئەگەر کارم نی یە ئەو کارێکی بۆ دۆزیومەتەوە لە مەیدانی ئاژەلان تا ببمە نووسـەر لای (حەمەدی دەروێش عەلی) کە دەلالێکی بەناوبانگی ئەوسـاکە بوو.لەبەر ئـەوەی من بێ کار بووم زوو ڕەزامەندیم داو سوپاسیشـم کرد،تێ ی گەیاندم کە پێشتر لای حەمەدی دەروێش عەلی باسـی منی کردووە.شـوێنێکی پێ وتم کە بەیانی بچمە ئەوێ.ئەو شوێنە وەک ئۆفسێت دوای ئەوەی لە مەیدان دەگەڕانەوە دەبوا لەوێ دابنیشـن بۆ هەژمارکردنی زیان و قازانجەکانیان.مێز و کورسی و قەنەفەی لێ بوو.بۆ ڕۆژی دوایی لەو سەعاتەی کە باعەلۆ پێ ی وتبووم چوومە ئۆفسـێتەکە کە دەکەوتە ژێـر ئوتێلێک پێ ی دەووترا (ئوتێلی جوندیـان) لە شـەقامی (باتە). دیارە پێش مـن کوڕێکی لێ بوو ناوی (نەجات) بوو شارسـتان بوو بەهۆی ئەوەی لە پەروەردەی هەولێر تازە دامەزرا بوو نەیدەتوانی کارەکەی ئەنجام بدا، بۆیە من چووم شـوێنەکەم گرتەوەو مانگانە بیست دینارم وەردەگرت..

حەمەدی دەروێش عەلی لە تیرەی لەک بوو.پیاوێکی بە ویقاڕ بوو بە هەیبەت بوو.زۆر چاوتێر و قسـەزان بـوو. یەکێک لە برادەرە نزیکەکانی فـارس باوە بوو. زۆر لایەنگری پارتی بوو. زۆر جار باسـی برادەرایەتی و بەسـەرهاتەکانی خۆی و فارسی باوەی دەکرد. کەمێک تووڕە و توند بوو.لە ژنە گەورەکەی کە ئامۆزای خۆی بوو تەنیا کچێکی هەبووە دوایە منالی نەبووە ژنێکی گەنجی تازە پێگەیشـتووی هێنابوو کەچی خۆی لە سـەرووی شەست سـالی بوو. کوڕێکی دوو سال یان سێ سالی هەبوو.

پێم وایە بەدەسـت بەکار بوونم لەو شوێنە فرسەخێکی نوێ لە ژیانی من دەستی پێ کرد و بە هەنگاوێک بۆ چوونە پێشی ژیانی خۆم دەزانم. چونکـە دوای ئەو کارەم هێـواش هێواش بەرەو جێگیـری و گوزەران باشتر چووم.چونکە بیسـت دینار بۆ ئەوساکە پارەیەکی کەم نەبوو.کە

لەو کارەم دامەزرام هێشــتا لە ژووره بچووکەکەم گوزەرانم دەکرد.ماڵی (رابعەی خوشکم لە کووران لە ژوورێکی ئەو خانووە بوون کە باسم کرد. پیاوەکەی ســەرباز بوو،کە لە مۆڵەت دەهاتــەوە زۆر داوای لێ دەکردم کە بچم لە حەوشــەکەی ئــەوان ژوورێک بگرم کــە خزمایەتیان لەگەڵ ماڵی (حاجی ئامینە)ی خاوەن خانوو هەبوو.. خانووەکە ســێ ژوور بوو ژوورێکیــان خاوەن خانوو خۆی تیایدا بــوو ژوورێکیان ماڵی (ڕابعە) ی خوشکم و ژوورێک بەتاڵ بوو. بەڵام من بە هیچ شێوەیەک داواکەیانم قبوول نەدەکرد چونکە نەمدەویست لە سەیداوە دوور بکەومەوە (بەتایبەتی لەو مرۆڤەی کە خۆشەویســتی یەکی گەورەی پێ بەخشــیم.!).تا جارێکیان لەگەڵ (مام حەمەدی ئامۆزای باوکم) قســەکانمان یەکی نەگرتەوە بۆیە خــۆم وەڵامم بۆ ئەحمەدی بــرام و زاواکەم نارد کــە دێمە کووران.بەو شــێوەیە لە کووران و لە خانووەکەی (حاجــی ئامینە) جێگیر بووم..

ئــەو خانــووە خانووی کوڕی حاجــی ئامینە بوو بەناوی (ســمایل دەروێش) خەڵکی گوندی شــێراوەی نزیک پردێ بوو لە تیرەی سارمەمی بوو.کوڕێکــی هاوتەمەنی منی هەبوو بەناوی (بەهرام) ئەویش ســەرباز بوو،کــە لە ســەربازی دەگەڕایەوە دەهاتە ئــەوێ و نەدەچووە وە لادێ بــۆ لای دایک و باوکی.دایکی خوشــکی (عەلی حەســەن بلباس) بوو کە تێکۆشــەرێکی کۆنــی نەتەوەکەمان بوو.بەهرام بــەو دوایی یە بووە فیتەرێکی بەناوبانگ لە شەقڵاوەو بە حاجی بەهرام ناسرابوو. بەڵام مەرگ دەرفەتی نەدا و کۆچی دوایی کرد.. یادی بەخێر.

نیشــتەجێ بوونم لە کووران لە چەند لایەکەوە باشتر بوو.یەکەمیان ئەوە بوو ژوورەکە ژوورێکی گەورە بوو بۆ گوزەرانی ماڵ دەبوو. دووەمیان لەگەڵ ماڵی خوشکەکەم بووم لە جل شوشتن و هەندێ کاری تر هاوکاری دەکردم، بەڵام وەک پێویست نەبوو. لە لایەکی ترەوە لە کارەکەم نزیکتر بووم.چونکە ئەو کاتی مەیدانی ئاژەڵان لە ڕێگای کۆنی موســڵ بەرانبەر سایلۆ بوو. ئەوێش لە کووران نزیکتر بوو وەک لە سەیداوە. بەڵام ئەوەی

بۆ من ناخۆش بوو ئەوەبوو من حەزم لە ژیانی گەڕەکی سەیداوە بوو کە لە قەرۆ و برادەرە تازەکانم نزیک بووم.. جگە لە دالّدەکەم (کە شوێنی بـاس کردنی نی یە). (پوورە نەخشـــین)ی خێزانی مام حەمەد زۆر بۆم باش بوو، زۆر دلتەنگ بوو بەوەی کە ئەوێم بەجێهێشت.زۆریش هانی دام کە دەست بەرداری دالّدەکەم نەبم.بەتایبەتی کە ئاگاداری نێوانمان بوو.

ئەو پارچە شـــعرەی لای خوارەوە دیارە باســـی ئێوارەیەکی ساردی زســـتان یان پایز دەکا یادگارێکی ئێوارەیەکە کە من لە هەوارگەی تازەم بەرەو هەوارگەی کۆنم یان باشـــتر بلّێم مالّی دالّدەکەم گەڕاومەتەوە.کە لە دەفتەرەکەم مابوو.

**(ئێوارە بوو ١٩٧٥\١١\٢١ - هەولێر - کووران)**

**ئێـــوارە بوو دوای شـــێوان بوو- خەندە ئـــــاوارەی لێوان بوو**
**بە فەرمانی دلّێکی مەســــــت - دەرپەڕیشــــتم بۆ جێ ی مەبەست**
**کەمێ تـــاریک کپ و کڕ بوو - شـــەقام بە پاشـــماوان شـــڕ بوو**
**بایەکـــی ســـــارد بـــە حەودالّی- قـــژی کـــالّـــی ڕادە مـــــالّی**
**دان ولێـــوی تێـــک دەشـــــکاند- نامـــەی لە گیرفـــان دەفڕاند**
**داری بـــەرزی زل بـە پێـــوە- هاشـــــە هاشـــیان دەهات لێوە**
**چۆلەکـــەکان لەنـــــاو داران- دەیانجریواند وەک بێچـــاران**
**لەگەلّ ورشـــــە تێکـــەلاو بـــوو- ئاوازێکی دلّ ســــــــووتاو بوو**
**وەک گریانـــی مـــالّ وێرانـــــــێ- پــــــاڕانـــەوە لـــە یەزدانێ**
**دلّە خورپێ بە تاســـــــــەوە- وەک مەی سەرخۆش لە کاسەوە**
**چۆن ڕەوتێ بوو لەو ســـنوورە- هەروە ک شێتێکی بـێ هوورە**
**لەو تێپەڕ بووم دلّ پەریشـــــان- دیســـان کەوتمـــە گۆڕی کۆلان**
**کۆلانێکـــی تەســــــک و باریک- لایەک ڕوونـــاک لایەک تـاریک**
**کـــــڕ و کـــپ و بێ هـــەرا بـــوو- جلی ماتی لەبـــەردا بـــوو**

کەس دیار نەبوو نە ژن نە پیاو- دەرگـای حەوشـــەکان داخراو
هـــەنـدێ دەرگــا لـــە دەرەوە- گڵـــۆپێـکی بەســـــەرەوە
تـــەنیـا گڵـــۆپ هاوەڵم بوو- لــە تـەنیایی لەگەڵـم بـــوو
لــە ژوور دەهات بۆنی چـــایە- دەنـگی (بابە )و دەنگی (دایە)
چ کاتێکی پڕ تاســـــە بوو- ســـــنگ تامەزرۆی هەناسە بوو
دەرپـێـــشتم بێ بیر و هۆش- وەک پەیکـەری پیاوی سەرخۆش
بـــۆ ئەو دیوی کام دەرگـا بوو- بۆ خەوتنی کام جێگـــــا بوو
هەنـــگاو بە هەنگاو بۆم دەبـــرد- خرپــــەی دڵـم زیادی دەکرد
ئاخـــۆ چۆن بێ کـــێ ببینێ- چۆن بێشـــــکەی دڵ بهەژێنێ
چرپـــەی مێروو گوێچکەی دیوار- خوایە لێمـــان نەبنــــە نەیار
دیوار کەڕ بێ مێروو ســـڕ بـــێ- وەک مان گرتن دونیـــا کڕ بێ
بە نەرمە ڕۆ و ڕوانینی ســـارد- تا گەیشـــتمە شوێنی موراد
دەرگاکـــەی ماڵ وەکو قەڵغان- بە ڕووی لوولەی چـەکی ویژدان
لـــە نێـــو چـــەوانم چەقیـــەوە- لەرزین لـــە دڵمــــا تەقیەوە
تا بە زەقی هەردوو چـــاوان- قاچـــم خســـتە حەوشـــی تاوان

* نسکۆی شۆڕش:-

هەرچەنـــدە ئـــەو بابەتە کاری مـــن نی یە لێرە باســـی بکەم چونکە ئەوە کاری مێژوو نووســـەکانەو زۆری لەســـەر باس کـــراوە، چ ئەوانەی نەیـــاری ئـــەو شۆڕشـــە بوونەو بە شۆڕشـــیان لـــە قەڵەم نـــەداوە، چ ئەوانەی لە داخان ڕەخنەیان ئاراســـتەی ســـەرکردایەتی بارزانی دەکردو چ ئەوانـــەی تۆباڵیان دەخســـتە ئەســـتۆی ئێران و ئەمەریـــکا و حزبی شـــیوعی کە هۆکاری سەرەکی نسکۆی شـــۆڕش بوونە..بەڵام ناکرێ من وەک کەســـێکی ناو سیاســـەت بە چاوچوقانێ ئـەگەر وەک یادگاریش بێ لاپەڕەیەک یان دوو لاپەڕە لەســـەر ئەو ڕووداوە جەرگ برە نەنووســـم..
شۆڕشی کورد لە ماوەی ساڵێک ١٩٧٤/٣/١١ تا ١٩٧٥/٣/١١ شەڕێکی

خوێنـــاوی و بەرگری یەکی بەهێزی کرد کـــە زۆرترین قوربانی لە ماوەی خەباتی خۆی دا لەو ساڵە شەڕەدا بەخشی. یەکەم ڕۆژ کە من هەواڵەکەم بیســـت چێشـــتانەیەک بوو لە مەیدانی ئاژەڵان بووین دیم (مام حەمەدی دەروێش عەلی) دەستی لەژێر پشتێنەکەی ناوە و کز و مات و مەلوول بۆ لای من هات و بە قورگی پڕ لە گریانەوە گوتی:- (سەعدی ئەوە لۆ وەهای لێ هات..؟) منیش تەنیا ســـەرم بۆی لەقاند ئەویش ســـەیرێکی (نووری ئەبو شـــوراب) ی کرد کە لە نزیکمان وەســـتا بوو وەک ئەوەی بڵێ (خۆ قســـەکەی ڕاست دەرچوو..!) مام حەمەد دەیزانی من پارتیم و هەڵوێستم چۆنە.گەلێ جاریش لەگەڵ نووری ئەبو شوراب تووشی مل ملانێ دەبووین چونکە نووری شـــیوعی بوو، ئەوکاتیش شـــیوعی یەکان شـــان بە شانی ســـوپای عێراق دژی شۆڕشـــی کورد دەجەنگان دوای ئەوەی بەرەیەکیان لەگـــەڵ حزبی بەعس بەنـــاوی بەرەی نیشـــتمانی مۆر کرد. بەڕاســـتی تراژیدیایەکی زۆر گەورە بوو.بێ ئومێدی یەکی زۆری دروست کرد، خەڵک بـــە تەواوەتی ورەیان بەردا و بێ تاقەتیان پێوە دیار بوو.. شۆڕشـــێکی چەندین هەزار چەکداری هەبێ، بە یەک بڕیاری ســـەرکردایەتی ئەو هەموو چەکە لە شان بکرێتەوە ئاخۆ دەبێ چ شۆڕشێکی گۆشدراو بە بیروباوەڕی پتەو و پۆڵایین بێ..! کوردســـتان وەک سەروچاوی ئەو پێشمەرگانەی بە لاشەیەکی شەتەک و ماندوو بوونەوە دەگەڕانەوە تۆزاوی بوو.. ڕەنگەکان و ڕووەکان هەر بە ڕاستی زەرد هەڵگەڕابوون.. شیوعی یەکان پێ یان وابوو ئەوان ڕۆڵی سەرەکیان لەو نسکۆیە بینیوە و ئەوانە کۆنە پەرستن و ئەو وشەیە نووری ئەبو شوڕاب زۆر بەکاری دەهێنا لەگەڵ نان و پیازیش هەر وشـــەی (رجعی) و (ڕەجعیەت) ی بەکاری دەهێنا دەیگۆت:- (ڕەجعیەت ئاخیری لـــە ناوەخۆی خۆی دەخواتەوە و دەتاوێتـــەوە..) چەکدارەکانی حزبی شـــیوعی بە ڕێنمایی یەکێتی ســـۆڤیەتی ئەوســـاکە شان بە شانی ســـوپای عێراق دژی پێشـــمەرگە دەجەنگان، چونکە ئەوکات پەیوەندی یەکێتی سۆڤیەت و عێراق لەوپەڕی بەهێزی دابوو.بە پێچەوانە بە تەواوی

نێوان ســــەرکردایەتی شۆڕش و سۆڤیەت پچڕابوو. دکتۆر فازڵ ڕەسول لە کتابەکەی (کوردســـتان و سیاسەتی ســـۆڤیەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا) کە بە زمانی ئەڵمانی نووســـراوە و بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدراوە لە بابەتی نســـکۆی شۆڕشی کورد و ئامۆژگاری یەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ عێراق دەڵێ:- (دوورکەوتنەوەی پەیوەندی یەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئازاری ساڵی ١٩٧٤ فراوان بوو لە هەمان کاتدا پشتگیری ســـەربازی یەکێتی سۆڤیەت بۆ عێراق گەیشتە لووتکە و پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی کورد و ئەمەریکا چڕ بووە وە کە پێشتر بەو شێوەیە نەبوو..لە نامەکانی نێوان بارزانی و کێسنجەر کە دوای تێکچوونی شـــۆڕش بڵاو کرایەوە و هەروەها دیکیۆمێنتەکانی کۆنگرێسی ئەمەریکی. قەیرانەکانـــی کورد لە نێوان ململانێی هێزە گەورەکان نیشـــان دەدەن..

شەڕ لە ئازاری ١٩٧٤ دەستی پێ کردو تا ئازاری ١٩٧٥ بەردەوام بوو کە (٦٠٠٠٠) شەســـت هەزار کەس تیایدا بوونە قوربانی و ئەو یارمەتی و پشـــتگیریە سەربازی یەی سۆڤیەت بۆ عێراق ئەنجامەکەی پێکاو سوپای عێراق بە ڕێنمایی و ئامۆژگاری ســـۆڤیەت شـــوێنە ئیســـتراتیجی یەکانی داگیر کرد و بە پێ ی ســـەرچاوە کـــوردی و ڕۆژئاوایی یەکان فڕۆکەوانە ســـۆڤی یەتی یـــەکان چەند ســـووڕانەوەیەکیان ئەنجـــام داوە قازیفەیان بەکارهێناوە. یەکە چەکدارەکانی حزبی شـــیوعی عێراق شـــان بە شانی ســـوپا بەشداری شەڕیان دەکرد دژی شۆڕشـــگێڕە کوردەکان.ڕاستە ئەو بەشـــداری یە لە ڕووی پێوانەی ســـەربازی یەوە شـــتێکی ئەوتۆ نی یە، بەڵام دەربارەی هەڵوێســـتی سیاســـی گرنگە..چونکە حزبی شـــیوعی و ڕێکخراوەکانی ســـەر بە ســـۆڤیەت دەیان دەربڕینیان دژی شۆڕشی کورد دەرکرد و چەندین کۆنگرەی نێو دەوڵەتیان بەســـت بۆ پاڵپشتی عێراق..)

لەو نووسینەی فازڵ ڕەسوڵ دەردەکەوێ کە هەڵوێستی حزبی شیوعی و یەکێتی سۆڤیەت یەک لە هۆکارەکان بووە بۆ ڕووخان و شکستی شۆڕش کە هەموو پاڵپشتی و هاریکاری ئازادی خوازانی ئەو سەردەمی لە شۆڕش کەم

کردەوە کە ئەو کات ڕێکخراوە ئازادی خوازەکان لە ژێر چاودێری یەکێتی سـۆڤیەتەوە بە ئاراسـتەی ئەوان دەجوولانەوە چونکە بە پێوەری ئەوان بلۆکی ڕۆژئاوا بە ئیمپریالیزم ناوزەد دەکرا .بەڵام ناکرێ هۆکارە بابەتی یەکان بکەینە تاقە هۆی ڕووخانی شـۆرش هەرچەندە هۆکارە دەرەکی یەکان بە تایبەتی بەرژەوەندی یە هەرێمی یەکان و جیهان کاریگەری خۆیان هەبوو بە تایبەتی قازانجەکانی ئێران و ناچاربوونی عێراق .لەوانەیە هۆکارە خۆیی یەکان کاریگەریان زیاتر هەبووبێ.. بە تایبەتی کە سەرکردایەتی شۆڕش، ئەو سـەردەم هەموو هێز و توانای خۆی بەتەمای ئێران جێ هێشتووە،نە پەروەردەی حزبی و نە ئیستراتیجی یەتی شۆڕش و نە شۆڕش جەماوەری بوو.بە پێچەوانە شۆڕشـی سـەرکردە بوو!!! بۆیە بە بڕیارێکی سەرکردە هەزاران چەک لوولەیان لە خوارەوە کرا و فیشـەکەکان ژەنگیان هەڵێنا..

( (عەبدوڵا ئاغای پشدەری)) لە کتێبەکەی (نسکۆی شۆڕشی ئەیلول) دەڵێ÷ ( (سـەرکردایەتی شـۆڕش هیچ ڕێگە چارەی تری بە دەستەوە نەمـا جگە لەپەنـا بردن بۆ دوژمن و ڕۆیشـتنی بۆ نـاو خاکی ئێرانی ئیسـلامی و ئەوەشـمان لەبیر نەچێ کە ئەوە بوو سـەرۆک بارزانی هەر دوا بـە دوای ڕێکەوتنەکـەی جەزایر کۆبوونەوەیەکـی فراوانی لە حاجی ئۆمەران گرێدا و زۆربەی زۆری کاربەدەسـتانی سیاسی و عەسکەری تێدا بەشـدار بوو.من خۆم بەهۆی بارودۆخی بەرەکانی شەڕ لە بەرەی بالەک نەمتوانی کەوا بەشـداری لەو کۆبوونەوەیە دا بکەم .کۆبوونەوەکە ئەگەر لە بیرم مابێ لە مابەینی ٢٠ و ٢٢ ی ئازاری سـاڵی ١٩٧٥دا بەسترا و لە کۆبوونەوەکەدا سەرۆک بارزانی هەموو بارودۆخەکەی بۆ شیکردنەوەو پێی وتبوون کە من توانای گەڕان و سـووڕانی جارانی پێشـووم نەماوە کەوا بە شـەڕی پارتیزانی هەڵسم، ئەگینا هەر کوردستانم بەجێ نەدەهێشت و هەر بەردەوام دەبووم لەسـەر بەرگری کردن لە خاک و وڵات،کوڕەکانیشم دیسـانەوە ئەو توانایەیان نیە. بەڵام من ئامادەم هەر کەسـێک لە ئێوە توانـای سـەرکردایەتی و بەڕێـوە بردنی ئەو کارەی هەیـە من هەرچی

ئیمکانیات که له ژێر دەسـتم دا هەیه دەیخەمه ژێر دەسـتیانەوه .ئینجا هەر هەموویان وتبوویان ئێمه کەسمان ناتوانین بەبێ وجوودی جەنابت و یـا کوڕەکانت ئەو بارە گرانه هەڵگرین..ئیتر من لێرەدا بۆ مێژوو دەڵێم و نایشارمەوه ئەویش ئەوەیه من هەر ڕۆژی دوای کۆبوونەوەکه له بەرەکانی شەڕەوه به مەبەسـتی هەندێ ئیشی تایبەتی پەیوەست به هێزی بالەک هاتمه لای سـەرۆک بارزانی و لەو کاتەشـدا بەڕێکەوت خوا لێ خۆشبوو عەلی عەسـکەری هات و هەر لەبەر چاوی من سـەرۆک بارزانی گوتی:-

(کاک عەلی ئێوه هەر دەتانوت ئەگەر مەلا مسـتەفا ماوەمان بدا ئێمه وا دەکەین و وا دەکەین دەفەرموون ئێسـتا مستەفا نەک هەر ماوەتان دەدا بۆ ئیشـکردن بەڵکو هەموئیمکانیەتێکی خۆشم له ڕووی پارەو چەک و تەقەمەنییەوه دەخەمه ژێر دەسـەڵاتتان. بمێنەوه له کوردسـتان- خوا لێ خۆشـبوو کاک عەلی وتی- ئەزبەنی ئێمـه بەبێ وجوودی خۆت هیچ شـتێکمان پێ ناکرێ.. لێره قسەکانی عەبدولا پشـدەری تەواو بوو.!).

من پێم وایه ئەو نووسـینەی کاک عەبدوڵا پشدەری له چەند شوێنێک له ڕاسـتی دووره!!! بۆ نموونه ئەو کات ئێرانی ئیسـلامی نەبووه ئێرانی شاهانشاهی بوو. چونکه شۆڕشی ئیسلامی ئێران له شوباتی ساڵی ١٩٧٩ دەسـەڵاتی گرتە دەسـت. خاڵێکی تریان دەڵێ کۆبوونەوەکه له ٢٠-٢٢ ی مانگی ئازار بوو من له بەرەکانی شـەڕ خەریک بووم .ئەوه یان دەبێ کۆبوونەوەکـه لەو بەرواره نەبێ (ڕاسـتی یەکەی لـه ١٩٧٥/٣/١٨ بوو نـەک لـه ٣/٢٢) ئەگەر لەو بـەروارەش بووه ئەوا ئـەو کات هیچ تەقه نەمابـوو تا بەرەی شـەڕ هەبێ.. بـەڵام دەربارەی ئـەوەی که بارزانی داوای له خەڵک کردووه که ئەو تاقەتی نەماوه له شـۆڕش بەردەوام بێ هەموو ئیمکانیاتی دەخاته بەردەسـت هەر کەسێ ئەو بەرپرسیارەتی یه هەڵگرێ.ئەوا هەموو بەڵگەکان و لەسـەر زاری سـەرکردەکانی ئەوساکه بەتایبەتی ئەوانەی بەشـداری کۆبوونەوەکەیـان کردبوو پێچەوانەی ئەو قسـانەی کاک عەبدوڵا پشدەرین.هەر بۆ نموونه هەندێکیان دەنووسمەوه:

١- ئــەو كاتــەی بارزانی بڕیــاری كۆتایی شۆڕشـــی دا هەندێک لە ســـەركردەكان و پێشمەرگەكان دژی ئاگر بەســـت بوونەوەو ڕایان گەیاند كەئێمە سیانزە ساڵە بۆ بەدەست هێنانی مافی ڕەوای خۆمان لەم شاخ و داخە خەریكی شەڕ و بەرپەچ دانەوەی هێرشی دوژمنین..ئێمە بێ یارمەتی شـــای ئێران تا دوا هەناسەی ژیانمان درێژە بە شەڕ دەدەین لەوانە عەلی عەســـكەری داوای دەكرد لەسەر بەرەنگاربوونەوە بەردەوام بن و سووربوو لەســـەر ئەوەی چەک دانەنێن، ((حسێن محەمەد عەزیز – خوولانەوە لە بازنەی بۆشدا – دەقی چاو پێكەوتنی لەگەڵ جەرجیس فەتحولا – چاپی یەكەم)

٢- هەروەها – ئەســـعەد خۆشـــەوی – كە فەرماندەیەكی لەشكری پێشـــمەرگە بوو،وەلامی بروســـكەی بارزانی دایەوە كە ئەگەر بڕیاری خۆ ڕاگرتـــن بدات ئەوان دەتوانن بۆ ماوەی دوو ســـاڵ شـــەڕ بكەن..چونكە بـــای دوو ســـاڵ چەک و خۆراكیـــان هەیە..بەلام بارزانی بروســـكەیەكی تـــری بۆ لێدان كـــە لەگەڵ كەس و كارەكانیان خۆیـــان بگەیەننە حاجی ئۆمەران (كریس كۆچیرا – مێژووی كورد لە ســـەدەی ١٩ و ٢٠ ل ٥٠٦)

٣- لـــە شـــەوی ١٨-١٩\٣\١٩٧٥ فەرماندە ســـەربازی یەكان لەگەڵ بارزانی كۆبوونەوە داوایان لە بارزانی كرد كە بمێنێتەوە و شەڕی پارتیزانی درێژە پێ بدەن و ئەو لە شـــوێنێكی ئاسایش دا دابنیشێ. بەلام بارزانی ڕازی نابێت و ڕەشـــبینی خۆی دەردەبڕێ لـــە بارودۆخەكەوە دەڵێ هیچ ڕێگـــە چارەیەک نی یە جگە لەوەی هەر كەســـێک دەیـــەوێ بگەڕێتەوە عێراق لێبوردن هەیە. ئەو كەســـەش كە ناگەڕێتـــەوە عێراق ئەوا با بێتە ئێران و دابنیشـــێت. (حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی – لە شـــنروێ وە بۆ ستۆكهۆڵم – چەند لاپەڕەیەک لەبیرەوەری یەكانم لە شۆڕشی ئەیلوول و شۆڕشی نوێ..)

٤- سەیدا سالح یوسفی ئەندامی مەكتەبی سیاسی بیروباوەڕی بەرانبەر بە شۆڕش بەم جۆرە بوو- من ڕام وابوو كە شۆڕش بەردەوام بێ و پێمان

دەکرێ شـــەڕ بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە نزیکترین دەرفەتدا، لە پێگەی بەهێزیەوە وتووێژی لەگەڵ حکوومەتدا بکەین و خەباتی دبلۆماسی زیاتر پەرە پێ بدەین لەگەڵی دا،بەڵام کەسێکیان گوێ یان لەو بۆچوون و پێشنیارەم نەگرت. (عبدالسلام علی- صفحات من نضال الشهید صالح یوسفی ص ٢٥..)

٥- هەروەها لە کۆبوونەوەی ٣/١٨ دا سەیدا سالح یوسفی ڕووی کردە بەشداربووانی وتی:- هەڤاڵان لە کاتێک دا پێویست نەبوو شەڕ بکەین شەڕمان کرد.. ئێســـتاش کە پێویستە شەڕ بکەین پێمان دەڵێن شەڕو بەرەنگاری کردن لە بەرژەوەندی ئێمە دا نی یە.(محەمەد ڕەنجاو- شـــەهید ســـەیدا ســـالح یوسفی — ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ٤٣١ لە ١٩٩٣/٦/٢٥)

٦- هەروەها ســـەبارەت بە درێژە بێدانی شـــۆڕش، ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێ:- کە بیستم شـــۆڕش خەریکە هەرەس دێنێ،گەڕامەوە چوومە لای بارزانی و پێم وت با لیژنەیەک دروســـت بکەین ئێمە خۆمان هیچ ناکەین، با کۆمەڵێکی تازە ئەو کارە لە ئەستۆی خۆیان بگرن.. ئەوانەی دەیانەوێ خەبات بکەن چەکەکانیان دەدەینێ، با خەباتی خۆیان بکەن. مەلا مستەفا نیشانیدا کە ناتوانین شەڕ بکەین و هیچمان پێ ناکرێ پێ ی وتم:- ئەگەر شـــەڕ بکەین تۆ دەتوانی لەو شەڕەدا چی بکەی..؟ وتم:- نازانم تەقەش بکەم!!! بەڵام لە لای تۆ دادەنیشم و مەخزەنت بۆ پڕ دەکەمەوە پێم وت:- دوژمن وا زوو ناگاتە لای تۆ.. مەگەر بەسەر لاشەی دە هەزار پێشمەرگە دا هەنگاو هەڵێنێ.وتی:- برایم تازە هەموو شتێک لەدەست چوو..کەسمان لەگەڵ نی یە و هیچ ئومێدم نەماوە (حوسێن محەمەد عەزیز— پێنج کاتژمێر لەگـــەڵ ئیبراهیم ئەحمەد دا — چاپی یەکەم — ســـتۆکهۆڵم ل ٧٥-٧٦)

لەو هەمـــوو بۆچوونانە دیارە خـــاوەن بڕیاری تاقانە لەناو شـــۆڕش تەنیـــا بارزانی بووە..من گەلێ جار دەڵێم شۆڕشـــەکانی کورد شۆڕشـــی سەرکردە بوونە.کە سەرکردە بڕیاری شۆڕشی داوە شۆڕش بەرپا بووە کە بڕیاری نەمانی شۆڕشـــی داوە شۆڕش نەماوە.. دیارە بارزانی نەیویستووە دوای خۆی وەک بەڵێنی بە شـــای ئێران دابوو کەســـی تر شـــۆڕش بکا

وسەرکردایەتی کورد تەنیا دەبێ بۆ ئەوان بێ و نابێ کەسی تر زاتی ئەوە بکا بڵێ من لە کوردســـتان شــۆڕش بەرپا دەکەم.. هۆکارەکانی نسکۆی شـــۆڕش گەلێ زۆرن کە زۆربەی سەرکردەکانی ئەیلوول دان بەوە دادەنێن کە چەند کەم و کوڕی هەبووە و شــۆڕش چۆن لە ڕێڕەوی ڕاســـتەقینەی خۆی لای داوەو لەوانە بەڕێز مەســعود بارزانـــی دەڵێ:- دەبێ دان بەوە دابنێین کە ڕێکەوتنەکەی جەزائر تاکە هۆ نەبوو بۆ نسکۆی ١٩٧٥ بەڵکو هۆکاری ناوخۆیی گرنگ هەبوون.وەک بەرەڵایی و ئاژاوە لەناو ڕیزەکانمان دا (التقرير السياسي و القرارات السياسية والبلاغ الختامي للمؤتمر التاسع ل٤)

من ئەوســـاکە وەک گەنجێکی کورد لێوان لێو لە سۆزی نەتەوایەتی لە لایەک و وەک کەسێکی پارتی و عاشقی بارزانی لە لایەکی تر لەناو خەم و بێ ئومێدی یەکی زۆردا گینگڵم دەدا. بێ گومانە نەک کوردی کوردستانی باشور بەڵکو هەموو کوردی کوردســـتانی گەورە ئەو کارەساتەیان بە گەورەترین کارەســـات لە قەڵەم داوە لە دیرۆکـــی خەباتی خوێناوی نەتەوەکەماندا.. بەڕاســـتی کارەساتێکی جەرگ بڕی کەمەر شکێن بوو..لە کۆڵانەکانی شار پەیتا پەیتا ئەو جل خاکی یە تۆزاویە چەک لێ داماڵدراوانەمان دەدی کە بە ڕەنگی هەڵپرووکاوەوە خۆیان دەگەیاندە ماڵەکانیان یا ماڵە خزمێکیان.. هـــەر جل و شـــڕو شـــیتاڵی ماڵە پێشـــمەرگە بوو بە لـــۆری و قەلاب و تەرەکتەر بۆ شـــار دەهاتنەوەو ڕوویان لە گەڕەکەکان دەکرد و بەناچاری لە حەوشـــەی ماڵە ناســـیاوێک بارگەی بێ چاریان دەخست. هەر هەواڵی جـــەرگ بڕ و ناخۆش بوو دەگەیشـــتە گوێچکەمان..هەر پێشـــمەرگەیەک ڕۆمانێکی مەرگەســـاتی لەناو خۆیدا تۆمار کردبوو. باس باسی ئەوە بوو فـــلان ســـەرکردە خۆی کوشـــتووە، فلانە ئامر هێز لە فلانـــە کات لەناو پێشمەرگەکانی دا لە باوکە ڕۆ و برا ڕۆی داوە. فلان ئامر بەتالیۆن هەوڵی داوە خۆی لە خەرەند بخاتە خوارەوە.. باســـی ئەو چەکانەیان دەکرد کە چۆن بۆ دۆڵ و شـــێوەکان تـــووڕ هەڵدەدران.کە تەنیا پێش چەند ڕۆژێک بەو چەکانە بەرگری یان لە خاک و وڵات و شـــەرەفی نەتەوەیەک دەکرد.

(س. د)ی خـــاوەن خانووەکـــەی ئێمـــەی تیا بـــوو کوڕێکی بەناوی (ئەکرەم) و زاوایەکیان بەناوی (موحســـین) جاش بوونەو لە شـــەڕێکی دەســـتەو یەخـــەدا لەلایەن هێـــزی پێشـــمەرگە دا بەدیـــل دەگیرێن و دەیانبەنە بەندیخانەی شـــۆڕش لە (ڕایـــات) بەندیخانەی ڕایات یەک لەو بەندیخانە ترســـناکانە بوو کە دوای نســـکۆی شۆڕش دەنگ و باسی ئەو بەندیخانەیە لەناو خەڵک بڵاوبووەوە.. دوای نســـکۆی شـــۆڕش دەنگ و باسی بەرەڵابوونی بەندی یەکانی بەندیخانەی ڕایات و خەلان بڵاو بووە وە کە هەموویان ئازاد کراون. ماڵی ســـمایل دەروێش چاوەڕێ ی کوڕەکەیان و زاواکەیانیان دەکرد. ڕۆژێک زاواکەیان بە لاشەیەکی شەتەک و ماندوو و لاواز و ڕەنگ زەرد و تۆزاوی گەیشتە ماڵی سمایل دەروێش لەو خانووەی منی لێ بوو.. کە هەواڵی (ئەکرەم) یان لێ پرســـی دەســـتی بە گریان کرد و ئیتر تێ گەیشـــتن کە ئەکرەم لە زیندان گیانی لەدەست داوە.. بۆ ئەو ماڵە بووە ڕۆژە ڕەشـــێکی تر و کوڕێکیان لەدەســـت دا.. من باســـی ئەو ئێوارەیە دەکەم کە دراوسێکان بۆ سەرەخۆشی هاتبوونە لای سمایل دەروێـــش و لە ژوورەکەی من دانیشـــتبوون..وابزانم ڕۆژی دووەم بوو کە (موحســـین) لە بەندیخانەی ڕایات گەیشتبووە جێ.لەسەر لاتەنیشت پاڵ کەوتبوو توانای دانیشتنی نەبوو، بەڵام توانای گێڕانەوەی مەرگەساتی ناو بەندیخانەی هەبوو..ئەو قســـانەی ئەو باسی دەکرد بۆ من وەک ئەفسانە بوو،چـــۆن ئـــەو ئازار و بـــێ حورمەتی یە بە مرۆڤ دەکـــرێ هەرچەندە دوژمنیـــش بێ..؟ چۆن ئەوانەی دەربازیان بووە توانای بەرگە گرتنی ئەو زیندانەیان هەبووە من ئەوساکە زیندانم نەدیبوو، بەڵام ئەو شێوە ژیانەی زیندانی ڕایات کە موحســـین باســـی دەکرد لـــە دەرەوەی توانای بەرگە گرتنی مرۆڤ بوو.من گەلێک باوەڕم پێ ی نەبوو چونکە خۆشەویســـتیم بـــۆ بارزانی و پارتی دەبوونە لەمپەر لەبەردەم پەســـند کردنی ئەو جۆرە نامرۆڤایەتی یە کە بەرانبەر مرۆڤ بکرێ خۆ ئەگەر نەیار و دوژمنیش بێ.

باسی مردنی ئەکرەمی دەکرد کە چۆن بە ئازاری گەدەی کە لەبرسان

ووشـــک بووبووەوە دەتلایەوە.. باسی دەکرد چۆن زیاتر لە یەک مانگ لە شـــوێنی خۆی هاواری دەکرد و کەس بە دەنگی یەوە نەدەهات تا بەدەم ئـــەو هاوارەوە گیانی ســـپارد و دوو کەس تەرمەکەیان بـــردە دەرەوە..

ئەوە یەک لە نموونەکانی ئەو کەســـانە بوون کە لەو ژوورە گیانیان لە دەســـت دا.. ئیتـــر ئەو ئێوارەیە لەو مەجلیســـە بووە هێرش کردن بۆ ســـەر سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی..شـــتی وایان باس دەکرد کە زۆر ڕقیان هەڵدەســـتاندم. بـــۆ من نەدەکرا بێمـــە وەڵام کە ئەو کات پیـــاوەکان بەتەمەن بـــوون ومن گەنج بووم، لـــە نەریتی ئێمە نابێ بە دەمـــی لەخۆت گەورەتر هەڵشـــاخێ ی..بەڵام لـــە کۆتایی ئەوەندە لێ یان پەســـت بووم خۆم پێ نەگیرا و پێم گوتن÷ (ئێوە بۆ تا ئێســـتا دەنگتان نەدەکرد بۆ چوار ســـاڵە لێرە دەسەڵات دار بوون لە خەڵکتان نەدەگەیانـــد) حاجی عەزیز خدر کە پیاوێکی بە تەمەنی دونیا دیدە بوو بە توندی لێم هاتە وەڵام و گوتی (کوڕم نەدەوێراین ئەگەر بمانتوانیایە قەت نەماندەهێشـــت ئەو هەموو خەڵکە بەدوایـــان بکەون..) وەک وتم بۆ من پەســـند کردنی ئـــەو جۆرە کەم و کوڕیانە ئاســـان نەبوو..پێم ســـەیر بوو ئەو جۆرە کەســـانە لەناو میللەتەکەمان هەبن بەو شـــێوە بڕواننـــە پارتـــی و بارزانی..بـــەڵام ڕۆژگارەکان هاتن و ڕۆیشـــتن و بە چاوی خۆم دیم زۆربەی ئەوانەی بە ســـەری بەتۆزو چاو بە فرمێســـک و جلـــی ڕەق بـــووی لە ئارەقە و بێ چەک گەڕانـــەوە ماڵەکانیان، ئەو جـــارە جلی ســـەوزی ڕژێمیان لەبـــەر کرد و پێش خەڵکـــی بێ لایەن بوونە (الجیش الشـــعبی) و بارەگەکانی بەعس بەوان ئاوەدان کرایەوە..

من ئەوســـاکە نەمدەزانی کوردایەتی و نیشـــتمان پەروەری شـــتێکەو سیاسەت و حزبایەتی شتێکی ترەو گەلێ جاریش دەبنە نەیاری یەکترو لە پەرژەوەندی یەکتر دەدەن. وەک لە شەڕەکانی ناوخۆ ئەوە سەلمێنرا کە حزبایەتی چۆن تیغێکی تیژەو جەســـتەی کوردایەتی پێ لەت کرا..

* گلپەی کوردایەتیم:-

نســـكۆی شـــۆڕش و گەڕانەوەی ئەو خەڵكە بۆ ناو باوەشـــی ڕژێم و ئـــاوارە بوونی دەیان هەزار کەس بـــۆ ئێران و دوایەش چوونیان بۆ وڵاتانی ئەورووپا. بۆشای یەكی سیاسی فراوان و نائومێدی یەكی تاڵی لەناو جەماوەری گەلی کوردســـتان دروست کرد. پارتی لەدوای ئازاری ســـاڵی ١٩٧٤و چوونە دەرەوەی جەماوەر بەلێشـــاو بۆ ناو شـــۆڕش، ڕێكخســـتنەكان لە شارەكان نەما و تا نســـكۆی شۆڕشیش ڕێكخستن دروست نەبووەوە،کە شۆڕش بایكۆتی کرد ئیتر بە تەواوی پارتی وەک حزب هیچ ڕێكخستنی نەما..حكوومەت و تەنانەت خەڵكێكی زۆری خۆمان قەناعەتی وابوو جارێكی تر کوردایەتی بەو زوانە ســـەرهەڵناداتەوە.. قسەی سەدام حوسێن جێگری ســـەرۆكی ئەنجومەنی شۆڕشی عێراق و جێگری ســـەرکۆمار هەر ئەوە بوو کـــە ئەگەر جارێكی تر دارخورما لەسەر شاخەكان بڕوێ شۆڕش لەوێ نابێتەوە..ئەو نائومێدی یەش وای کرد هەر دوای چەند مانگێک حزبی بەعس ئەو نائومێدی یە بقۆزتەوە زۆر لەو کەســـانە بكاتە بەعسی کە پێ یان دەگوتن (عائدون) لەوانە زۆریان لەوپەڕی دڵسۆزی یەوە کاریان بۆ بەعس کرد چ وەک حزبی چ لە ڕیزەكانی بەناو (الجیش الشـــعبی) دا.بەشێكیان تا ئەندامی (فرع) یان لـــێ دەرچوو.. ئەوانەی درەنگ گەڕانەوە خۆیان و خانەوادەكەیان کە بەشێک لە سەرکردەكانی تیا بوو بۆ خوارووی وڵات دوورخرانەوە.. سوپای عێراقیش بێ تەقە و شەڕ گەیشتە شوێنە ئیستراتیجی یەكانی شـــۆڕش، کە لەســـەرەتای هەڵگیرســـانی دا ئەو ناوچانـــە بە ئازادی مابوونەوە وەک ناوچەی باڵەک و پشـــدەر و پێنجوین و مێرگەســـۆرو ناوچەكانی ســـەر ســـنوور لە بادینان.. ئەو ڕۆژەی کە سوپای عێراق گەیشتە شـــارۆچكەی (گەلاڵە) من گوێم لە ڕادیۆی لەندەن بوو وتی: (دخل اليـــوم الجيش العراقي قصبة گەلاڵە المعقل الرئيســـي لمصطفى البارزاني) واتە (ئەمڕۆكە سوپای عێراق چووە ناو شارۆچكەی گەلاڵەی

بارەگای ســـەرەکی مستەفا بارزانی..). گەیشـــتنی سوپای عێراق بۆ گەلاڵە واتە کۆتایی هاتنی شۆڕش.

من لەو سەردەمە لە گێژاوەیەکی فیکری و دەروونی دەخولامەوە لە لایەک قەناعەتم وەک بەشێکی زۆری خەڵک وابوو کە بەو زووانە کورد جارێکـــی تر ناتوانێ هیچ بکا و بـــاوەڕی خەڵکیش بە کوردایەتی زۆر لەق بوو.بەڕاستی هەرەســـی ئەو شۆڕشە گەورەیە باوەڕی کوردایەتی ئەوەندە شـــڵەژاند کە تا دوای ســـاڵێکیش ئەگەر باســـی حزبایەتی و کوردایەتیـــت بکردبایە کەس گوێی لێ نەدەگرتـــی. لە لایەکی تریش کە ئاوڕم لە مێژووی کورد دەدایەوە کە چەندین شکســـتی لەو جۆرەی بینیوە و دوایە جارێکی تر تێ هەڵچۆتەوە. بەڵام شکســـتی ئەوجارەم بە چـــاوی خۆم بینی و بە گەورەترین شـــۆڕش دادەنـــرا لە مێژووی گەلی کورد. ئەوەندەی هەوڵم لەگەڵ هەســـتەکانی خۆم دەدا کە کپی بکەمەوە،تەوژمی هەســـتی نەتەوایەتیم ئەوەندە تاوم بۆ نەهێنێ.بەڵام هەســـتەکە بەســـەرمدا زاڵ بوو.. من تا ئەوکاتیش خۆشەویستیم بۆ پارتـــی و بارزانی هەر مابوو،ئەگەرچی کۆمەڵێک گومان و دوو دڵیم لا دروســـت بووبوو بەتایبەتی دوای ئەوەی چەندین شتی سەیر سەیریان بـــۆ باس کردین کە لەناو شـــۆڕش ئەنجام درابـــوو.. ئەوانە هەمووی چەندین پرســـیاریان لە ناخم دا دروســـت کرد..قەناعەتێکم لا دروست بوو کە لەوانەیە دوای ئەو بۆشـــاییە یە سیاســـی یەی لە کوردســـتان دروســـت بوو،چەندین گروپ هەوڵ بدەن ڕێکخراو و حزب و کۆمەڵەی نهێنی دروست بکەن.بەبێ ئەوەی ئاگام لەوە بێ کە کۆمەڵەی مارکسی لینینـــی هەیەو بێ ئەوەی ئاگام لێ بێ کە بزووتنەوەی سۆسیالســـتی کورد لە ئێران و دوایەش لە خوارووی وڵات خەریکی چەکەرە دانیەتی..

مـــن کە لە ژوورە تاقانەکەی خۆم بەر لەوەی دەنگ و باســـی هیچ ڕێکخراوێـــک بڵاو بێتەوە شـــەوانە وڕێنە و ئارەزووی دروســـت کردنی ڕێکخراوێکم بەناو ئەندێشـــەکانمدا گوزەریـــان دەکرد و بۆ بەیانی وون

دەبوون و شەوانە دەبوونەوە میوانم.ڕۆژێکیان (محەمەد عەباس) یادی بەخێر بەو دوایی یە بە شاخەوان ناسرا میوانی ماڵی حاجی ئامینە بوو چونکە خزمایەتی یان هەبوو،لەبەر ئەوەی برادەراتیمان هەبوو سەرێکی بە لای منیش داگرت و بەیەکەوە دانیشتین و هەندێک باسی سیاسەتمان کرد.من ئەوەم نیشاندا کە دەبێ ئاگامان لەخۆمان بێ خەڵک زۆر بۆتە جاسووس و هیچ هیوایەک نەماوە پێویست ناکا خۆمان تووشی نارەحەتی و چەرمەسەری بکەین،ئەو لە من حاڵی نەبوو هەر ئەوەندەی پێ دەگوتم تۆ نابێ بترسێ ی.. دەبێ هەر لە هەوڵدان بەردەوام بین. بەڵام من پێم وت ئاخر هەوڵدانی چی..؟ ئەوە شـــۆڕش نەما و تەواو.هەر ئەوەندەی تێ گەیاندم کە مەرج نی یە هەر پارتی شۆڕشگێڕ بن.. ئیتر لەوە زیاتر قسەیەکی نەکرد. دوای چەندین ساڵ لە هاوینی ساڵی ١٩٨٤ لە مێرگەپانی بناری پیرە مەگروون چاوم بە شاخەوان کەوتەوە،ئەوساکە بۆی درکاندم کە ڕۆژەکەی هاتبووە لای من بە نیاز بوو مەسەلەی (کۆمەڵەی مارکسی لینینـــی)م بۆ باس بکا. بەڵام لەخۆی ڕانەدیـــوە و نەوێراوە.دوایە کە جارێکی تر ویستوویەتی بێتەوە لام و بۆم باس بکا دەرفەتی نەبووەو لـــە لایەن ڕژێم دەســـتگیر کراوە.دوای بەربوونیش بۆتە پێشـــمەرگە.

ئەوســـاکە ئـــەو هەڤاڵـــە تێکۆشـــەرە فەرمانـــدەی تیـــپ بوو.

لە کۆتایی خەیاڵی شـــەوانم گەیشـــتمە ئەو بڕیـــارە کە پەیڕەو و پرۆگرامی حزبێک دابڕێژم و لە ســـەرەتاوە خۆشەویسترین و نزیکترین برادەرم لێ ئاگادار بکەمەوە و دەستەیەکی بەناوی سەرکردایەتی دروست بکەین.. ئەوە دەقی بۆچوون و بیرکردنەوەی من بوو کە باســـم کرد.

لەبـــەر ئەوەی لە ڕووی فکـــری و ئەزموونی یەوە ئەوەندە بە توانا نەبـــووم، دەرەوەی وڵاتم نەدیبوو،لە ناو پارتیش نەهیچ فێربووم و نە ڕۆڵی بەرپرســـیاریەتیم دیبوو خۆم بە هیچ ڕێســـا و نەزەریەک گۆش نەکردبوو.بۆیە شـــتێکی ســـاکارم وەک بەرنامـــە و پەیڕەوی ناوخۆی حزبێک نووســـی یەوە کە ســـوودم لەوەندە شارەزایی یەم بینی کە لە

پەیڕەو و پرۆگرامی پارتیم هەبوو. نووسینەکەم کەم و کوڕی زۆری تیا بوو.بەڵام ئەوەندە پەیڕەو و پرۆگرامی پارتیم خوێندبووە وە بەتایبەتی ئەو کاتانەی هەڵســـووڕێنەری کارەکانی کاک (شـــابانە دۆم) بووم لە ســـەیداوە بۆیە بە ئاسانی توانیم پەیڕەو و پرۆگرامێک دابنێم و چەند ئامانجێکی دوور و نزیک بخەمە ناو بەرنامەکە.. لەبیرمە بەشێکیان تا ســـەر ئێسقان شۆڤینی یەتی پێوە دیار بوو،بەو حسابەی ئەوە پەیڕەو و پرۆگرامـــی حزبێکە و ناوم لە حزبەکە نـــا (پارتی برایەتی کوردی) بۆیە ئەو نـــاوەم هەڵبژارد چونکە کۆمەڵیک بۆچـــوون و ناحەزایەتی لەناو حزب و چەکداری کوردی هەبوو بەتایبەتی پاشـــماوەی مەلایی و جەلالی کە دوای هەرەســـی شۆڕش لە قسەی خەڵکەکە دەتزانی ئەوە پێشـــتر هەواداری مەلایی بووە یان جەلالی. جگە لە حزبی شیوعی کە لەپـــاڵ حکومەتی عێراق بوون.پێم وابـــوو پارتی برایەتی کوردی واتە جارێکی تر کارکردن بۆ دروســـتکردنەوەی برایەتی لە نێوان بۆچوونە جیاجیاکان. جا لە بیرم نەماوە چ مەبەســـتێکی ترم هەبوو لەو ناوە. بـــەڵام تا دوای چەند هەفتەیەک لـــە پەیڕەو و پرۆگرامەکە تەنیا خۆم و خەیاڵم بەو شـــتەیان دەزانی.. ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە دەبێ ئەو مەســـەلەیە بچرپێتە گوێ ی یەکەم کەس.یەکەم کەس کە موفاتەحەم کـــرد کوڕێک بوو نـــاوی (ئەنوەر عەبدوڵا عەلی چاو ســـۆر) بوو.ئەو هەڤاڵە کوڕێکی دڵســـۆز بوو لەو ماوەی ســـاڵی ١٩٨٤ کە لە کووران ســـەرتاش بووم بووە هاوڕێم و بە دەســـت نیشان کردنی کەسێک کە ئەویش خەڵکی کووران بوو خرایە بەندیخانەی ئەمن و ئازارێکی زۆریان دا،دوایـــە بە پارە ئازادیان کـــرد. زۆر باوەڕی بە مـــن هەبوو،هەموو قســـەیەکی لەگەڵ دەکردم.ئەو برادەرەم کە مەسەلەکەم بۆ باس کرد خۆشـــحاڵی خۆی دەربڕی و بووە کەســـی دووەمی ناو حزبەکەم بەڵام نازانم چەند مانگێک دوای نســـکۆی شۆڕش بوو... (ئەنوەر عەبدوڵا) زۆر حەزی لە قســـە کردن بوو،قســـەی زۆری لەســـەر یەک دەکرد و

شـــارەزایی لە قســـەکردن هەبوو،پێچەوانەی من بوو کە زۆر کەم دوو بووم .بـــەڵام هیچ بڕوانامەیەکی خوێندنـــی ئەوتۆی نەبوو. ئەنوەر بۆی گێڕامەوە گوتی:- (ڕۆژێک پرســـەی ناسیاوێکمان دەبێ هەر لە تازیە ژنێـــک هات و دوو منداڵی پێ بوو پێی وتین کە عەبدوڵا پیاوی ئەوەو ئەو دوو منداڵەش هەردووک منالّی عەبدوڵایە ..ئێمە هەموو ســـەرمان ســـوڕما چونکە نەمانزانیبوو باوکم ژنێکی تری جگە لە دایکم هێنابێ.. بەڵام جاروبار دەیگوت من کارم لە شـــاری موســـڵە بۆیە هەندێ شەو ناتوانـــم بگەڕێمـــەوە. دیارە لەو ماوەیە ژنێکی لەنـــاو گەڕەکی قەڵای هەولێر مـــارە کردووە وماڵی بۆ داناوە یان چۆتەوە ســـەر ماڵەکەی ئەو،دوو منالّی لەو ژنە هەبووە و ئێمە و دایکم لێ ی بێ ئاگا بووین.).!

دوای ئەو برادەرە ئـــاگاداری کاک (جەمال مەولود) م کردەوە کە شـــتێکی وام کردووە و دەبێ ئەویش یەک لە سەرکردەکان بێ ئەویش ڕەزامەندی خۆی نیشاندا بەڵام زۆر جار بەرانبەر یەک بەڕووی یەک دا پێ دەکەنین وەک ئەوەی گاڵتەمان بە شتەکە بێ .ئاخر ئێمە و دامەزراندنی حزب کوجا مەرحەبا .ئاخر ئێمە چین تا بتوانین حزب دروست بکەین.

دوای ماوەیـــەک پێ ی وتم برادەرێکی پارێزەری بەناوی (عادل) لە ســـلێمانی هەیە ســـەفەرێک بۆ ئەوێ دەکا بەڵکو لقێک لەوێ دروست بکەن. ئەو دوو برادەرە هەردووکیان پەیڕەو و پڕۆگرامەکەیان خوێندەوە و پەســـندیان کرد..کەسێکی تر بەناوی (خەســـرۆ) هەبوو لە هەمان خانـــوو کرێچی بـــوو کە منی تیا بوو،خاوەن خێـــزان بوو،ئەویش زۆر حـــەزی لە کوردایەتـــی بوو،ژنێک و منالێک و دایکـــی لەگەڵدابوو لە تیرەی ســـارمەمی بوو خەڵکی گوندی ســـێقوچانی ناحیەی قوشتەپە بوو. لام وایە ئەویشـــم هێنایە ڕیزی حزبەکەم بەڵام بە تەواوی لەبیرم نەماوە..خەســـرۆ خوێندەواری کەم بوو بۆیە وەک ئێمەی پێ نەدەکرا.

جا نازانم ئەوانی تر چەند کەسیان ڕێک خستبوو .لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو نازانم چۆن بوو بیرمان ئەوەندە لە گرتن و پەتی سێدارە نەدەکردەوە.

ڕۆژێکیـــان من وکاک جەمال، کاک (مســـتەفا عەبـــاس) مان لەو کارەمـــان ئاگادار کردەوە و داوامان لێ ی کرد ئەویش بێتە ڕیزی ئەو حزبە .بەڵام پێ ی وتین ئەو حەز لە سیاســـەت ناکا بەڵام ئەگەر لەبەر خاتری ئێمەش بێتە ڕیزی ئەو حزبە دەبێ ئێمە لە ڕێگای حکوومەت و حزبی بەعس ئەو ڕێکخراوە دروست بکەین ئەگەر نا هەمووومان لە کاتی ئاشکرابوونماندا لە ســـێدارە دەدرێین..ئەوەش دەقاو دەق پێچەوانەی ویستەکانی ئێمە بوو کە نەدەکرا بە ڕژێم بگوترێ مۆڵەتمان پێ بدا لە کاتێـــک دا ئێمە بەرنامەمان دژی ئەو ڕژێمەیە .بۆیە وەڵام دانەوەی ئەو برادەرەمان کە زۆر هیوامان لەسەر بونیات نابوو بووە یەکەم شکستمان، چونکە مستەفا عەباس لە ڕووی فکری یەوە ئەوساکە لە ئێمە بەتواناتر بوو.کاک مســـتەفا دوایە بووە فەرمانبەر و ئەزموونی دەرەکی دایەوە و شەشـــی ئامادەیی تەواو کرد و ڕاژەکەی گواســـتەوە بەغدا و لەوێ چووە کۆلیژی یاســـاو ئێستا یەک لە دادوەرە دیارەکانی هەولێرەو هەر برادەرمانە ..لـــە بیرم نەماوە ژمارەمان بووە چەند. ئایا هەر لەو ســـێ چوار کەسە گیرمان خوارد یان زیاتر بووین..ئەوەندە دەزانم نەمانتوانی گەشـــە بە کارەکانمـــان بدەین و لە شـــوێنی خۆمـــان پووکاینەوە..

## * دامەزراندنم لە کاری حکوومی:-

من ئەو ساڵە دەرچووی سێ ی ناوەندی بووم. ڕژێم دەروازەی کارکردنی خستبووە سەر پشت و بواری کار زۆر بوو. دوای ئەوەی کارەکەم لە مەیدانی ئاژەڵان نەما، ئێستا لە یادم نەماوە بۆ دامەزراندنی کاری حکوومی بوو یان بۆ کارێکی تر بوو کارەکەم لەوێ کۆتایی هات؛ چونکە دووکانێکی بچووکم لەسەر ڕێگای مەخموور دانابوو ئوتوم تیا دەکرد. دەبوا بیر لەوە بکەمەوە کارێکی فەرمی بدۆزمەوە. برادەرێک پێ ی وتم کە بچمە لای (مام صالح خۆشناو) لە دیوانی پارێزگای هەولێر کە پیاوێکی زۆر چاکە ئەگەر دامەزراندن هەبێ ئەو ڕێنماییم دەکا. پێشتر هەوڵێکی ترم دابوو تا لە خولی برین پێچی دابمەزرێم بەڵام وەرنەگیرام، هەوڵێکی ترم دابوو کە لە (ئۆرزدیباک) کە بازاڕێکی گەورەی حکوومی بوو دابمەزرێم. بۆ ئەو مەبەستە لە ١٩٧٥/٢/١٥ چووبوومە بەغدا بۆ تاقی کردنەوە. من و کوڕێکی مەسیحی خەڵکی شەقڵاوە بووین بەڵام حەوت مانگی بەسەر دا ڕۆیشتبوو وەڵامی نەهاتبووە وە، کاتێ وەڵامی دامەزراندنم گەڕایەوە مانگی دوانزەی ساڵی ١٩٧٥ بوو کە من سێ مانگ بوو لە دیوانی پارێزگا دەست بەکار بووم. بڕیاری دامەزراندنی من گەڕابووە وە لە (ئۆرزدیباک) بەڵام بڕیاری برادەرە مەسیحی یەکە نەگەڕابووەوە.. جا منیش بە قسەی ئەو برادەرە ڕۆژێک چوومە دیوانی پارێزگاو سەردانی (مام صالح خۆشناو)م کرد ئەو ڕێنمایی کردم کە سەردانی (ئیسماعیل گەردی) بکەم لە خۆیەتی چونکە ئەو دەزانی ئەگەر شاغر هەبێ بۆ دامەزراندن. کە سەردانی ئەو برادەرەم کرد، پێچەوانەی یەکەم بوو.. یەکەمیان زۆر بە ڕوو خۆشی پێشوازی لێ کردم و قسەی زۆر خۆش بوو، بەڵام دووەمیان زۆر بە وشکی وەڵامی دامەوە. یادیان بەخێر دوایە بەیەکەوە بووین و شارەزایان بووم کە دووەمیان لە خراپی نەبووە وا وشک وەڵامی داومەتەوە بەڵکو سروشتی خۆی وا بووە.. پێ ی وتم (موەزیم) ی دەکەی..؟ واتە ئەوانەی بەرید بۆ فەرمانگەکان

دابەش دەکەن ،پێـم وت ئەگەر وەزیفەیە دەیکەم .چونکە ئەو سـەردەم (موەزەف) و (موسـتەخدەم) لـە فەرمانگەکان هەبـوو. موەزەف بە بڕوانامەو سیسـتەمی خۆی هەبوو موستەخدەم کە بەو دوایی یە گۆڕا بۆ ناونیشانی کرێکار بەبێ بڕوانامە بوو ئەویش سیستەمی خۆی هەبوو.ئەو بـڕادەرەی خۆیەتی تێ ی گەیاندم کـە وەزیفەیە .بۆیە من ڕازی بووم و دەسـتم بە مامەڵەی دامەزراندن کرد.. ئەو سـاکە دەبوا ئەو مامەڵەیە بچێتە وەزارەتی ناوخۆ لە بەغدا و لەوێ فەرمانی پێ دەرچێ. لەبیرمە ئەو ڕۆژەی مامەڵەکەم تەواو کرد و نووسـراویان بۆ وەزارەتی ناوخۆ لەبەغدا بۆ کردم، پێ یان وتم دوای بیسـت ڕۆژ یان مانگێک وەڵامەکەی دێتەوە کە دەیکردە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٨/٣٠ .هەرچەندە دەمزانی دوا دەکەوت بەڵام دڵم ئاسوودە بوو. هەر ئەو ڕۆژە هاتمە گوندی (ترپەسپیان) کە مێردی پوورم بەناوی (حاجی مەجید) مردبوو.لەوانەیە لە کێلەکەی سەر گۆڕی ئەو ڕۆژە نووسرابێ. چەند ڕۆژێک لەوێ مامەوە .دڵم خۆش بوو کە کاتەکان تێدەپەڕین بۆ ڕۆژێکی خۆش کە هەواڵی گەڕانەوەی فەرمانی دامەزراندنم پێ دەدەن. لەو ماوەیە لـە دووکانە بچووکەکەم لە کووران کە دووکانی (سـەید کاکۆ) بوو لێم گرتبوو سەبر سەبرە دەخوولامەوە و دوای پانزە ڕۆژ هەرچەندە ڕۆژێ جارێک سەرم لە پارێزگا دەدا.. ڕۆژی ١٩٧٥/١٠/٢ چوومە لای (ئیسماعیل گەردی) دیسان پێ ی وتم نەهاتووە بەڵام سەرێک لە (وارده) بدە.. چوومە ژوورەی قەڵەم و پرسیاری (وارده) م کرد.لەسەر مێزەکـەی وارده پیاوێکی بەتەمەنی هەولێـری هەندێک لە کاغەزەکانی دابەش دەکرد، دیاربوو بۆ ژوورەکان بوو.لە پاش دامەزراندنم زانیم ناوی (عادل)ە پیاوێکی ڕوح سـووکی دەروون پاک بـوو، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی دوایە ئەوەندە منی خۆشویسـت دوای خانەنشینی کە منی دەدی بەتایبەتـی بەو دوایی یە کە بە شەلەشـەل بـە زەحمەت ڕێ ی دەکرد هاواری دەکرد (کوڕە سـەعە وەرە) ئیتر دەستی لە ملم دەکرد و چەند ماچێکی لێ دەکردم.هەندێ جاریش وەک بەزەیی بەحاڵی خۆی دا بێتەوە

چەند دڵۆپ ڕۆندکی دەباراندە سەر ڕوومەتە بە لۆچەکەی.وەک ئەوەی پێم بڵێ (دەبزانە زەمانە و تەمەن چۆن بێ ویژدانانە منیان خستە نێوان دوو بەرداش و هاڕیمیان) ئەو ڕۆژە پرسیارم لە ناوبراو کرد ئاخۆ چ فەرمانی دامەزراندن لە بەغدا نەگەڕاوەتەوە..؟ یەکسـەر گوتی:- (سـەعدی..؟ ئـاوت سـەعدیە..؟ جانم ئەوە دوو رۆژە هاتیە.. یـەوەدان لەکێ ی..؟

ئیتر ئەو ڕۆژە بووە یەکێک لە ڕۆژە خۆشەکانی ژیانم دوای ئەوەی بە مووچەی (١٥) پانزە دیناری فەرمی و (غلاء المعیشـة)ی ٢/ بیسـت و یەک دینار دامەزرام و تەپڵی شـام لێ دا و ژیانم بەرەو جێگیری چوو..



هۆبـەی نهێنی پارێزگای هەولێر لە ڕاسـتەوە: ئاغۆک نادر، خوا لێ خۆش بوو هادی صالح، نوسـەر، ئەنوەر تۆمەڕاوەیی، ڕەشاد محمود ١٩٧٩/٥/٢٣

پارێزگا ئەوســـاکە لە شـــوێنی قائمقامیەتی قەزای ناوەندی هەولێری ئێســـتا بوو واتە سەرای کۆن یان (قشـــلەی گەورە) کە ئێستاش ماوە. پشتی ئەو پارێزگایە بەندیخانەی ســـەرەکی هەولێر بوو،بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی هەولێریش لە هەمان بینایە بوو.دیوانی پارێزگا یەک بەڕێوەبەری هەبوو ناوی (شێخ سلێمان) بوو بەناوی (مدیر تحریر) واتە بەڕێوەبەری نووســـین.پارێزگار ناوی (محمد علی امین) خەڵکی شاری سلێمانی بوو، پیاوێکی هێمن بوو.بەڵام کە من دامەزرام زۆر لەوێ نەمایەوەو گوازرایەوە. فەرمانبەرە کۆنەکان کە زۆربەیان نەماون،ســـالح خۆشناو کەپێشتر ناوم هێناوە یادی بەخێر لە هۆبەی کۆمەڵەکان بوو،ئیســـماعیل گەردی یادی بەخێر لە خۆیەتی بوو،مام قاســـم سەعید یادی بەخێر لە قەڵەم بوو مام جەرجیـــس لە ئەوراق بوو ئەمەیان تا ئێســـتا واتە کاتی ئەو نووســـینە ٢٠١٠/١٠/١٥ لە ژیان ماوە فەوزی شەوقی یادی بەخێر لێپرسراوی صادرە بوو، جەمال ســـوڵتان یادی بەخێر لە ئەنجوومەنی کارگێڕی بوو، ئەوانە فەرمانبـــەرە بە تەمەنەکانی پارێزگا بوون کـــە من دامەزرام.. هەموویان دەرچووی ســـەرەتایی و ناوەندی بوون جگە لە ئیسماعیل گەردی نەبێ دەرچووی ئامادەیی بوو..جگـــە لەوانە هەندێک فەرمانبەری تر لە قەزاو ناحیەکان بۆ دیوانی پارێزگا گوازرانەوە کە ئەوانیش پێش من دامەزرابوون کە ئێستا هیچیان لە وەزیفە نەماون و خانەنشین کراون. وەک مام سەعدی لە ئەنجوومەنی کشـــتوکاڵی کە ڕووپێو بوو،کاک شێرکۆ جاف لە هۆبەی سنوور بوو. کاک حەسەن ناوێک لە بەشی ئەوراق کاری دەکرد لە یەک لە قەزایەکان هاتبووە دیوانی پارێزگا .مام هادی لە هۆبەی نهێنی کاری دەکرد.

(مام قاســـم) پیاوێکی قاڵ بووی ناو خەباتی حزبی شـــیوعی عێراق بوو بە تەمەن داچووبوو نەخۆشـــی دڵی هەبوو زوو زوو هەڕەشـــەی لێ دەکردو ناچار ڕای دەکردە نەخۆشـــخانەی فریاکەوتن،کەمێک شارەزایی لە مارکسیەت و لە ئابووری بە شێوەیەکی گشتی هەبوو، بەڵام لە کاری نووسین و فەرمانگە زۆر بە توانا نەبوو،کاتێک نوکتەیەکی دەگێڕایەوە یان

باسی بەسەرهاتێکی دەکرد زۆر بە تام و چێژ دەیگێڕایەوە .من زۆر حەزم لە قسـەکانی ئەو پیاوە بوو، زۆر هاوکاری کردم بۆ فێر بوونی پیشـەو کارەکانی فەرمانبەری. فەوزی شـەوقی پیاوێکی توند خوو بوو بەردەوام کێشەی لەگەڵ عادل خورشید هەبوو لە پێشەوە باسم کردووە بەڵام مام عادل بە هیچ شـێوەیەک وەڵامی نەدەدایەوە،من یەک ساڵ یان زیاتر لە هۆبەی (ئەوراق) لەگەڵ ئەو بە تەمەنانە مامەوە، زۆربەی ڕۆژەکان بەریدم بـۆ فەرمانگەکان دەبرد، ئەگەر کاری بەرید نەبووا ئەوا لە دەرکردە کارم دەکرد. ڕۆژێک بڕیارێک دەرچوو وابزانم ساڵێک زیاتر بوو کە دامەزرابووم، بە پێی ئەو بڕیارە گوازرامەوە (هۆبەی نهێنی). دیارە ئەو بەشە پێویستی بە فەرمانبەر هەبووە،ئەوانیش منیان پێ باش بووە گوایە لە (العائدون) نیم.. چونکە ئەوانەی دوای هەرەسی شۆڕش گەڕانەوە ناو ماڵ و منداڵیان لـە لایەن ڕژێم بە (العائدون) ناویان دەبـردن و واتە گەڕاوەکان..دیارە ئەوەی لە (العائدون) نەبێ دەکرێ لە شـوێنی وەک (هۆبەی نهێنی) کار بـکا. کە چوومە ئەوێ پیاوێکی لێ بوو ناوی (عەبدولهادی سـالح) بوو لەسـەرەوە ناوم هێناوە یادی بەخێر شارستان بوو پیاوێکی دڵ ساف و بێ وەی بوو، یەکێکی تری لێ بوو ناوی (ڕەشاد مەحمود) بوو لە تیرەی خۆشناو بوو بەڵام لە بەغدا لەدایک ببووبوو هەر لە بەغداش گەورە ببووبوو، تـازە فێرە زمانی کوردی ببووبوو،هەردووکیان وەک من بێ لایەن بوون.. زۆرم پێ سـەیر بوو خەڵکی بێ لایەن لەو شـوێنە بێ. کاک ڕەشاد لە برایانی موسڵمان نزیک بوو، بەردەوام گرنگی قورئان و نهێنی یەکانی ناو ئایەتەکانی بۆ باس دەکردم. ئەو پیاوە کە ئێستاش برادەرمە ئەندامێکی یەکگرتووی ئیسلامی یە لە هەولێر، زۆر ڕقی لە حزبی بەعس دەبووەوە.

مـن لەو بەشـە چیتـر کاری بەریدم نەکـرد بەڵکو لە سـەرەتاوە کاری دەرکـردەو وەرگرتـەم دەکـرد دوا یـەش فێـرە نووسـینی نووسـراوەکان بووم. نووسـین بە زمانی عەرەبی بوو منیش لە عەرەبی زۆر بـاش بووم.پیاوێـک بەریـدی ئەو هۆبـەی بە پایسـکل دابەش

دەکــرد ناوی (ئەنــوەر) بــوو خەڵکی گونــدی ئۆمەراوەی ســەر بە ناحیەی قوشــتەپە بوو، جارێک هەرســێکمانی لــە گوندەکەیان داوەت کــرد کە ماڵــی دایکی لەوێ بــوو، بەڵام ماڵی خۆی لە ئیســکان بوو.

مــام هــادی ســاڵح بــرادەری هونەرمەند تایــەر تۆفیق بــوو زۆر جــار تایەر تۆفیق دەهاتە لامــان و لەگەڵ مام هادی شــەڕە جوێنیان دەکرد،بــەڵام هەمووجاران تایەر تۆفیــق گێچەڵی بە مام هادی دەکرد..

ســەردەمێکی زێڕینم لەگەڵ ئەو دوو برادەرە لەو هۆبەیە بەسەر برد چاکەی هەردووکیانم لەبەر چاوە.مام هادی لە کاتێک کە من کرێچی بووم هەولێکــی زۆری لای پارێزگا دا تا شــوقەیەکم بۆ دەرچوو و لە کرێچی یاتی دەربازم بوو..کاتێ بینای تازەی پارێزگا دروست کرا و گواستمانەوە ئەوێ.فەرمانبەرێکــی ترمــان بۆ هات ناوی (ئەحلام ســاڵح) بوو وەک نووســەری چاپ دەوامی دەکرد و دوای لاچوونی من لەو بەشە ئەو هەر لەوێ مایەوە کە یادگاری یەکی ڕۆژی گیرانەکەم هەیە دوایی باسی دەکەم. بینایە نوێ یەکە هەر ئەو بینایەی پارێزگای ئێستایە..

## * هاوسەرگیری

لەو کاتەی ئەو بابەتە دەنووسم یادی سیوچوار ساڵەی هاوسەرگیریمە کە دەکاتە (١٩٧٦/١٠/٨) و ئەمڕۆش (٢٠١٠/١٠/٨) یە. منداڵەکانم هەموویان گەورە بوونە وهەندێکیان ماڵی خۆیان هەیەولە ئێمە جیان. ئەوانیش بریتین لە:- (گوڵالە-١٩٧٧ -مامۆستا) - (سکاڵا - ١٩٧٨- مامۆستا)— (هاژە - ١٩٨٠- ئەندازیــار) — (هێــرۆ- ١٩٨٤- توێــژەری کۆمەڵایەتی) — (هێشــوو-١٩٨٥- ئەندازیار) — (پۆڵا-١٩٨٦- ئەندازیار) — (سۆلین - ١٩٨٩- خوێندکاری کۆلێژ) — (ســۆلاڤ- ١٩٩١-خوێنکاری کۆلێژ) — (قەڵا-١٩٩٧-خوێنکاری بنەڕەتی).


نوسەر و هاوسەرەکەی

کە چاو دەخەمە سەر یەک وا هەست دەکەم چەند ڕۆژێک لەمەوبەرەو نازانــم چۆن ئــەو هەموو ماوەیە کە تەڕی یە لە ڕووداوی دیار و زەق کە کاریگەریان لەسەر ڕێڕەوی ژیانم جێ هێ هێشتووە وا بە چاو چووقانێک تێپــەڕی.. ئەو تاڵە مووە ڕەشــانە چۆن وا بەرگی بەفریان پۆشــی... ئــەو چاوانەم چــۆن کز بوون و ئەژنۆم وا شــل بوو... چــۆن نازناوم لەلایەن (ســەدری) هاوســەرم لە (کوڕیژگە) گۆڕا بۆ ((پیرەمێرد))!!!

من دوای ئەوەی لە ژیانمــدا جێگیر بووم بەتایبەتی دوای ئەوەی بە شێوەیەکی فەرمی بوومە فەرمانبەر، دەبوا بیر لە هاوسەرگیری و پێکەوە نانی خێزان بکەمەوە بەتایبەتی کە فەرمانبەرم پێویستم بە زیاتر خاوێنی و ڕێــک و پێکی هەیە.لە ڕاســتیدا مــن ئەوەندە حەزم لە هاوســەرگیری نەدەکرد،هەچەنــدە تەنیایی تەنگی پــێ هەڵچنی بووم، بە تایبەتی جل شــۆردن و نان ئامادە کــردن بووبووە بارێکی گــران، زۆر جار وا ڕێک دەکەوت لەگەڵ برادەرێک یان زیاتر تا تاریک دادەهات پیاسەمان دەکرد کە دەگەڕامەوە نانەواخانەکان نەدەمان، ئێ خۆ مشــکیش لە ماڵەکەمدا کلکی بە ئارد نەدەبوو.. بۆیە گەلێ جار بە زگی برسی دەمامەوە. بەیانیش

ئەمدەزانی نە نان ئامادە بکەم نە خۆم ســازدەم بۆ دەوام .نیوەڕۆش کە دەگەڕامەوە بە هەمان شێوە دەهاتمەوە سەرساجی عەلی .ماڵی خوشکەکەم بۆ دەشت گەڕابوونەوە .جگە لە ژوورەکەی من ژوورەکەی تر بۆ کرێ بوو هەرچەنــد مانگێک ماڵێک دەهاتنە ناوێ..جگە لــە هۆی تەنیایی چەند هۆیەکی ســـەرەکی هەبوو کە ناچار کرام بیر لە هاوسەرگیری بکەمەوە .

١- داب و نەریــت لای ئێمـــە بـــە تایبەتـــی لە هەولێــر و گەڕەکە میللی یـــەکان وا باوە کـــە (زوگرتی) یان (ڕەبەنی پیـــاو) لەناو ماڵی خێزانـــدار جێگای نابێتەوە . من دڵنیا بووم ئەگەر لەو خانووە بگوازمەوە کـــە بووبوونە خـــزم و ناســـیاو، لە شـــوێنێکی تر جێـــگام نابێتەوە .

٢- من خوشکێکی لەخۆم گەورەترم هەبوو. دەبوا ژن بە ژنی پێ بکەم ئەوســـاکە هێشـــتا باوی ژن بە ژنی مابوو.. بۆیە ئەو خوشکەم چاوەڕێ ی منـــی دەکرد .ئەگەر ژن بە ژنیم نەکردبایە وەک ئەوە بوو غەدرم لێ ی کردبێ.. بۆیە بەشـــێک لە هۆکارەکان ئەگەر هۆیەکی سەرەکی نەبێ ئەو هۆیە بوو.. چونکە من ڕام وابوو هاوسەرگیری دەبێ بە لەیەک گەیشتن و حاڵی بوون بێ، واتە ئەوەی دەستنیشانی دەکەی تا ببیتە هاوسەرت لای کەم جۆرێک لەیەک گەیشـــتن و شارەزایی سروشتی یەکتر بوون هەبێ.. خۆ دیارە ئەو شـــتە لە ژن بە ژنی مەحاڵە.. من کە ژن بە ژنم هەڵبژارد لە ڕووی نەزانیـــم نەبوو، بەڵکو ناچار بووم وا بکەم،چونکە دەمزانی ژن بە ژن واتە ڕازی بوونی چوار کەس لەجیاتی دوو کەس..ژن بە ژن وەک تـــەرازوو وابوو ئەگەر تایـــەک تۆزێ گرانتر بـــووا ئەوەکەی تر دەچووە ئاســـمان .مەحاڵە هەردوو تای تەرازوو بە ئاســـۆیی وەک یەک بوەستن.. دیاردەیەکی زۆر ســـەیر بوو کە چووینە خوازبێنی هاوسەرەکەم..نزیکەی شـــەش حەوت پیاو لە لادێـــوە هاتبوون .کە چووینـــە ماڵی مام حاجی سابیری خەزورم لە ژوورەکە بە زەحمەت شوێنی خۆم پێ کرایەوە دیارە ئەوانیش هەندێ خەڵکیان دانابوو.. داخوازی یەکە زیاتر لە دانیشتنێکی چارەســـەری کێشەیەکی گەورەی نێوان دوو تیرە و هۆز دەچوو کە دوای چەندین ســـاڵ و کۆمەڵێ شـــەڕی خوێناوی بۆ چارەسەری دانیشتبن..

وا بــاو بوو کە کچەکە جامە ئــاوێ بهێنێ. جامە ئاوەکە ئەوەندە گەورە بێ بەشــی هەمووان بــکا و هەمووان بەو جامــە گەورەیە ئاو بخۆنەوە. واتە جامە ئاوە گەورەکە بەســەر دەمی خۆیــان بکەن..تا لەو ماوە زۆر هەستیار و گرنگە کە پیاوەکان ئاوەکە دەخۆنەوە کچ و کوڕی بەدبەخت کەمێ ســەیری یەکتر بکەن.. ئیتر بانگی هاوســەرەکەمیان کرد و جامە ئاوێکــی گــەورەی هێنا.. جا تخوا تۆ غیرەت بکــە و لە ناو ئەو هەموو پیــاوە ڕیش ماش و برنجــە بتوانی چاوچاوانێ لەگــەڵ ئەو کچە بکەی کــە دوای ماوەیەک دەبێتە هاوبەشــی ژینت..! ئەوە تەنیا دیتن بوو،خۆ سروشــت و هەڵســوکەوتی ئەوەیان هەر باس مەکە.ئیتر من بە گۆشەی چاوەکانم کەمێک سەیرم کرد دیاربوو ئەویش سەیری دەکردم تا بزانێ ئەو هەتیوە ســەرکۆتە چۆنە کە لە ئایندەیەکی نزیک دا دەبێتە هاوسەری.. من هەر ئەوەندە بینیم، تا ڕۆژی گواســتنەوە نەمدیتەوە،خۆ ئەگەر ڕۆژی گواسـتنەوەی کچێکیان لە ســۆماڵ و ســوودان بۆ بهێنابام نەم دەزانی ئــەوە هەوە یان نا چونکە دوای دوو مانگ شــێوەکەیم لەبیر نەمابوو.. لەمــاوەی دوو مانگ جارێکی تــر نەمدیتەوە تا ڕۆژی گواســتنەوەی..

لەوانەیە ئێستا ئەو جۆرە هاوسەرگیری یەی خۆم باس دەکەم خەڵکانێک کە ئەو جۆرەیان نەدیوە لایان ســەیر بــێ یان باوەڕ نەکەن. بەڵام ئەوە حەقیقەتێکە.. ئەوەی باسم کرد تایبەت بە شێوە و جوانی و ناشیرینی و دیکۆری دەرەوە هەبوو، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە لەیەک گەیشتن و گونجان و هەڵسوکەوت و ڕێژەی ڕۆشنبیری نێوان هەردوولایان ئەوە هەر باسی مەکە.. دوای گواستنەوە دەبێ بە (الامر الواقع) مل کەچ کەی و کەیفی خۆتانە..

بــەو شــێوەیە بوومــە خــاوەن مــاڵ، دەبــوا دوای دەوام یەکســەر بگەڕابوومایەوە ماڵــەوەو لــە لایەک ماڵەکەم گــەرم بووەوەو خاوێــن و باوێن بــووم لە لایەکی تر ئازادی یەکانــم لێ زەوت کرا.! کە لەدەست دانی ئازادی یەکان بوونە لەمپەر لەبەردەم بەشێک لە هیواکانم.

هەردووکمان لە بنەڕەت دا لادێ یی بووین من خەڵکی قورشاغڵو ئەویش خەڵکی گوندی هێلەوە بوو کە هەردوو گوند ســەر بە ناحیەی قوشتەپە

بوون.هێلەوە گوندێکی بچکۆلانەیە و ئێستا لە سنووری ناحیەی شەمامکە لە نزیک زوورگەزراو.. مامی هاوسەرەکەم مەلا بوو لە مزگەوتی حاجی بەکر زێرینگر خۆی برازاکەی لێ مارە کردم ناوی مەلا جەوهەر بوو باوکی (مەسعود پەرێشان)ی شـاعیرە.. یادی بەخێر پیاوێکی چاک و خاوەن جەماوەری خۆی بوو کە من لە لایەن ڕژێم دەستگیرکرام، ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە یارمەتی دانی منالەکانم بۆ گوزەران کردنیان.هەزار ڕەحمەت لە گۆڕەکەی.

کە سەیری خانووەکەی ئێستام دەکەم و بەراوردێک لەگەڵ ئەو ژوورە دەکەم کە ژنم تیا گواســتەوە و دوایەش خانوویەکی تر لە حەوشەیەکی تر،تا دوو منالمان بوو،ژوورێک بوو لەنێوان ســێ مالی تر،حەوشــەیەک بوو لە کۆلانی شێزان لە کووران ژوورەکە لەوانەیە ٢،٥X ٣م بێ، سەری کاریتــەو قوڕ بوو،هەر لەو خانووە دا گولالەی کچم و ســکالا ی کچم لە دایک بوون. ســێ مالی تر لە حەوشەکە هەبوون،یەک گەرماوی بچووک و یەک (WC) هەبوو کە دەرگاکەی بە گووش داپۆشــرا بوو.زۆر جار تۆ لــە ژوورەوە خەریکی کاری خۆت دەبــووی، یەکێکی تر کە تەنگاو بووە گوشەکەی هەلدەدایەوە ئەو دانیشتنەی لێ دەکردی بە سندان،دوایەش بە پەلە و بە شەرمەوە گوشەکەی دادەدایەوە. ئەو حالەتە بووبووە ڕۆتین.. گەرماوەکەش دەبووا بەیانیان دەمــت پێشــخەری بکەی و دەست وبرد بکەی پەرەمێزەکە دابگیرسێنی و بیبەیتە ناو گەرماوەکە کە بەناو گەرماو بوو ئەگینا پیس و نارێک و بچووک بوو بەزۆر جێگای کەسێک و پەرەمێزە نەوتــی یە هار و هاجەکە دەبووەوە.! ئــەو ژنەی زۆر ئازا و چالاک بووا ئەو کەســە بوو کە یەکەم کەس پەرەمێزە نەوتی یەکەی دەگەیاندە ناو گەرماوەکە.ئەوانی تر دەبوا چاوەڕێ ی ڕەحمی ئەو بکەن کەی تەواو دەبێ..

ئــەو ژوورەی کە ســەرتاپای مالمــان بوو دەبوا لــەو ژوورە خوارن ئامــادە بکرێ و لەو ژوورەش بخەوین. لە بیرمە یەکێک لە زســتانەکان باران زۆر باری خانووەکەمان شــوێنی ئەما دلۆپەی لێ ئەیەتە خوارەوە ((ســکالا)) کە تازە لەدایک بوو بوو،بە نایلۆن ســەرمان داپۆشــی تا دلۆپەی بەرنەکەوێ.ئیتر ئەو ژوورە بە کەلکی ئەوە ئەما لێ ی دانیشین.

بەو زستانە ســـاردە ناچار بووین کۆڵان بە کۆڵان بگەڕێین تا ژوورێکمان لـــە ماڵی (کانەبی) کە خەڵکی گردعازەبان بوو لە عەشـــیرەتی گێڕەش بوو دەســـت کەوت و هەر بەو زســـتان و بارانە ماڵەکەمان پێچایەوە کە بریتـــی بوو لـــە کانتۆرێکی کۆن و چەند پارچە نوێن و قاپ و قاچاغێکی کـــەم و هەندێـــک (مقەبا) کـــە لەجیاتـــی کۆمبار و مافـــوور لە زەوی یەکە دامان خســـتبوو ئەویـــش نیوەی زیاتر لەبەر دڵۆپـــە تەڕ بووبوو.

ئەگەر بەراوردێک لە نێوان ئەو تاقە ژوورە بە دڵۆپەیە و خانووەکەی ئێستام بکرێ کە بە تەنیا لە زەوی یەکی دووسەد مەتری دروست کراوەو زۆربـــەی بینایە و دوو قاتە و هەمووی کاشـــی و حەلان و ئەلەمنیۆمە و کۆمەڵێـــک ژوورە کە هەندێکیان بەتاڵن..هـــەر هەمان خانەوادەیە کە لە ژوورە بە دڵۆپەکە ژیاوە دەبێ چۆن ژیانی ئەوساکە لێک بدرێتەوە.بەڵام بەداخەوە ئێمە لەو تەمەنە کە تەمەنی هیوا و دوا ڕۆژ نی یە درەنگە کە کاروان جێ ی هێشتین کە تەمەن بەرەو سەرووی بردین ئەوساکە هەندێ شـــتمان بۆ بەدی هات کە شـــەمەندەفەرەکە دەمێک بوو تێپەڕ بوو بوو. تا گەنج بووین حەزمان لە ژیان بوو ژیان بەو شـــێوەی ســـەرەوە بوو کە باسم کرد.ئێستاش کەوتینە بەر ڕەحمەتی تەمەن..تا حەزمان لە گۆشت بوو نەمانبوو،ئێســـتا پێمان دەکرێ و بۆمان ناخورێ.کە حەزمان لە جلی جوان بوو نەبوو (خوا خێری کۆنە جل و لەنگەی ئەوســـاکە بنووسێ کە نەیهێشـــت ڕووت و ڕەجاڵ بین) ئێستا دەتوانین جلی جوان بکڕین بەڵام لە لاشەی خوار و خێچ و پشتی کۆم نایە..

### * مام ڕەسول گەردی:-

من لە ســـەرەتای ژیانی خێزانداریمەوە بە کرێچیاتی دەستم پێ کرد. بەر لە ژن هێنانیشـــم کرێچـــی بووم،زۆربەی خێزانە تـــازەکان جگە لە ڕێژەیەکـــی کەمی خوا پێداوان دەنا ئەو ســـەردەم گەنـــج لە کرێچیاتی دەســـتی بە مـــاڵ دانان دەکرد.بـــەڵام ئەوێ ڕۆژێ وەک ئێســـتا نەبوو، ئێســـتا ئەوەی کرێچی بێ دەبێ خانووەکەی بە تەنیا بێ لەگەڵ ماڵێکی

تر دانانیشـــێ، ئەو ســـاکە بەوجۆرە خانووی کرێ یەیان دەگوت (قاپی باغڵەمە) کە ڕستەیەکی تورکمانیە.پێشتر کە کرێچی دەبووی تەنیا یەک ژوورت لەنـــاو چەند ماڵێـــک بەکرێ دەگرت.. کەرە ســـەی ناو ماڵ زۆر کـــەم بوو. لەبیرمە کە لە خانووەکەی (حاجـــی ئامینە) بۆ خانووەکەی کۆڵانی (شـــێران) لـــە کووران بارم کرد، هەموو ماڵەکەم لە پشـــتەوەی جێبەکی ستەیشـــن جێ بووەوە.. کرێچیاتی ژیانێکی ناخۆشە بەتایبەتی کاتێـــک خاوەن خانوو پێت دەلێ (خانووەکەم بۆ چۆڵ بکە پێویســـتیم پـــێ یەتی..). لەو حاڵەتەدا یان ڕاســـت دەکا پێویســـتی پێ یەتی یان مەبەســـتی زیادکردنی کـــرێ یەکە یەتی. من چوار حەوشـــم کرد تا لە گەڕەکی کووران بووم. لەوانە سێ یان سەریان بە کاریتە و دیواریان قوڕ بوو، سێ یانیان بێ کارەبا بوون. بۆیە کە لە ڕێگای پارێزگاوە شوقەیەکم لە شوقەکانی گەڕەکی ئیســـکان بەرکەوت و چووینە ناو شوقەکە وامان دەزانی ڤێلایەکی شەش سەد مەتریمان کڕیوە، بەتایبەتی خاوێن و باوێن و سپی و کاشی و دەست شۆر و گەرماو و ئاودەستی مۆدێرنی هەبوو.



مامۆستا ڕەسول گەردی و نوسەر
١٩٨٠/٣/٩

یەکەم کەس لە دراوسـێکانم کە ناسـیاوەتیم لەگەڵی دا پەیدا کرد هونەرمەند (ڕەسول گەردی) بوو. مام ڕەسول یادی بەخێر لە دوای ئەوەی خانووەکەی کە لە شوێنی چێشتخانەی (سەفین) ی ئێستا لە گۆڕەپانی شێخ مەحمود بەرجادەکەوت،پێش ئەوەی کاری شوقەکان تەواو بێ،ئەو شوقەیان بە تەنیا بۆ مام ڕەسول چاکردبوو. ماوەیەک بوو بە تەنیا لەناو ئەو شـوقانە ژیانی بەسەر دەبرد. مام ڕەسول بەتەنیا دەژیا دوو کوڕ و دوو کچی هەبوو، بەردەوام سەریان لێ دەدا و خواردنی بە ڕۆنی زەیتیان بۆ دەهێنا چونکە ماوەیەک بوو تووشی نەخۆشی دڵ بووبوو،نەشتەرگەری یەکی گەورەی لە لەندەنی پایتەختـی بەریتانیا بۆ ئەنجام درابوو.. زۆر بووینە برادەری یەکتر و زۆر لە ماڵەکەی بەیەکەوە دادەنیشـتین و باسی ئێش و ئازارەکانی و ڕۆژانی گەنجی خۆی بۆ دەکردم. مام ڕەسول شەوانە ئـازاری زۆری هەبوو، ئەو قسـەیەم لە گـوێ دەزرینگێتەوە گەلێ جار بەیانیان بۆ دەوام بەلایدا تێ دەپەڕیم لەناو ئەو باخچە بچوکەی کە خۆی دروسـتی کردبوو بە ڕۆب و بێجامەوە دەمدی و بەیانی باشـم لێ دەکرد یەکسەر بە حەسرەتەوە دەیگوت:- (کاکە سەعدی بەخودای ئەوشۆ لەبەر ژانی قەلبیم خەوم لێ نەکەتی یە..) من کەمێک لە لای دەوەسـتام و دڵم بەدلایەوە. مام ڕەسـوڵ گەردی هونەرمەند شعریشی دەنووسی، زۆربەی جارەکان شعرەکانی بە من نیشان دەدا. شعرەکانی سادە و ساکار بوون زیاتر بۆ گۆرانی ئاسایی باش بوون. ئەو پیاوە زۆر بە بەزەیی و زۆر دڵ ناسـک بوو، نەدەکرا تووڕەی بکـەی..! ئێمە بەیەکەوە تاوڵەمان دەکرد نەریتێکی هەبوو ئەگەر بەرانبەرەکەی دەستی بۆ پوولێک درێژ بکردابایەو دوایە دەسـتی لێ نەدابا و دەستی بکێشـابایەوە تا پوولێکی تر جووڵە پێ بکا، ئەو ئەوەی قەبووڵ نەبوو یەکسـەر دەستی دەگرت و دەیگوت:- (نەکەی.. یاللە دەستت لۆ ئەو پوولەی هینا بەخودای پەشیمان بوونەوە نی یە..) ئەگەر بەرانبەرەکەی بە گوێ ی نەکردبایە یاری یەکەی کۆتایی پـێ دەهێنـا و تاوڵەکەی بەیەک دادەدایەوە کە هـی خۆی بوو.. من و عەریف عەلی کە ئەویش دراوسـێمان بوو خەڵکی قەڵا دزە بوو شارەزای

مام ڕەسول بوویبووین، پەشیمان بوونەوەمان نەبوو، چونکە دەستمان لە لاشــەمان جیا نەدەکردەوە تا بڕیاری یەکجاریمان نەدابایە. دڵ ناسکی و دڵ ســافی ئەو پیــاوە وای لێ کردبــوو بە هەموو دەمێک فرمێســکی چاوەکانــی بۆ هاتنە خوارەوە ئامادە بــێ. ژوورەکەی پڕ بوو لە وێنەی یادگاری لەگەڵ هونەرمەندانی کوردســتان و عێــراق و وێنەیەکی لەگەڵ (ســەمیرە تۆفیق) ی گۆرانی بێژی ئوردنی هەبوو. هەموو جارێ بەدیار وێنەکەوە دەوەستاین، دەیگوت :- ((بەخودای ئەمن لە سەمیرە تۆفیقی کەلەکەوێت جوانتر بووم..) جا بەڕاستی پیاوێکی جوان و ڕێک و پێک و قۆز بــوو بەو تەمەنەوە قۆزی یەکەی پێوە دیار بوو،وێنەیەکی گەنجێتی زۆری خۆی بە دیواز هەڵواسیبوو کە هەندێکیان نزیکەی یەک مەتر دووجا دەبوون.. بەردەوام میوەو ســەوزەو خواردنی خۆشی لەناو بەفرگرەکەیدا هەبــوو، زۆر لە هونەرمەندەکان ســەردانیان دەکرد وەک تایەر تۆفیق و تەحســین تەها و شــەماڵ ســائیب و محەمەد جەزا. زۆر جار یادەکانی خــۆی لەگەڵ هونەرمەنــدان بۆ ئێمە دەگێڕایەوە باســی عەلی مەردان و نەســرین شێروانی و گەلێکی تری دەکرد. باســی هونەرمەندی گەورەی کورد (حەسەن زیرەک) مان دەکرد ئەو خۆشی لەو باس کردنە نەدەهات دەیگوت:- (شــەش مانگ لە مارەکەی خــۆم بەخێوم کردیە بەرانەکێتلێ کابرایەکی بێ ســیفەت بوو..) جا نازانم بۆ بەو شــێوەیە باسی دەکرد.. دەیگــوت:- (عەلی مەدان گەورەترین مەقام بێــژی عێراقی بوو بەران خەرکی فێر نەدەکرد. زۆر شــارەزا بوو لە مەقام گوتنێ..) مام ڕەســوڵ گەردی هەر زوو دایکی (کەیفی و ســەفین) ی تەڵاق دابوو. قەد ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو مافەم بەخۆم نەدا تا لێ ی بپرسم کە بۆچی هاوسەرەکەی تــەڵاق داوە.. ئیتــر ئەو ماوە دوور و درێژە خۆی هــەر چوار منداڵەکان گــەورە دەکا،هەم باوک بووە و هەم دایک،تا هەرچواریان چوونەتە ماڵی خۆیــان و ڕەســول گەردیش بەتەنیــا بۆ یادگاری یەکانــی ماوەتەوە..

من لە منالی یەوە شارەزای دەنگی ڕەسول گەردی بووبووم. زۆر جار ئەگەر دڵی خۆش بووا یان یادگاری یەکی بە بیر بهاتبایەوە لەبەرخۆی و

بـــه دەنگێكی نزم گۆرانی دەچڕی خۆ ئەگـــەر تاوڵەی لێ ببردابوونایەوە حەیرانەیەكی بەسەر دادەگۆتین و پێمان پێدەكەنی.. شەوانە لەبەر ئازاری گیانی تا درەنگ لەبەردەم شـــوقەكەی پیاســـەی دەكرد.. ئێوارەیەكیان درەنگ چەند گەنجێكی مل هۆڕی شەڕانگێزی سەرخۆشی گەڕەكی بەلاشاوە بەلای دا تێ دەپەڕن و ســـەرخۆش دەبن و گێچەڵی پێ دەفرۆشن. دیارە ئەویش وەڵامیان دەداتەوە بۆیە هێرشی دەكەنە سەر و چەند چەقۆیەكی لە قۆڵی دەســـرەوێنن و بە سەختی برینداری دەكەن و دوایە دراوسێكان دەیگەیننە نەخۆشـــخانە و دەربازی دەبێ. من ئەو ڕۆژەی لە نەخۆشخانە چوومە سەردانی، هونەرمەند محەمەد جەزا و یەكێكی تری لا بوو. دوای ئەوەی كەس و كاری گەنجەكان هاتنە لای و تكایان لێ كرد، ئەویش لە گەنجەكان خۆش بوو و لە بەندیخانە ئازادی كردن. لە هەندەران پەیكەر بۆ هونەرمەندەكانیان دروســـت دەكەن ئەگەر یەكێك شتەكی بچووك لە پەیكەرەكە بكا سزای گەورەی دەدرێ لای ئێمەش هونەرمەند خۆی دەدرێتە بەر چەقـــۆ.. وڵاتی ئێمە وڵاتی بێ نرخ كردنی نووســـەرو هونەرمەندە.

من لە حەفتەی یەكەمی دراوسێ یەتی ئەو پیاوە زانیم زۆر میهرەبانە.. ڕۆژێكیان هەندێك سەهۆڵم كڕی بوو بۆ ماڵەوەم دەهێنایەوە. چونكە بارم كرد هێشـــتا گەرما بوو وابزانم كۆتایـــی مانگی ئابی (١٩٧٩) بوو. ڕێـــگای پێ گرتم پێ ی وتـــم:- (بابە ئەوە ســـەلاجەو مەلاجەتان نی یە..؟) گوتم:- (ناوالله مام ڕەسول) پەنجەی لێ هەڵشەقاندم گوتی:- (بە خودای جارەكیتر لێت قەبوور ناكەم بووزی بكڕی ئەوە ســـەلاجەكی گـــەورە و گرانم هەیە دەبی هەموو ڕۆژێ بەشـــی خۆتان بووزی ببەی..) ئیتر تـــا ئەو ڕۆژەی بەفرگرم كڕی ڕۆژانە بەفـــرم لای ئەو دەهێنا،گەلێ جار نەدەچووم خۆی لە دەرگای دەدا و سەهۆڵەكەی بۆ دەهێنایین.. مام ڕەسول گەردی هەڵسوكەوتە عەشاییریەكەی بەرنەدابوو،لە قسەكردنیشی سادە و ســـاكارانە دەدوا، هەر وات دەزانی لە دیوەخان دانیشتووە. زۆر جار كە چەند كەســـێك بەیەكەوە دادەنیشـــتین مام ڕەسول باسی ژیانی ڕابوردووی و پێشـــمەرگایەتی ساڵی ١٩٧٤ ی بۆ دەگێڕاینەوە،یان باسی

شاری لەندەنی بۆ دەکردین، ئەگەر ڕۆژێک تەم و مژ با دەیگوت:- (ئەو جەوە عەینەن جەوی لەندەنە) هەندێک جار باسی دڵداری خۆشی بۆ دەکردین کە کەسانێکی زۆر شەیدای بووینە بەڵام قەت نەدەچووە ناو ووردەکاری یەکانی ئەو خۆشەویستی یانە.. بڕیار بوو کاسێتێکی تایبەتی خۆیم بداتێ کە تۆماری نەکردبوو تەنیا بۆخۆی بوو. بەڵام وا ڕێکەوت من لەوێ گواستمەوە بۆ شوقەکانی زانیاری. . دوای گواستنەوەشم من بەردەوام سەرم لێ دەدا. زۆر دڵگران بوو کە ئێمە بارمان کرد. حەزی لە ئەستووکی ساج بوو، لەماڵەوە ئەگەر نانمان بکردبایە ئەوا ئەستووکمان بۆ مام ڕەسول دەکرد. جگە لە مام ڕەسول سەعید گاباری هونەرمەندو دوایەش شەمال سائب هاتنە هەمان باڵەخانەو بوونە دراوسێ ی مام ڕەسول گەردی، سڵاو لە هونەرو گۆڕەکەیان..

### * جەمیل ڕەنجبەرم ناسی:-

حەزەکانم ئەوەندە لق و پۆپیان هەبوو،خەریک بوو بۆم کۆ نەدەکرایەوە، ئارەزووی بوون بە شاعیریم — شانۆ — بەدەست هێنانی بڕوانامەی سەروتر و گەلێ شتی تر. . بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامە ئەوا لە خوێندنی ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ توانیم بە ئەزموونی دەرەکی بڕوانامەی ئامادەیی بەشی وێژەیی بەدەست بێنم و هەر دوای ئەویش نامەیەکم ئاراستەی زانکۆی لوبنان کرد بۆ ئەوەی بە (مراسلە) لە کۆلیژی ماف وەربگیرێم هەواڵەکە و ڕێنمایی یەکانم بە دەست گەیشتەوە لەوێ وەرگیرام ساڵانە دەبوا (١١٠) سەدو دە دیناری عێراقی ڕەوانە بکەم و ساڵێ دوو جار سەر لە بەیروت بدەم بۆ ئەزموونی نیوەی ساڵ و سەری ساڵ. بەڵام بەهۆی شەڕی ناوخۆی لوبنان بەشداریم نەکرد و هیوایەکەم زیندەبەچاڵ کرا. جگە لەوەی کە بارودۆخی خێزانم کە گوزەرانێکی باشم نەبوو تەگەرەیەک بوو لە ڕێگای خوێندنم. بەڵام بۆ حەزەکانی ترم هەر پەل و پۆم دەهاویشت.. لە سەرەتای حەفتاکان کە تەمسیلی یە کوردیەکان بەتایبەتی (مەسەلەی شارێک) و (مەرەزە) و (چڵپاو) و

(مارەیی) و چەندین تەمسـیلی ترم بینی بە هیوای ئەوە بووم ڕۆژێک لە ڕۆژان ببم بە ئەکتەرێک و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن خۆم بدۆزمەوە،یان لەسـەر تەختەی شانۆ چەپڵەم بۆ لێ بدرێ و وەک ئەکتەرێک ناوم بڵاو ببێتەوە.. هەر بۆ ئەو مەبەسـتەش لە هاوینی سـاڵی ١٩٧٥ لە ڕێگای کاک ئەنوەر شـێخانی بوومە ئەندامی (کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی / لقی هەولێر). لەوێ بۆ یەکەم جار هەندێ کەسم ناسی وەک (عەبدوڵا پشدەری) کە سەرۆکی لقەکە بوو هەروەها (جەمیل ڕەنجبەر) سکرتێری بوو هەروەها عەلی قادر بەردەسـپی و ڕەسمی جەلال و شێرزاد ڕەنجەڕۆ و تەڵعەت سـامان و مەهدی ئومێد و چەندین هونەرمەندی ترم ناسـی.

(جەمیل ڕەنجبەر) م وەک شـاعیر پێشتر بیستبوو کە خاوەنی کۆمەڵە شعری (ڕاز و سـکاڵا) بوو بەڵام دۆستایەتی و ناسیاویم لەگەڵی نەبوو، تەنها بەهۆی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی ناسـیم.. نەشـم دەزانی هەڵوێستی سیاسی چی یە.. جەمیل ڕەنجبەری شاعیر کەسێکی ڕووخۆش و زمان پاراو بوو،خۆزگەم دەخواسـت ڕۆژێک لە ڕۆژان منیش لە توانام دا هەبووایە وەک ئەو لە کۆڕو کۆبوونەوە بەو زمانە قسـە بکەم. جەمیل ڕەنجبەر کەسێکی ڕۆشنبیر بوو،لە قسەکانیشی تامی نیشتمان پەروەری و زمانی بەرگری لە لات و بێ دەسەڵاتی هەبوو. دیارە یەکێک لەو چەند کەسـانە بووە کە ڕابەرایەتی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی)ی کردووە لە شاری هەولێر لە دوای ساڵی ١٩٧٠ دا بە نهێنی کاری کردووە چ لە ترسی ڕژێم و لە ترسـی خۆیان لەناو چەند شـانەیەکی بچووک شاردبووە وە.. من کاتێ لە پایزی هەمان ساڵ دەفتەرە شعرەکەی خۆمم نیشان دا چەند ڕۆژێک لـە لای مایەوە، دوایە چەند ئامۆژگاری یەکی کردم وەک هاندانم بۆ خوێندنەوەی بابەتە سیاسی و مێژوویی و ئابووری و فەلسەفییەکان و قاڵبوونیـان لەو بابەتانـە لەلاپەڕەی یەکەم دا پێـم دەڵێ:- ((کاکە سـەعدی گیان: چاوێکم بە شـعرەکانتا خشـاند،ئەوانە چەند تێبینی و ئامۆژگاری یەکە لە ئەنجامی چەند کەم و کورتیەکت دەینووسم:

١- بەر لە شـعر نووسین پێویستە خۆت تەسقیف بکەبە نەزەڕیاتی

عیلمی وەک کتێبی سیاســـی بە تێگەیشـــتنەوە نەک هەر خوێندنەوە بۆ خاتـــری خوێندنەوە بێت و بەس، چاوەکەم بەر لە هەموو شـــتێ کتێبە مارکسی یەکان تا تێ ی ڕوانیت لە ڕووی فەلسەفەوە و مادی دیالەکتیکی بێت نەک میسالی میتافیزیاقی..)) ئەوە خاڵی یەکەمی ئامۆژگاری یەکەی شـــەهید جەمیل ڕەنجبەرە بۆ من. ئەگەر بۆم لوا ئەوە دەست خەتەکەی وەک خـــۆی بڵاودەکەمەوە.. من ئەو کاتـــە نەهیچ زانیاری یەکم لەبارەی کۆمەڵەی مارکســـی لینینی هەبوو نە ناویشم بیســـتبوو نە شارەزایم لە مارکســـیەت و ماتریالیزمی دیالەکتیک هەبوو. حەزیشـــم لە کتابەکانی مارکس و لینین نەدەکرد چونکە بۆم هەزم نەدەکرا. تەنانەت کاتێ ناچار بووم ئەو کتابانە بخوێنمەوە وەک ئەرکێکی قوتابخانە ســـەیرم دەکردن. کە ناچار بووم سەرەتایەک لەو فەلسەفە قووڵە بزانم. لەبیرمە بە دەیان جار کێشەی (زێدە بابی)م خوێندەوە تا شتێکی لێ حاڵی بووم و تێ ی گەیشتم چۆن ڕەنجی زیادەی کرێکار دەبێتە قوربانی قازانجی خاوەن کار. بەڵام کاک جەمیل ڕەنجبەر دەمێک بوو قاڵبووی ئەو ئایدیا و فەلسەفەیە بوو بۆیە لە نووسینەکەی دا منی هانداوە بۆ ئەوەی ڕوو لەو ئایدۆ لۆژیایە بکەم ئەوە خوایە و ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران کێشـــم بـــکا.. بەڵام بەداخەوە ئەوە نەکـــرا و جەمیل ڕەنجبەر دوای ماوەیەک لە لایەن ڕژێم دەستگیر کرا و دوای ئازاد بوونیشی بوو بە پێشمەرگە تا لە ١٩٨٠/١١/١٨ لە بناری کێوە ڕەش شەهیدیش بوو چاوم پێ ی نەکەوتەوە..

ئـــەو ماوەیەی من لە کۆمەڵەی هونـــەر و وێژەی کوردی بووم نە من بەشداریم لە هیچ شانۆگەری یەک کردو نە ئەوانیش هیچ چالاکیان هەبوو. نەمتوانی ئەو ئارەزووە جێگیر بکەم. هەر کاتێکیش ڕێگای ئارەزووەکەم دەبـــووە کوێرە ڕێ ڕووم لە ئارەزوویەکـــی تر دەکرد.. گەنج لەو تەمەنە هەموو گیانی دەبێتە هیوا و ئارەزوو خۆ ئەگەر ڕێگای خۆی نەدۆزی یەوە و تەنیا خۆی بۆ یەکەکیان تەرخان نەکرد ئەوا تووشی سەرگەردانی دەبێ و هیچ بە هیچ ناکا. بەڵام ئەگەر خۆی بۆ یەکەکیان ئامادە کردو ئەوانی تری پشت گوێ خست ئەوا سەرکەوتوو دەبێ. من لە ناخم دا دوو بۆچوونی لەیەک جیام هەبوو کە لە کەم کەس وا ڕێک دەکەوێ بەیەکەوە هەڵبکەن.

یەکەمیان ئارەزووی هەستی هونەر و ئەدەب کە پڕیەتی لە سۆزو فەنتازیا و خەیاڵ،دووەمیـــان کوردایەتی و هەســـتی نەتەوایەتی ئەگەر بە زمانی ئێســـتا بڵێین حزبایەتی و سیاسەت کردن. کە لە سۆزو فەنتازیاو خەیاڵ دوورە و خاوەنی هەستێکی واقع بینە. بە پێوەری (٢X٢=٤) دەپێورێ و جیایە لەگەڵ یەکەمیان. ئەوەی دووەمیان تا ڕاددەیەک بەسەر یەکەمیان دا زاڵ بوو.. من لە هەوڵەکانم پشـــوو درێـــژ نەبووم ئەگەر ماوەیەک لە بوارێـــک دا بمابوومایەوە و ئەنجامێکی ڕاســـتەوخۆی نەبـــووا پشـــووم تەنگ دەبوو و سارد دەبوومەوە. ئەو هەڵوێستە و ئەو تەور کورتـــی یـــەم زیانی پێ گەیاندم.. لە دوای ساڵێک کە هەنگاوێکـــم لە بواری شـــانۆ نەهاویشـــت ئیتر سەردانی کۆمەڵەی هونەرو وێـــژەی کوردیم نەکرد تا ساڵی هەشتاکان جارێکی تـــر چوومـــەوە بوومەوە ئەندامی ئـــەو کۆمەڵەیە. بـــەڵام ئەوجارەیان وەک نووسەر خۆم نووسی نەک ئەکتەر..



**لەڕاستەوە شەهید جمیل ڕەنجبەر- جوهر کرمانج ١٩٧٤/٧/٢٦**

## * مامەی جوانە مەرگ : -

قەت ئەو ڕۆژە ناخۆشەم لەبیر ناچێ کە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٨١/١٢/٥ من و زۆربەی خزمەکانمان بە ((کۆسبـــتەرێک)) بێ ئەوەی کەسمان نانی بەیانی یان قومە ئاوێکیش بخۆینەوە ڕوومان لە شـــاری (موســـڵ) کرد بـــۆ دوا دیدەنی (مامە). کە ڕۆژی پێشـــتر هەواڵیان پـــێ دابووین لە بەندیخانەی (موســـڵ) ســـەردانی بکەین.. دیارە ئەو جۆرە هەواڵ و ئەو جۆرە ســـەردانەش مانای ئەوەیە ئەو زیندانی یە بە لە سێدارەدان حوکم دراوە و چەند ســـەعاتێک بەر لە ســـێدارەدانی پیشـــانی کەس و کاری دەدەن. ڕۆژێکی ساردی بێ بارانی ووشک بوو،بای شەماڵ دەهات،ئێمەش ڕوومان لە بایەکە بوو. ســـوێندت دەخوارد بۆنی مەرگ و خوێنی پێ یە، هەواڵی پەت و ســـێدارەی هەڵگرتووە. هەندێک لە ژنەکان بە نووزە نووز دەگریان و هەندێکیش تەنیا ئاخ و ئۆفیان هەڵدەکێشـــا. من بۆنی کروزی جەرگی (مام حەمەد)ی باوکی و (پلە نەخشین) ی دایکیم دەکرد.. من و (مامە) باوکمان ئامۆزا بوو بەڵام ئەوەندە یەکترمان خۆشدەویست باوەڕ ناکەم لە برا کەمتر بین. هەموو شـــتێکی لای من باس دەکرد. لە هەموو کـــەس زیاتر باوەڕی بە من هەبـــوو، ئەویش هەرچەندە نەخوێندەوار بوو بەڵام کەسێکی ئەوەندە دڵسۆز بوو بۆ کوردایەتی باس ناکرێ. مامە ناوی ڕاستی (حەمەدەمین) بوو دیارە بەناوی باپیرەم کراوەتەوە،لەبەر ئەوەی وەستای لەبغ بوو هەر بە وەستا مامە لە گەڕەک ناسرا بوو. ماڵیان هەر لەو خانووەی سەیداوە بوو کە بە گەڕەکی گامێشەوانان ناسرابوو لە نزیک پردی سەیداوە کە من بۆ ماوەیەک لە حەوشەکەیان بووم. مامەی جوانە مەرگ کاری نامەردی قەبووڵ نەدەکرد، لەســـەر خەڵکی ترو لەسەر حەق خۆی خراپ دەکردو دەهاتە وەڵام.. کوڕێکی دەم بە پێکەنین و دڵ ساف و ڕووخـــۆش و خزم دۆســـت بـــوو.. دیارە ئـــەوێ دەمێ چەنـــد لایەنێک لەگۆڕەپانەکە لەدوای هەرەسی شۆڕش پەیدابووبوون و چالاکی سەربازی و خەباتی نهێنی یان دەســـت پێکردبوو. لەوانە بزووتنەوەی سۆسیالستی

کوردســـتان بوو یەکەم جار لەناو یەکێتی نیشـــتمانی کوردســـتان بوون دوایە جیا بوونەوە و بوونە حزبی سۆسیالســـتی کوردســـتان. لە ڕێگای ڕێکخستنەکانەوە پەیوەندیان بە ((مامە)) کرد تا وەک مەفرەزەیەکی ناو شار کار و چالاکی ئەنجام بدا. مامە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاگاداری منی دەکردەوە کـــە چی دەکا و بە تەمای چی یە.. زۆر ئامۆژگاریم دەکرد کە بە هەڵپە هەڵپ کار نەکا دوایە خراپی بەســـەر دێ و چاوی دوژمن تیژە و خەڵکی خۆفرۆش زۆر بوونە.. بەڵام ئەو لەبەر تەوژمی ســـۆزی بۆ کارەکەی زۆر ئـــاگاداری دەوروبەری خۆی نەبوو. پێ ی وابوو منیش حەز لەوە دەکەم بچمە ناو ئەو ڕێکخستنە، بۆیە بەبێ ئاگاداری من سەرووی خۆی ئاگادار کردبووە وە کە پەیوەنیم پێوە بکەن. ڕۆژێک لە دیوانی پارێزگای هەولێر کوڕێک هاتە لام و پێ ی وتم حەز دەکەم دوو قســـە بەیەکەوە بکەین.. شـــێوەی ئەو پیاوەم لا نامۆ نەبوو، ژوورەکەی مام هادی کە بەرپرســـی هۆبەکەمـــان بوو چۆڵ بوو ئەودەم ئەو لەوێ نەبوو چووینە ژوورەکەی و ئەو برادەرە نامەیەکی دەرهێنا وتی:- (مامۆســـتا موحسین) سڵاوت لێ دەکا و ئـــەو نامەیەی بۆ ڕەوانە کردی.. پێم وت مامۆســـتا موحســـین کێ یە..؟ تێ ی گەیاندم کە ئەوە مامۆســـتا (موحســـین عوســـمان)ەو بەرپرســـی ناوچەی سۆسیالیســـتە و ناوی منیان پێ داوە کە پەیوەندی بکەم.. لەبەر ئەوەی کاتەکە زۆر ناســـک بوو،ئەو برادەرەشم نەدەناسی جگە لەوەی پەیوەندیم بە ڕێکخســـتنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کردبـــوو بۆیە نامەکـــەم لێ ی وەرنەگرت. . دوایە ئـــەو برادەرەم دۆزی یەوە کە لە (مصلحة نقل الركاب) بلیت بڕبوو، یەک دوو جار لەناو پاس تووشی دەبووم،بەڵام کە بلیتەکەی بۆ دەبڕیم ڕووی لە لایەکی تر دەکرد پێی وابوو من ئەوەندە بێ ســـەلیقەم نایناسمەوە. دوایە زانیم ناوی کاک (قادر)ە.

بـــۆ ڕۆژی دوایی کە مامەم بینی سەرزەنشـــتم کـــرد چۆن لەو ڕۆژە ناخۆشـــە پیاوێکی نەناسیاو لە فەرمانگە دێتە لام،ئەویش تێ ی گەیاندم کە ئەو ناوەکەی منی ڕەوانە کردووە تا پەیوەندیم پێوە بکەن..

( (مامە)) جگە لەوەی کەسـێکی چاو نەترس بوو،زۆر بێ باک بوو، بێ باکی و دڵ پاکی تووشـــی پەتی سـێدارەیان کــرد. دیاربوو باوەڕی بە خەڵکی تریش کردبوو، کە سـەرچاوەی ئەمنـــی هەولێر بوونە. وەک باســم کرد ئەو کەسـێکی نەخوێندەوار بوو،بۆیە کە ڕاپۆرتی دەنووسی بە کابرایەکی دەنووســی ناوی (ســابیر) بوو خەڵکـــی گوندی (ئاومار) بوو. (ســابیر) ســەرچاوەی ئەمن بوو چونکە دایەرەی ئەمن بە بەکرێ گیراوەکانیـــان دەگوت (مصدر). بۆیە لە کاتی پێویســت و دوای ڕۆژانە زانیاری یەکان دەچوونە ناو ئەمن. لە ڕێگای موختاری گەڕەکی سەیداوە لە ماڵ هێنایانە دەرەوە. لەو کاتەی تازە وێنەیەکی گەورەی خۆی گرتبوو لە دیواری دەداو ڕانک و چۆغەیەکی تازەشی لەبەر کردبوو.. هەندێک لەو کەسانەی کە لەگەڵی لە هەیئەی کـ ڕ وک گیرابوون دەگێڕنەوە دەڵێن کە هێنایانە لای ئێمە ڕانک و چۆغە نوێ یەکەی لەبەر بوو.

کە لەگەڵ خزمەکان گەیشــتینە ناو بەندیخانە کە من دوای زۆربەیان چوومە ژوورەوە،کە لە کۆڵانە تەنگە بەرەکەی نێوان ژوورەکانی بەندیخانەو دیوارە بەرزەکەی حەوشـــی بەندیخانە و لەناو ئاپۆرەی دایک و خوشک و خوارزا و خزمەکانی تر و لەناو گریان و داد و فیغانی ئەو خەڵکە سەری هەڵبڕی چاوی پێم کەوت وتی ( (ســەعدی گیان ئەوە هاتی..!!)) ئیتر دەســتمان لە ملی یەکتر کرد یەکەم قســەم ئەوە بــوو کە پێم وت ئایا دەزانی کێ ئاشکرای کردووی؟ وتی:- ( (سابیر بوو سابیر..)) هەر ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە ( (ئەلعانیش نازانم ئەو کوڕە لۆ وەی کرد.. ئەمــن چ خراپەم لۆی نەبوو. . نازانم ئەو کوڕە لەبەر چی وەی کرد..)) تـــێ ی گەیاندم کە کارەکانی هەمـــووی لە ئەمن تۆمار کرابوو بەتایبەتی سەعات و ڕۆژی کاتێ نارنجۆکەکەی فڕێ دابووە ناو (ئالیاتی شورتە) لە ســـەیداوە.. ئەو ڕۆژە حەوت کەس لەو کۆڵانە لەناو خزم و کەسیان ماڵ ئاوایی یان دەکردو بە زیندوویی لەسەریان دەگریان. یەکێکیان ( (نوری)) گوندی قورشـــاغلو بوو کە ئێمە هەر بە (نووری پلکە خەجیج) بانگمان دەکرد. تابلۆیەکی زۆر ســـەیر و مەرگەسات بوو. کوڕەکەی لەسەر ڕانی

خۆی دانابوو، چاوەکانی ســوور هەلگەڕابوون. جار و بار شــەپێکی لە پشتی کوڕەکەی دەدا و بە قوڕگی پڕ لە گریان دەیگوت:- (ئەوە تۆرەم دەکاتەوە ئەوە.. ئەوە تۆرەم دەکاتەوە ئەوە..)) لە پڕ حاجی (عزەدین) برا گەورەی نووری بڵند کرد و هەڵسایەوە دەستی بە هوتاف لێدان کرد، بــەڵام لە بیرم نەماوە هوتافــەکان چی بوون. لەبەر ئەوەی من و نووری خەڵکی یەک گوند بووین و دراوســێ بووین زۆریش لای ئەو دانیشــتم. نووری ئەویش لە ڕێکخســتنەکانی سۆسیالست بوو بەڵام ئاشکرا دەبن و هاوڕێ یەکی خۆی بەناوی (ڕەشۆ) ی خەڵکی گوندی پڵنگە یان مێرخوزار بە ماتۆڕ بۆ قوشتەپەی دێنێ لە دوای ئەوەی تێ ی دەگەیەنێ کە تەنیا ئاگاداری یەکی پۆلیســە و خۆی بە دەســتی خــۆی دەیباتەوە گوندی قورشاغلۆ. ئیتر دەیداتە دەســت (ئەمن) و دەکەوێتە ژێر ئەشکەنجە. ئێوارەیەک کە دونیا تاریکە لە حەوشــەکەی قشڵەی قوشتەپە دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێ و لە قاڵدرمەکان سەردەکەوێ و لە سەربانەکە خۆی فڕێ دەداتە دەرەوەی (قشــڵە) و پاســاوڵکان تا ئاودیو دەبێ ئاگایان لێ ی نابێ. بەڵام بەداخەوە لەگەڵ خۆ فڕێ دانی و لەبەر ئەوەی شوێنەکە بەرز دەبێ قاچێکی دەشــکێ. بە شەلە شەل خۆی دەگەیەنێتە ئەوپەڕی لای ڕۆژهەڵاتی ماڵەکانی قوشتەپە و هێزی نامێنێ بڕوا،لە دەرگایەک دەچێتە ژوورەوە داوا لــە خاوەن ماڵەکە دەکا کە دەربازی بکا چونکە لە زیندانی ئەمــن ڕای کردووە.. کەچی خاوەن ماڵ لەجیاتی ئەوەی هەڵوێســتێکی نیشــتمان پەروەرانە و کوردانە بنوێنێ دەچێ پۆلیــس و ئەمن ئاگادار دەکاتەوە و نووری بە قاچی شــکاو دەگەڕێننەوە ناو بەندیخانەو تا بەو ڕۆژە گەیشت..

کوڕێکی تەمەن ســیانزە ســاڵان لەناو ئەو حەوت کەسە بوو کە بۆ سەربڕین ئامادە کرابوو، کوڕەکە پشتی کۆم بوو،ئاگاداری کەس و کاری نەکرابــووەوە هەر خۆی لەناو خەڵکەکــە هاتوچۆی خۆی دەکرد زۆر بە ورەش بوو کە قســەیان لەگەڵ دەکرد هەر دەیگوت:- ((خوا کەریمە)) دیار بوو چاوی دەگێڕا ئەمە خوایە و لە دوا ساتەکانی تەمەنی خزمێکی

کەسێکی چاو پێ بکەوێ و ڕاسپاردەیەک شتێکی پێ بڵێ بەڵام داخەکەم تا چوونە ژوورەوە کەسێکی نەدی و بەبێ ئومێدی سەری نایەوە..

ئـــەو بەیانی یەو ئەو کووچە تەنگەبەرەی نێـــوان ژووری بەندیخانەو دیـــوارە بەرزەکەی حەوشـــەکە تابلۆیەکی پڕ لە مەرگەســـات و هێمای دیرۆکی یەک نەتوەی نیشـــان دەدا..! ئەوانە سەعات ((٨))ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەســـێدارە دران و گۆڕ غەریب کران. بەڵام بەر لەو ســـەعاتە کە هێشـــتا لە ژیان مابوو ماتەمینیان بۆ دانرا و پرسەیان بۆ گێڕدراو بە ســـەدان فاتیحایان بۆ خوێندرا.. ئەو تابلۆیە یەک لەو هەزاران تابلۆیەیە کە لە پێشانگای مێژووی نەتەوەیەکی ستەم دیدە هەڵواسراوە.. من هەر ئەوەندەم بۆ مایەوە کە ئێوارە گەڕامەوە ئەو چەند دێرە شعرە بۆ مەرگی مامەی جوانە مەرگ بنووسم:

گەلێ دڵخۆشم گەلێ شـــــادمانم  چونکە بە مەردی و بۆ کوردستانم
پەتی ســـــێدارە دەخرێتە ملم  لە پێناوی خاک بەختەکەم گیانم
لاوێـــکی کوردبووم دلێر و چـالاک  لەگەڵتان ژیام بە دڵێـــکی پاک
مەرگ پـەلەی کرد، دەرفەتی نەدام  بە ناڕەوایی خرامە ژێر خاک
نەکەی سەعدی گیان تۆ لەبیرم کەی  لەناوگۆڕەکەم گۆشـــەگیرم کەی
وێنەم هەڵـــکەنە لە پەڕەی دڵت  تا یادی دەســـتی بە زنجیرم کەی
بەگۆڕی ون بووت سوێند دەخۆم مامە  مادام بەردەوام لە ژیان دامـــــە
لە پەڕەی دڵم بـــە خوێنی جەرگم  ناوت هەڵکەنم بە نووکی خامـــە

((شەوی ١٩٨١/١٢/٦/٥ شوقەکانی زانیاری - هەولێر))



**لەلای ڕاستەوە خوالێخۆشبوو مەحمودو شەهید وەستا**
**مامە٣٠/٣/١٩٨٠**

## * شەڕی ئێران عێراق : -

له دوای ڕێکەوتنەکەی جەزایری ساڵی ١٩٧٥ و دوای هەرەسی شۆڕشی کورد. نێوانی عێڕاقی بەعس و ئێرانی شاهەنشـــا تا ڕاددەیەک ئاســـایی بووبـــووەوە. بەپێ ی ئەو ڕێکەوتنەی دەبوا هـــەردوولا داڵدەی نەیاری یەکتـــر نەدەن و ئاوی (شـــەتول عەرەب) دابەش بکەن و ســـنوورەکان تونـــد وتۆڵ بکـــەن. لەو ناوە چەند ناوچەیەک بـــۆ ئێران گەڕایەوە وەک (ســـەیف سەعد) و (زینو لقەوس) لەســـەر سنوور. ئێرانیش دەستی لە یارمەتی دانی شۆڕشـــی کورد هەڵگرت و بەوەش نەوەســـتا هەڕەشـــەی لە ســـەرکردایەتی کورد کـــرد ئەگەر واز نەهێنێ ئەوا خراپیان بەســـەر دێنێ.. دوای ئەوەی ڕاپەڕینە فراوانەکە بە ڕابەرایەتی (ئیمام خومەینی) دەســـتی پێ کرد ئێران بە ڕەسمی داوای لە عێڕاق کرد کە چیتر داڵدەی (خومەینی) نەدا کە بۆماوەی چواردە ســـاڵ لە عێڕاق لە خوارووی وڵات

له شاری نەجەف پەناهەندەوجێگیر بوو. بەو پێ یە خومەینی ناچار کرا بە فڕۆکەیەک بۆ پاریسی پایتەختی فەڕەنسا کۆچ بکا و لەوێ ڕابەرایەتی شۆڕشە جەماوەری یەکەی ناو ئێران بکا. ڕاپەڕینەکەی ئێران تا دەهات گەورەتــرو کاریگەرتر دەبوو هەرچەندە شـــای ئێران چەندین گۆڕانکاری بـــە پەلە و یەک لەدوای یەکـــی لە حکوومەتەکەی کرد بەڵام ســـوودی نەبـــوو. تا ئەو ڕۆژەی خـــۆی و خانەوادەکەی بە فڕۆکەیەک بۆ قاهیرەی پایتەختی میســـر ڕایانکردو خومەینیش بە فڕۆکەیەک لە پاریســـەوە بۆ ڕۆژی دوایی گەیشـــتەوە تارانی پایتەختـــی ئێران و بە ئوتۆمبێلەکەیەوە خرایە سەر شـــانی ڕاپەڕیوان.. جەماوەری عەفەوی زۆر بەستەزمانە،پێ ی وایە ئەگەر دەســـەڵاتێک لەسەر کورسی یەکەی لابەرێ ئەویتر کە دێ فریادەڕەسەو لە جەور و ستەم دەربازیان دەکا.. بەڵام هەر چاوچوقانێکە بەپێ ی یاسای دەسەڵاتداری لە ڕۆژهەڵات،ل دەسەڵاتی تازەش دەکەوێتە وێزەی ئەو جەماوەرەی کە بە چەپڵەی دەســـت یان لەڕێگای دەنگدانەوە ئەوانیان هێناوەتەوە ســـەر کورســـی.. ئیتر کە دەسەڵاتی نوێ لە ئێران قاچیان گەیشتە سەر تەشـــکە بەڕەکەی دەسەڵات و هێشتا چوار قاچی کورسی یەکانیان لە عەرشی گیر نەبووبوو دەستیان بە هەڕەشەو ناردنە دەرەوەی شـــۆڕش کـــرد بەتایبەتی لـــە عێراق کە ناوەنـــدی بڕیاڕدەری مەرجەعیەتی شـــیعەو شـــوێنە پیرۆزەکانە. عێراقی بەعس هەستی بەوە کرد کە دروســـت بوونی دەوڵەتێکی شیعە مەزهەبی لەسەر تخووبەکەی لە ئێران چ کاریگەری یەکی بەســـەر عێراقدا دەبێ کە لە سەدا شەستی دانیشـــتوانەکەی خۆی بە شـــیعە دەزانی. حزبی دەعوەی شیعە چۆن لە دوای سەرکەوتنی شـــیعەکانی ئێران ئەوانیش جموجۆڵ ناکەن.. یەکەم جار ڕژێمی عێراق هەڵمەتێکی فراوانی کردە ســـەر شیعەکان بە تایبەتی گەراو شانەکانی حزبی دەعوەو مەرجەعەکانی شیعەو زۆری لێ کوشتن.. ئێرانیش بەردەوام بوو لە خیتابە توندەکانی. دوای ڕووخانی شای ئێران لـــەو وڵاتە گێڕە شـــێوێنی و پەرتەوازەیی بوو بـــووە دیاردەیەکی زەق.

ئاخوندەکان شۆڕشـــی گەلانی ئێرانیـــان دزی و بۆخۆیان پاوانیان کرد و دەســـتیان بە لادان و قەڵاچۆکردنی نەیارەکانی تەیاری ســـەلەفی شیعی کرد. ژێرخانی ئابووری داتەپی. کارگەکان بەهۆی کۆچی زۆربەی شارەزاو پســـپۆڕەکان بـــۆ دەرەوەی وڵات پەکیان کەوت. ســـوپای ئێران کە بە پێنجەم سوپای جیهانی هەژمار دەکرا لە پەل و پۆ کەوت و پلەدارەکان و ئەفسەرەکان بەشێکی زۆریان لە کارخران و هەندێکیان گیران و بەشێکیان خۆیان ڕیزی سەربازیان جێ هێشت و چوونە دەرەوەی وڵات. بەو شێوەیە ســـوپای ئێران بووە بووە ســـوپایەکی کەم چەک و کەم شارەزا و کەم پســـپۆڕی و لاوازی لە ناوەنـــدی بڕیاڕدان و زۆری ناوەنـــدی بڕیاڕدان و هەڵوەشـــانەوەی بنکەی بنەڕەتی سەربازی. جگە لەوەی لە ماوەی زیاتر لە ساڵێک و نیو دەسەڵاتی شارستانی لە ناو ئێران جێگیر نەبوو. تا کار گەیشتە ئەوەی سەرۆک کۆمار لە کاتی وتاردان دا بە مایکەکەی بەردەمی تیرۆر بکرێ. شێوازی سیستەم جێگیر نەبووبوو. تا لە کۆتایی دا عەمامە لەسەرەکان خۆیان بەسەر هەموو دەسەڵاتەکان و تەیارەکانی تری علمانی و لیبرالیەکان بســـەپێنن.. لە بەرانبەریشـــدا عێڕاق دوای ئەوەی شۆڕشی کورد نسکۆی هێنابوو توانیبووی چەک و جبە خانەیەکی زۆر کۆبکاتەوەو ســـوپاکەی لە ڕووی مەشق و چەک و شـــارەزایی یەوە بکاتە سوپایەکی بەهێـــزو لە هەموو ســـوپای ناوچەکە بەهێزتر بێ و ســـاڵانە گەورەترین بودجەی بۆ تەرخان بکا. کە هەندێک لە شارەزایان دەڵێن ٨٠٪ ی پارەی عێڕاق بۆ ســـوپا تەرخان کرابوو. خۆ ئەگەر ئەو ڕێژەیەش نەبێ ئەوا زۆر کەمتـــر نەبـــوو. بۆیە عێڕاق بە دەرفەتی دەزانی کە هێرش بکاتە ســـەر ئێران کە ئێســـتا لاوازە و بێ توانایە و بەرگری پێ ناکرێ و دەتوانێ بە چەند ڕۆژێک چەندین ناوچە لە ئێران بگرێ و دوایە بە سەپاندنی چەندین مەرجی تەعزیزی لەســـەر ئێران شـــەڕەکە ڕابگرێ و چاوی دەســـەڵاتی شیعەش دەشـــکێنێ. بۆیە تەقینەوەکەی زانکۆی موستەنسریەی بەغدای کردە بیانوو. (ســـەدام حوسێن) کە ساڵێک بوو بووبووە سەرۆک کۆمارو

فەرماندەی گشـــتی هێزە چەکدارەکان،لەسەر شاشـــەی تەلەفزیۆنەکان سوێندی خوارد کە نایەڵێ خوێنی ئەوانە بەفیرۆ بچێ و نایەڵێ ئەو تاوانە بەبێ ســـزادانی ئەو تاوانبارانە تێپەڕێ کە لە پشـــت ئەو تەقینەوەیەن.
لـــە دوای چەند وورده تەقینەوەیەک لە شـــەوی ١٩٨٠/٩/٢٢/٢١ عێراق هێرشـــێکی بەرفراوانی لە چەند میحوەرێک کردە ســـەر ئێران و چەندین شـــارو شارۆچکە و گوندی لە ئێران داگیر کرد وْ چووە قووڵایی ئێران،بێ ئـــەوەی ئێـــران بتوانێ بەرگری یەکـــی ئەوتۆ بکا. چونکـــە چاوەڕوانی هێرشـــێکی لەو بابەتەی نەدەکرد. دانیشتوانی ئەو شارانەی کەوتنە بەر هێرشەکەی عێراق بێ ئەوەی سەلکە پیوازێک لەگەڵ خۆیان بەرن ماڵ و کەل و پەلیان لە لایەن ســـوپای عێراق بە تـــاڵان بران و هەندێکیش لە دانیشتوانەکەی کوژران و بێ سەرو شوێن کران.
لە بەرەبەیانی ١٩٨٠/٩/٢٢ بەیانی ژمارە یەکی ســـەربازی بە دەنگی ((روشدی عەبدولســـاحب)) خوێندرایەوەو بارودۆخی جەنگ ڕاگەیاندرا. بەو پێ یە شـــەڕێکی خوێناوی لە نێوان ئەو دوو وڵاتە بەرپا بوو کە بە گەورەترین و خوێناویترین شـــەڕی ئـــەو دوایی یە دادەنرێ.. پێچەوانەی بۆچوونەکانـــی ڕژێمی عێراق کە پێ ی وابوو دوای ئەوەی ئامانجەکانیان دەپێکن شەڕ دەوەستێ و مەرجەکانیان بەسەر ئێران دەسەپێنن.. ئێران لەگەڵ ئەوەی گورزێکی جەرگ بڕ و کەمەر شـــکێنی لە هێرشی یەکەمی عێراق بەرکەوت، بەڵام مەسەلەی شەڕ وەستان و دانووسانی لە بنەڕەتدا ڕەت کردەوە،هەرچەندە لە ســـاڵی یەکەمی شـــەڕ نەیتوانی هیچ بە هیچ بکا و عێراقیـــش لەبەر فراوانی خاکی ئێران نەیتوانی زیاتر ســـوپاکەی پەرت بکا بۆیە لەو شوێنانەی کە داگیری کردبوو کەوتنە بەرگری کردن. پشـــوو درێژی ئێران یـــان بڵێین منجڕی و چیرە درێژی ســـەرکردایەتی ئێـــران وای کرد چۆک دانەدەن و ڕۆژ بـــە ڕۆژ خۆیان زیاتر کۆبکەنەوە. دوای ســـاڵێک هێزی ئێران توانی خۆی بۆ هێرشی بەرانبەر ئامادە بکاو بە ماوەیەکی کەم ســـوپای عێراق لە سەرجەم خاکی ئێران دەربکا و لە

چەند شـــوێنێکیش پێشـــڕەوی بۆ ناو خاکی عێراق بکا کە هاتنە پێشی ســـوپای ئێران بۆ ناو خاکی عێراق مەترســـی یەکی گەورە بوو بۆ سەر ڕژێم. چونکە بەغدای پایتەخت تەنیا ١١٠ کم لە ســـنووری ئێران دوورە. ئەو دووریەش بە پێوەری ســـەربازی زۆر ترسناکە بۆ بەرەکانی شەڕ. لە دواجار دا سوپای ئێران شاری (فاو) ی ستراتیژی داگیر کرد.

لە ماوەی شـــەڕدا وڵاتانی ڕۆژئاوا بە ئەمەریکاوە یارمەتی یەکی زۆری عێراقیاندا ئەویش لە ڕووی لۆجستی و مەشق و چەکی کوشتن و زانیاری ســـەربازی و هەواڵگری. ئەوەی کە زۆر ترسناک بوو لەو شەڕەدا چەکی کیمیـــاوی بوو کە لە لایەن ســـوپای عێراق دژی ئێران بـــەکار دەهات. هەرچەنـــدە لە ڕووی یاســـای جەنـــگ قەدەغەیە بـــەڵام وڵاتانی ڕۆژئاوا نوقەیان لێوە نەهات.. ڕۆژانە تەلەفزیۆن ئەو هەموو تەرمە ســـەربازیەیان پێ نیشـــان دەدابن. گۆشـــەیەکی ڕۆژانە بە ناوی (صـــور من المعركة) وینەکان لە جەنگەوە هەبو . کە ســـەیری شاشـــەی ئەو تەلەفزیۆنانەت دەکـــرد دڕندەیی مرۆڤت بەرانبەر توخمەکەی خـــۆی دەهاتە بەرچاو کە چۆن خـــۆی خۆی بێ نرخ دەکا.. مـــرۆڤ وەک مێگەلی ئاژەڵ کەوتبوو هەندێکیان پارچە پارچە بووبوون.. ئەوەندە دیمەنی قێزەونیان نیشـــان دەدا کە تف لە هەموو یاســـایەکی ژیان و بوونەوەر بکەی.. هەشت ساڵ مرۆڤ بە کۆمەڵ کوژران،پارەی هەردوو لا بە فیشەک و چەک درا. ڕۆژانە بە سەدان تەرم بۆ لای دایک و باوک و برا و ژن و مناڵ بەڕێ دەکران بە هـــەزاران کەس بە (مفقود) لە قەڵەم دران،بە هەزاران کەس بوونە دیلی شـــەڕ. بە هەزاران بوونە بێوەژن و بە هەزاران بوونە هەتیو.. لە ســـاڵی یەکەمی شـــەڕ کە هێشتا فڕۆکەکانی ئێران کەمێک بڕشتیان مابوو دەبوا شەوانە کارەبا لە هەموو شارەکان بکوژێتەوە. شار بووبووە تاریکستان. من یەکێک لەو شـــەوە تاریکستانە کە ماڵمان لە شوقەکانی ئیسکان بوو تووشی ژانێکی کوشندەی گورچیلەم بووم. هیچ خزمێکم لێ نزیک نەبوو، ماڵی (ڕەشـــاد)ی هاوڕێم لە باڵەخانەیەکی تر بوو کە سەیارەی هەبوو.

(ڕەشـــاد) وەک پێشتر باســـم کردوە لەو فەرمانبەرانە بوو کە بەیەکەوە لە یەک هۆبە بووین. نەدەکرا بەو شـــەوە تاریکستانە ژنێکی گەنج بچێتە کۆڵان و باڵەخانەیەکی تر کە خەڵک لە شیرین خەودا بوون. بۆیە وامان بە باش زانی لە دەرگای دراوســـێکەی بەرانبەرمان بدەین کە پۆلیسێکی بەتەمەن ناوی (عەبدوڵا) خەڵکی سلێمانی بوو.. تا ئەوان یەکێکیان بچن کاک ڕەشـــادمان بۆ بانگ بکەن. باش بوو کاک ڕەشـــاد هات و منی بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن برد. هەرچەندە ژانەکەم ئەوەندە توند بوو ئارامم نەبوو بەڵام ناچار بوو ســـەیارەکە بە ڕەوتی کیســـەڵ لێ بخوڕێ چونکە بەبێ لایت لە شـــەقام دەڕۆیشت. لایتی سەیارە قەدەغە بوو دابگیرسێ. نە شـــەقام ڕووناک بوو نە مانگە شـــەو بوو نە سەیارەش دەیتوانی لایت پێبکا. ئێســـتاش نازانم بە چەند گەیشـــتینە نەخۆشخانەی فریاکەوتن.. دوای چارەســـەری یەکی سەرەتایی کە بریتی بوو لە لێدانی یەک دەرزی دیسان بە هەمان ناخۆشی گەڕاینەوە ماڵەوە. دوای ئەوەی کە ڕۆژەکانی تر ســـەردانی نەخۆشـــخانەم کرد بەدیارکەوت بەردێکم لـــە گورچیلە دا هەیە،ئەویش بەهۆی دەرمان و دەرزی لە دەســـتی دەرباز بووم،بەڵام لە دوای چەندین ئازار و ژان و چوونە نەخۆشخانە.

ئەو شەوانەی تاریکستان بوو گەلێ جار ڕووداوی ئوتۆمبێل و دزی و شتی تر ڕووی دەدا،بە ڕۆژیش زوو زوو هۆڕینی ئاگادار کردنەوە لێی دەدا کە نیشـــانەی ئەوە بوو فڕۆکەی ئێرانی نزیـــک بۆتەوە،ئیتر ڕاکە ڕاک و خۆ عەشـــاردان دەســـتی پێ دەکرد. من ئەو ساکە کە شەڕ دەستی پێ کرد ســـێ منالم هەبوو،گوڵاڵە – سکاڵا – هاژە- ئەوەی دوایی تەمەنی پێنـــج مانگ بوو. خەڵکێکی زۆر بۆ ســـەربازی بانگ کران،فەرمانگەکان فەرمانبەریان کەم بووەوە،ســـەربازی ڕاکردوو زۆر بوو،هەندێکیان چوونە گوندە دوورە دەســـتەکان و بەشـــێکی زۆر کەمیان پەیوەندیان بە هێزی پێشـــمەرگەوە کرد. بەو شێوەیە شۆڕشـــی نوێ تا ڕاددەیەک سوودی لە هەڵگیرسانی شەڕی ئێران – عێراق بینی،بەڵام بەهۆی شەڕی براکوژی کە

وەک ((بۆماوە)) بۆ مللەتەکەمان ماوەتەوە گەشـــەکردنی شۆڕشی وەک پێویســـت نەبوو. جگە لەوەی ناوچە ســـنووری یەکان بە قووڵایی بیست کیلۆمەتـــر گوندەکانی خاپوور کرابوون و دانیشـــتوانەکەی لە ئۆردوگای زۆرە ملێ نیشـــتەجێ کرابوون،لە کۆمەڵـــە خەڵکێکی بەرهەم هێن بوونە کۆمەڵە خەڵکێکی عەمەل مەندەی مشەخۆری موستەهلیک..

عێراق هەموو هێز و توانای خۆی بۆ شـــەڕ تەرخان کرد و دروشـــمی (کل شـــيء مـــن اجل المعركـــة) ی و دوایەش ئەو دروشـــمەی گۆڕی و کردیە (کل شـــيء من اجل النصر) پەیڕەو کرد. چاوپۆشـــی لە ڕەهەند و بوارەکانی تری ژیان کرد،باش نەدەپرژایە ســـەر بەڕێوەبردنی. بەتایبەتی بنەماکانی ئابووری وڵات و لایەنی پەروەردە و فێرکردن. تا لایەنی هونەرو مۆســـیقاو شـــانۆش خرایە خزمەتی پڕوپاگاندەکانی شەڕ و (الدفاع عن البوابە الشـــرقيه للوطن العربي) و (الدفاع عـــن العروبة) وەک لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەردەوام دەیانگوتەوە. ناویان لەو شـــەڕە نا (قادسيه صدام) گۆرانـــی بێژان بە کۆمەڵ ناچار ۱۰۸کران گۆرانی بۆ ئەو قادســـیەیە بڵێن قادسیەی سەدام یان قادسیەی دووەم ناوی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران بوو گوایە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە کە ئەو شـــەڕە درێژکراوەی هەمان شەڕە کە سوپای ئیسلامی عەرەبی بە سەرکردایەتی (ســـەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) و سوپای فارســـی لە ناوچەی قادسیە ڕووی داوە و بە خوێناوترین شەڕ دەژمێردرێ کە بە هەزاران دیلی شەڕ لە لایەن ســـوپای ئیسلامی عەرەبی تیر باران کران بۆ ئەوی قینی (سەعد) دابمرکێتەوە کە لە هێرشی یەکەم جاری شکستی خواردبوو..

دیارە ئەمەشیان قادسیەی دووەمەو (سەدام) یان بە (سەعد) دەچواند هەر بۆ سەرنج ڕاکێشـــانی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامی یەکان ناونیشانیان لەو شـــەڕە نابوو شـــەڕی نێوان عەرەب و فورسی مەجوس. شۆڤینیەتی ڕژێم لە ئەدەب و هونەر ڕەنگی دایەوە. سەرچاوە و دۆکیومێنتی سەدان ساڵەیان دەرهێنا بۆ ئەوەی بیکەنە ناوەڕۆکی ئەو نووسراو و کتابانەی کە

فارس و وڵاتی ئێران بە بەڵگەوە بســـەلمێنن کە دوژمنی عەرەبن.. بەڵام عەرەبەکان تەنیا بە پارە هاوکاری (ســـەدام) یان دەکرد ئەویش وڵاتانی کەنداو بوون. شـــای ئوردن و سەرۆکی یەمەن لەماوەی ئەو شەڕەدا دوو دۆستی نزیکی (سەدام) بوون بەڵام هیچیان نەبوو تا یارمەتی (سەدام)ی پێ بدەن تەنیا لایەنە مەعنەوی یەکە نەبێ.. لە تەلەفزیۆن جارێک بەخۆم دیتم (شـــا حوسێن) شای ئوردن لە بەرەکانی شەڕ بوو لە دواوە لەگەڵ (سەدام) بە دەستی خۆی پەتی تۆپێکی گەورەی ڕاکێشاو تەقاندی،گوایە وەک ســـەربازێک چۆتە بەرەی شـــەڕ و بەرگری لە دەروازەی ڕۆژهەڵات دەکا..

لەبـــەر ئەوەی زۆربـــەی پیاوە گەنجەکان بوونە ســـەربازو بە کۆمەڵ دەکوژران،بواری کار کردن بە چۆڵی مایەوە بە هەزاران خەڵکی میسر ڕوویان لەو وڵاتە کرد. هەندێک دەڵێن ژمارەیان گەیشتە دوو ملیۆن.. عێراقیەکان لە بەرەی شـــەڕ دەجەنگان بە کۆمەڵ دەکوژران ئەوانیش لە خێر و بێری ئەو عێراقەیان دەخوارد و بۆ وڵاتی خۆیان ڕەوانەیان دەکردەوە.. عێراق و شەقامی عێراقی بۆ ئەوان چۆل بوو تەڕاتێنیان تیا دەکرد و خاوەن ماڵ بوون..

## دونیای چیڕۆکم:-

لە منداڵـــی زۆر حەزم لە گوێ گرتنی چیرۆکـــی دەم ئاگردان بوو. حـــەزم لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی بـــوو. ئەگەر جارێکیش چیرۆکێکم گوێ لێ بـــووا لەبەرم دەکرد و دەمتوانی بیگێڕمەوە. ئەو ســـاکە چەند کەسێک لە گوندەکەمان هەبوون چیرۆک خوان بوون بە تایبەتی (عەیزە کـــۆر). مام عەزیـــز دوو چاوی زۆر جوانی هەبوو بـــەڵام دیارە لە منداڵی یەوە لەبەر خۆشەویســـتی پێ یان وتـــووە (عەیزە کۆر). ئەوەی لەبیرم مابێ چیرۆکەکانی (خەونەکەی ئەحمەدی شـــوانە) و (گوڵ وسنۆبەر) و (دێوی ســـپی و دێوی ڕەش) و (هەمزە پاڵەوان) جگە لە داستانەکانی (ئەمیر ئەرســـەلان) و (ئەبوزێـــدی هەلالی) و (لەیـــلا و مەجنون) کە

ئەوسـاکە نەمدەزانی ئەوانە داسـتانن و بەرهەمی ئەدەبی نووسـەرێکن ئەوانە ناوی هەندێک لەو چیرۆکانەن کە لە منالّی گوێم لێ بووەو لەبیرم ماوە.. بەلاّم هیچ لەمانە ئەوەندەی (ئەمیر ئەرسەلان) کاری تێ نەکردم.
(ئەمیر ئەسـەلان) داستانێکی فارسی یەو بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراوە و لـە ئەنجامی زۆر گوتنـەوەی وەک حیکایەتێکی فۆلکلۆری کوردی لێ هاتـووە. بۆ یەکەم جار لە دەمی (سـمایل مام عەزیـز قادر دەروێش مەولود) م بیسـت یادی بەخێـر لە دوای ژن هێنانـی دەچێتە گوندی (شـەناغە) لە ناحیەی سەرگەڕانی ئێستا و لەوێ کاری (جۆوانی) دەکا واتـە لەناو شـینایی لەگەڵ ماڵی خەزوورانـی کاری دەکرد و لە ماوەی سـاڵێک یەک دوو جار سەردانی ماڵی باوکی کرد. . ئەو ئێوارە زستانەم لەبیـرە کە هەموومـان چووینە ماڵی مام عەزیز. لەبـەر ئەوەی (کاکە سـمایل) کە وامان پێ دەگوت بە سەردان هاتۆتەوە و دەچینە لای ئەو. یادیان بەخێر ئەو لەگەڵ کاکم واتە مامم زۆر دۆسـت بوو یەکتریان زۆر خۆشدەویسـت. لەبیرمە دایکم فانۆسێکی بەدەسـتەوە بوو لەگەڵ یەک نانی سـاج گوایە منالّی سـاوامان پێ یە ئەو نانە لە جنۆکە و شتی وا دەمانپارێـزێ.. !لەگەڵ پازدان لەسـەر هەر جۆگـە ئاوێک یان قۆرتیلە ئاوێک چەندین (بسـم الله) لە دەمیان دەهاتە دەرەوە ئیتر ئەو ئێوارەیە بـە دیار حیکایەتی (ئەمیر ئەرسـەلان) چووینـە فەزایەکی جیا لەگەڵ فەزای خۆمان و لەو شـەوە بەشی هەرەزۆری چیرۆکی ئەمیر ئەرسەلانم لەبەر کرد و لە مێشـکم تۆمار بوو.. دوایـەش کە گەنج بووم کتابەکەم بە کوردی دەسـت کەوت،بۆ چەند جارێک خوێندمـەوە تام و چێژێکی زۆرم لێ وەرگرت کە باسـی ناکرێ.. تا دوایەش دەمتوانی ئەو چیرۆکە بگێڕمەوە بەلاّم ئێسـتا لەبیرم نەماوە. ئێمە لە گوند چەند کەسـێک لە گەنجەکان چیرۆک ونوکتەمان دەزانی ودەمانگێرایەوە بەلاّم من ومامۆستا (حوسـین حەسـەن) زیاتر بەتام وچێژتر چیرۆکەکانمـان دەگێرایەوە.
بەو دوایی یە لەدوای سـاڵی ١٩٨٧ کە گەیشـتمە قەناعەت من بە شعر

ناتوانم گوزارشـــت لە هەموو ئەو شتانەی ناو ناخم بکەم کەمن دەمەوێ ولەدوای ئەوەی رۆژێک شتێکم بۆ رۆژنامەی (هاوکاری) نووسی دەربارەی ئەو ســـوالّکەرانەی رۆژانی هەینی لەبـــەردەم مزگەوتەکان ریزدەگرن کە لە وەلاّم دانەوەیان نووســـیبوویان (واپێ دەچێ لە نووســـینی چیرۆک بەهرەت تیایە..) ئیتر ئەوەم کەوتە کەلیش کە لە جیاتی شـــعر چیرۆک بنووســـم. هاورێیەکم بەناوی (مســـتەفا عەباس) کە ئێستا لە دادگای هەولێـــر قازیە ئەویش پێ ی وابوو من بەهرەی چیرۆک نووســـینم تیایە بۆیـــە رووم لە خوێندنەوەی کورتە چیرۆک کرد. کە ئەوســـاکە رۆمانی کوردی زۆر کەم بوو. بەدوای ئەو کتابانداچووم کە باسی بنەمای چیرۆکی هونەری دەکەن. ئەوســـاکە (حوســـێن عارف) و (د. کاوس قەفتان) و (ئیبراهیم ئەحمەد) و (مســـتەفا سالح کەریم) و چەندین چیرۆک نووسی تر سەرمەشـــقی کاروانی چیرۆک نووســـان بوون. کە دەستم بە چیرۆک نووسین کرد ئەو خولیایەی منالّیم ســـەری هەلّدایەوەو لە نووسینەکانم رەنگیان دایەوە. زۆر دلّخۆش بووم کە یەکەم چیرۆکم بەناوی (خلیســـک وقەدپالّ) لەژمـــارە (٥١٢)ی هاوکاری رۆژی ١١/٢/١٩٨٠) بلاّوکرایەوە. پێم وابوو ســـەرکەوتنێکی گەورەم بەدەســـت هێناوەو رێچکەی ئەدەبی خۆم دۆزیوەتەوە. دەیان چیرۆکم نووسیوەو دوایە دڕاندوومن. لە چیرۆک نووســـین دا زیاتر حەزم لە ریالیزم رووداوی لە واقع چوون بووە ئەوەندە نەچوومەتە ناو فەنتازیا وخەیالّ. هەرچەند چیرۆک خۆی توێشـــەبەرەی خەیالّە. بەلاّم مـــن جلەوی خەیالّم ئەوەندە بەرنەداوە تا لە تەوری واقع زۆر دووربکەوێتەوە. پێشـــم وابووە ئـــەدەب بۆ هەمووانە بۆیە دەبێ ئەو شـــتانەی دەینووســـم زۆرینەی خوێنەر تێ ی بگەن. جا نازانم لە دوای بلاّوکردنەوەی بەرهەمەکانم چەند ســـەرکەوتوو بوومە. ئەمەیان خوێنەر دەتوانـــێ بڕیاربدا. مـــن چیرۆک بە دونیایەکی تایبەتـــی خۆمی دەزانم. هەندێـــک جار خەیالّ وڕاســـتیم لێ تێکەلاّو دەبـــێ، پالّەوانی چیرۆکێکم لەگەلّ کەســـێکی ژیانی ئاســـایی وەک یەکی لـــێ دێ. ئەوەی کە بووە

بەربەست لەبەردەم زیاتر قووڵ بوونەوەم بە ناخی ئەدەب دا تێکەڵاوبوونم تاسەر ئێسـقان لەگەڵ سیاسەت بووە . هەندێک جار لە نووسینەکانم دا هەوڵم داوە لە ئاقاری سیاسـەت دووربکەومەوە بەڵام هەرهێندە بە ئاگا هاتوومەتەوە کە کەشـتی هۆشم لە کەناری سیاسەت لەنگەری گرتووە . سیاسـەتیش نەک بەشێوەی داماڵدراو لە بنەما مرۆڤایەتی یەکەی بەڵکو مـن کە سیاسـەتم کردووە لە پێنـاوی خاک ونەتەوەم کـردووە . واتە خۆشەویستی بێ پایانم بۆ خاک ونەتەوە منی کێشی ناو سیاسەت کردووە .

* **سووڕانەوە بەدوای سەرەداودا :-**

ســـاڵی یەکەم ودووەمی دوای نســـکۆ لێرە ولەوێ بـــاس لەوە دەکرا فلاَنە ڕێکخراو لە فلانە شـــوێن لەسەر دەستی فلان وفلان دامەزراوە . یان مەفرەزەیەکی چەکدار لە فلانە دۆڵ وشـــاخ بینراوە . ئەو دەنگ وباســـانە بـــە پچڕپچڕ بلاَوەبوونـــەوە، بەڵام بێ ئومێدی و ڕەشـــبینی خەڵکەکە ێگەی بەوە نەدەدا قەناعەتت لادوروســـت ببێ کە جارێکی تر لەو نزیکانە ڕێکخراوی نهێنی وشۆڕشـــی چەکداری دەست پێ بکاتەوە . من ئەوساکە تـــازە کوانوم گەرم بووبوو، تازە ماڵم پێکـــەوە نابوو، لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتاوە کرێچی بووم ومووچەکەم کەم بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ناسۆری وهەژاریـــم زۆر دیبوو بۆمن ئەو ژیانە قۆناغێکی تـــازە بوو. لەلایەک من تەنیا بووم وپێویســـتم بەوە هەبوو خۆم لە کێشـــەو سەریەشـــە وژیانی ســـەخت وهەوراز بپارێزم، لەلایەکی تر هەستی نەتەوایەتیم کە ئێستا ش شانازی بەو هەستە پیرۆزە دەکەم لێم بووبووە ئەسپێکی کەحێل وگەردن بەرز وســـنگ دەرپەڕیو هەرچەندە جلەوم توند دەکـــرد بەڵام بۆم ئارام نەدەبـــووەوە . من پەیوەندیم بە هەر ڕێکخراوێکی سیاســـی کردبێ تەنیا بە پاڵنەری ئەو هەســـتە وخۆشەویستیم بۆ خاک ونەتەوەبووە . ئێستاش ئەگەر هەزار دێر لەسەر ئەو دوو پەیڤە بنووسم هێشتا دڵم ئاو ناخواتەوە . بەداخەوە بەهۆی شـــەڕی خۆکوژەوە خراپی ئاراســـتەکان، ئەو هەستە ئاوەژوکرایەوە، ئینتیماکان گۆڕان لە ئینتیما بۆ خاک و نەتەوە بۆ ئینتیما بۆ حزب وســـەرکردە . لەجیاتی ئەوەی کرنۆش لە دوای خوا بۆ بستێکی خاکی نیشـــتمان ببەین ســـەرکردەکانمان کـــردە (لات و عوزا) . لەدوای نسکۆی شۆڕش هەرچەندە بێ ئومێدی کارلێکردنی خۆی هەبوو بەڵام ئەو نائومێـــدی یەو ڕەش بینی یە نەبووە هۆی ئەوەی خەڵکانێک جارێکی تر بیر لە سەرهەڵدانی شۆڕش وبەرەنگاربوونەوە نەکەنەوە . بەتایبەتی ڕژێم بەرنامەیەکی لە پێش بوو بۆ ئەوەی گوندەکانی سەرســـنوور بە قووڵایی بیست کیلۆمەتر چۆڵ بکاو دوایەش بڕیارەکەی جێ بە جێ کرد .

ئەوســـاکە لە ئێـــران ودوایـــەش لـــە خـــوارووی وڵات بزووتنەوەی

سۆسیالیستی وله سوریاش یەکێتی نیشتمانی کوردستان دامەزرا دوایەش لەکاتی دەست پێکردنەوەی سەرلەنوێ ی شۆڕشی چەکداری بزووتنەوەی سۆسیالیستی لەپاڵ کۆمەڵەی مارکسی لینینی وهێڵی گشتی بوونە باڵێکی ناو یەکێتی نیشتمانی. تا کارەساتی هەکاری، ئەوساکە نیوەیان لە یەکێتی جیابوونەوە وحزبی سۆسیالیستی کوردستانیان دامەزراند. لە ئێرانیش پارتی دیموکراتی کوردستان لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا (سەرکردایەتی کاتی)یان دامەزراند. ئەو دەنگ وباسانە پچڕپچڕ وبە نهێنی دەگەیشتە گوێمان. هەر لەو سەروبەندەدا کۆمەڵێک خەڵک دەستگیرکران کە کادر وسەرکردە وڕێکخستنی تازەی کۆمەڵەی مارکسی لینینی یان پێک دەهێنا. لەوانە (خاڵە شەهاب) و (جعفر عبدالواحد) و (انور زۆراب) وچەندین کادری تر کە ئەو سێ یەی ناوم هێنان لە١٩٧٦/٧/٢٩ لە سێدارەدران. ئەوە یەکەم قوربانی گەورەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. لە سەرەتاوە بزووتنەوەی سۆسیالستی لەناوچەی دەشتی هەولێر وکۆیە وبناری کۆسرەت ودۆڵی خەلەکان زیاتر باڵا دەست بوون. بەو پێ یەی من لە (القلم السری) ناو پارێزگا بووم ڕۆژانە ئەمنی هەولێر (موقف) ی ڕۆژانەی بۆ پارێزگا دەنارد کە زیاتر باسی لەو مەفرەزە بچووکانە دەکرد کە لە سنووری پارێزگای هەولێر جمو جۆڵ وبزاڤیان هەبوو هەر مەفرەزەیەکی بچووک بهاتبایە گوندێک دەبوا بۆ بەیانی موختاری گوند زوو بگەیشتایە (ناحیە)و هەواڵەکەی بە هۆبەی ئەمن ڕابگەیاندبایە، ئەگەر ئەو کارەی نەکردابایە ئەوا بە تاوانی (شاردنەوەی زانیاری) سزا دەدرا. شاردنەوە یان داپۆشین بەپێ ی یاسای بەعس سزایەکی توند دەدرا. بۆیە ڕۆژانە دەمزانی ئەو مەفرەزە بچووکانە چی دەکەن ودەچن بۆ کوێ. من لەلایەک سۆزەکەم هانی دەدام بەشداری لە ئەرکە نیشتمانی یەکەم بکەم. پێم وابوو بەشداری نەکردنی واتە تۆ لەبەرەی گەلدانی. یان هاوسۆزی داگیرکەرانی مللەتەکەتی. پێم وابوو لە ئەرکە هەرە پیرۆزەکان ئەوەیە بەشێک بی یان ئەندامێک بی لە ڕووبەڕووبوونەوە. ئەوساکە سۆزم ئەوەندە زاڵ بوو ئەگەر باسیان بکردایە کە عەرەبێک لە بەغدا

زلله‌یه‌کی له کوردێک داوه حه‌زم ده‌کرد یه‌کســـه‌ر سه‌فه‌ر بۆ به‌غدا بکه‌م و زلله‌کـــه له عه‌ره‌به‌که بده‌مه‌وه. له‌گه‌ڵ بیســـتنی هه‌واڵی وا تووکم گڤ ده‌بووه‌وه. به پێچه‌وانه هه‌ندێک له‌وانه‌ی که به‌شداری شۆڕشیان کردبوو چ وه‌ک پێشمه‌رگه یان وه‌ک سه‌رپه‌ل و سه‌ر لق یا ئه‌وه‌تا بوونه به‌عسی ودوایه‌ش (الجیش الشعبی) یان بوونه مه‌فره‌زه خاسه وده‌ستیان به ڕاوی ئـــه‌و مه‌فره‌زه بچووک وکه‌م وبێ چه‌کانه‌ی هێزی پێشـــمه‌رگه کرد که.. که‌م له‌و مه‌فره‌زانه له ســـه‌ره‌تاوه ده‌گه‌یشتنه ده‌که‌س. من ماوه‌یه‌ک به دوو دڵی مامه‌وه ئایا خۆم بێ ده‌نگ بکه‌م و پێ له ســـۆز و هه‌سته‌که‌ی ناخم بنێم و چاو بچوقێنم و ســـه‌ری خۆم نه‌یه‌شـــێنم، یان به دوای سۆز و هه‌ســـته‌که‌م دا بکه‌وم و له ژیانی خۆم نه‌ترســـم.. له دواجار بڕیارم دا ڕێگای دووه‌م هه‌ڵبژێـــرم. به‌ڵام له‌و هه‌موو لایه‌نه جیا جیا یانه کامه‌یان هه‌ڵبژێـــرم.. ئیتر خۆم به‌دوای ســـه‌رچاوه‌یه‌کی باوه‌ڕپێکراو دا ده‌گه‌ڕام تـــا په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ببه‌ســـتم و قۆڵی خۆمی لـــێ هه‌ڵماڵم.. ڕۆژێکیان شـــه‌هید مامـــه کتابێکی بۆ هێنام له‌ناو زه‌رفێکـــی کاغه‌زی نابوو پێ ی وتـــم:- (من خوێنده‌واریم نی یه ئه‌و کتابه‌یان بۆ هێنام تۆ بیخوێنه‌وه و دوایه بیده‌ره‌وه من.. ) کـــه زه‌رفه‌که‌م کرده‌وه کتابێکی به‌رگ زه‌رد بوو د. مه‌حمود عوسمان نووسیبووی ئێستا ناوه‌که‌یم له‌بیر نه‌ماوه. به‌شێکی ئـــه‌و کتابه ته‌رخان کرابوو بۆ که‌م و کوڕی یه‌کانی شۆڕشـــی ئه‌یلوول و ئه‌و فاکته‌رانه‌ی بوونه هۆی هه‌ره‌سی شۆڕش. مامۆستا (مه‌غدید هه‌مزه) کـــه یه‌کێک له خزمه‌کانم بوو ئه‌و له من بـــه ته‌مه‌نتر بوو به ئه‌زموونتر بوو، پێشـــتر یه‌ک له ئه‌ندامه‌کانی باڵی مه‌کته‌بی سیاسی (جه‌لالی) بوو. مامۆســـتا بوو به‌ڵام له‌ناو په‌روه‌رده‌ی هه‌ولێر ده‌وامی ده‌کرد.. ڕۆژێکیان به‌یه‌که‌وه بووین و باسی ئه‌و کتابه‌م بۆی کرد. جا نازانم دوایه کتابه‌که‌م دا ئه‌و بۆ خوێندنه‌وه یان نا، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ی پێ وتم (نه‌که‌ی په‌یوه‌ندی و شـــتی وا بکه‌ی، ئه‌گه‌ر شـــتێک هه‌بوو من ئاگادارت ده‌که‌مه‌وه). دیاره به‌ر له‌و ڕۆژه به‌ر له ماوه‌یه‌ک نامه‌یه‌کی کاک (نه‌وشـــێروان مسته‌فا) بۆ مامۆستا (مه‌غدید هه‌مزه) و (یوسف ده‌رگه‌ڵه‌یی) و (محه‌مه‌د مه‌نگوڕی)

و (محەمەد سەرسپی) هاتبوو کە هەموویان لە کەسە دیارەکانی ناو باڵی مەکتەبی سیاســـی بوون لە هەولێر تا پەیوەندی بە یەکێتی نیشـــتمانی کوردســـتانەوە بکەن کە وەک ڕێکخراوێکی نیمچە بەرەیی کوردســـتانی پێکهاتەی خۆی ڕاگەیاندبوو. بەڵام ئەوان لە سەرەتاوە تەنیا پەیوەندیان بـــە چەند کەســـێک کردبوو کە بـــەر لە ســـاڵی ١٩٧٠ بەیەکەوە کاریان کردووە. لە کۆتایی ســـاڵی ١٩٧٧و ســـەرەتای ساڵی ١٩٧٨ دوای چەند مانگێک لەو ئاگادار کردنەوەو ئامۆژگاری یەی ئەوساکەی مامۆستا لە لای درکاندم کە دەبێ پەیوەندی بە (ی. ن. ک) بکەین.. دیارە ئەوان ئەگەر پەیوەندیان بە یەکێک بکردایە دەبوا پێشـــتر باش لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام بدابایە ئەوســـا بڕیاریان دەدا بێتە ڕێز. من لە مامۆســـتا مەغدید زیاتر لە ســـەروی خۆم کەسم نەدەناســـی. بەتەنیاش هەر ئەوم دەدی. ئەوەی نیگەرانی لا دروست کردم ئەوەبوو.

یەکەمیان :- من بەر لە نسکۆی شۆڕش پارتی بووم و پێش ساڵی ١٩٧٠ زۆر ڕقم لە باڵی مەکتەبی سیاسی دەبووەوە. (ی. ن. ک) یش بە مامۆستا مەغدیدەوە لە کادرەکانی ئەو باڵە پێک هاتبوو.

دووەمیـــان:- لە دوای ئەوەی لە پســـوولە بچووکـــەکان و هەندێک لەو بڵاوکراوانەی بەدەســـتم گەیشت تێ گەیشـــتم ئێمە لەناو یەکێتیش لە کۆمەڵەی مارکســـی لینینی کـــە دوایە بووە کۆمەڵـــەی ڕەنجدەرانی کوردســـتان کار دەکەین. دیارە ئەوەش کۆمەڵەیەکی مارکســـی یەو بۆ دکتاتۆری یەتی پرۆلیتاریا و خەباتی چینایەتی تێ دەکۆشێ، کەچی من زیاتر وەک لە سەرەتاوە باسم کرد کەسێکی ناسیۆنالست بوومەو پاڵنەرو تەوژمی هەستی نەتەوایەتیم زاڵ بوو..

## ❊ من و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان: -

بەو پێ یە بوومە لایەنگری کۆمەڵە و دەبوایە لەدوای کتابە مارکسی

یەکاندا بگەڕێم کە ئەوساکە هیچ شارەزایی یەکم لێ ی نەبوو. ئەوەی دەچووە ناو بازنەی ڕۆشنبیری لەبەر ئەوەی دەرفەتی کۆڕ و کۆبوونەوەی نەبوو پێویستی دەکرد هەرکەسە خۆی بەدوای سەرچاوەکان دا بگەڕێ.. فەلسەفەی مارکسی ئەوەندە ووشک بوو خۆم وا دەهاتە بەرچاو خوێندکارێکی بەشی ئەدەبیم و ئەزموونی کۆتاییم هەیە و بە ناچاری کتابەکانم دەخوێندەوە کە زۆربەی سەرچاوەکان عەرەبی بوون. تەنانەت هەندێک لە بڵاوکراوەکانی (یەکێتی)ش ئەوساکە بە عەرەبی چاپ دەکران بەتایبەتی (شرارە).

جگە لە خۆ ڕۆشنبیر کردن بە نەزەریاتی سۆسیالیستی زانستی کەنەدەکرا تۆ لە ڕێکخراوێک کار بکەی نوێنەری چینی کرێکار بێ و ئایدۆلۆژیای مارکسی هەڵگرتبێ شتێک لەمالتریالیزمی دیالەکتیک و یاساکانی نەزانی.. یان شتێک لە ئازارەکانی کرێکار نەزانی. خەمی ئەوەشمان لەبەر بوو خەڵکی تر بهێنینە ڕێز لەو حاڵەتە پێویستیت بە پاشخانێکی ئەو تیۆرە هەبوو تا بتوانی قەناعەت بەو هاوڕێ یە بینی کە قسەی لەگەڵ دەکەی بۆ ئەوەی بێتە ڕیزو شانەیەک دروست بکەن. بەڵام ئەوساکە بێ موتمانەیی ئەوندە زاڵ بوو ڕژێم ئەوەندە چاو و گوێی دروست کردبوو کارکردن زۆر ئاسان نەبوو. بەڵام هێزی پاڵنەر بۆ ئەو کارە لە چاوو گوێ ی ڕژێم سڵی نەدەکردەوە. چاک دەمزانی ئەگەر بگیرێم ئەوا لە لایەک کەس نی یە درهەمێک دوای خۆم بداتە ئەو ژن و مناڵەی کە هەیە لە لایەکیش لەوانەیە پەتی سێدارە چاوەڕوانم بکا.. بەڵام نەدەکرا دەستە وەستان و دەست لە ئەژنۆ دانیشین و بڵێین کوردایەتیش دەکەین. بۆیە یەک لەو کەسانەی کە چاوی خۆم خستە سەر تا مەسەلەی پەیوەندی لەگەڵ بکەمەوە کوڕێک بوو لەگەڵ خۆم فەرمانبەر بوو ناوی (سەردار محەمەد عەبدوڵا) بوو کە ئێستا لەوڵاتی دانیمارک نیشتەجێ یە. لەگەڵ کوڕە پوورێکم خزمایەتیان هەبوو باوکیان ئامۆزا بوو. لەگەڵ کاک سەردار هەردووکمان لە دیوانی پارێزگا فەرمانبەر بووین و لە یەک ساڵ دامەزرابووین. زۆر جار مەسەلەی کوردایەتی و خەبات و دڕندەیی و

چەوسانەوەی حزبی بەعسمان باس دەکرد. زیاتر لە چەند مانگێک. هێواش هێواش زیاتر بە ڕوونی قسەم لەگەڵ کرد و پێم وت من حەز دەکەم بەیەکەوە پەیوەندی بە (ی. ن. ک) بکەین و پێم وت من دەتوانم ئەو ڕایەڵە دروست بکەم. بەو شێوەیە کاک سەردار یەکەم کەس بوو کە من هێنامە ڕیزی (ی. ن. ک).

کاتی خۆی تا یەکێمان ڕێک دەخست دەبوا کاتێکی زۆری بۆ تەرخان بکەین تێکۆشانێکی زۆری بۆ بکەین. کە یەکێک دەهاتە ڕیزی ڕێکخستن پێمان وابوو سەرکەوتنێکی گەورەمان بەدەست هێناوە. دیارە ئەوەی بۆ یەکەم جار دەهاتە ڕیزی ڕێکخستن لە بازنەی ڕۆشنبیری و دوایەش لایەنگری و پاش ماوەیەکی باشیش ئەوساکە بۆ ئەندامی یەکێتی دەپاڵێورا. ئەو ژان وماندوو بوونەی دەویست کە لە ژانی لەدایک بوونی منداڵێک دەچوو. کەچی ئێستا ئەگەر کادرێکی پێشکەوتووی قاڵبووی خەبات و خاوەن کۆمەڵێک قوربانی یەکسەر بچێتەوە ماڵەوە دانیشێ کەس لای بە لادا ناکاتەوە کەس ناپرسێ ئەو کادرە چی بەسەر هاتووە. وەک ئەوەم دێتە بەرچاو ئەو کابرایە نەمامێک بچێنێ و ئاوی بدا و دوای چەندین ساڵ خزمەت کردن کە بەری دا ئەوساکە بە داربڕێک یان تەورێک لەبنەوە بیبڕێتەوە.. ئاخر ئێمە لەو قۆناغە ناسک و دژوار و ترسناکەو لە دەمی ئەژدیها خەباتمان کردووە تا یەکێک دەهاتە ڕیز چاومان دەردەچوو جگە لەوەی لەوەش دەترساین نەوەک (هێڵی لار) بێ چونکە بە درێژایی خەباتی دوای ساڵی ١٩٧٠ هێڵی لار و ویژدان فرۆشان ڕۆڵێکی دیاریان بینی و بە سەدان کەس بوونە قوربانی ئەو ویژدان فرۆشانە.

من و کاک سەردار شانەیەک بووین و ئەو لە من زیاتر لەسەرەوە کەسی تری نەدەناسی. ئەو برادەرە هەرچەندە شارستان بوو هەر لە شار گەورە بووبوو، بەڵام کوڕێکی بزێو بوو چاو نەترس بوو. لە ڕێگای ئەو برادەرە برای شاعیرمان کاک (قاسم شێروانی) پەیوەندی کرد، بەڵام لە سەرەتاوە من نەمدەناسی دوایە بەهۆی متمانەوە کە من بەپرسی شانەکەیان بووم بۆ یەکەم جار لە دووکانەکەی لە بازاڕی (سیروان)

یەکتریمان ناسی. کاک قاسم شاعیرێکی هەست ناسک بوو پێشتر لەگەڵ کاک سـەردار برادەرایەتی و هاتووچۆیان هەبـوو جگە لەوەی دووکانی هەبوو لە فەرمانگەی (حەدید و خەشەب) فەرمانبەر بوو.

ڕێکخسـتنەکان بە شێوەی تاک تاک بوو، من لە سەرووی خۆم تەنیا مامۆسـتا مەغدیدم دەدی و لە خوارەوەش کاک سەردار. جگە لەو ناوانە هەر لە سەرەتای سـاڵی ١٩٨٠ دوو کەسی تریش پەیوەندیان بە منەوە کرد دوای ئەوەی مەسـەلەکانم لایان باس کـرد، ئەوانیش هەردووکیان خزمی خۆم بوون باوکمان ئامۆزا بوو یەکێکیان (عیسا عەبدوڵا سوڵتان) بوو کە ئێستا ئەندامی سـەرکردایەتی حزبی زەحمەتکێشانە بە نازناوی (ئـارام)، دووەمیان (فـارس محەمەد عەبدولا) فـارس مام حەمەد کە پێشتر باسم کردووە. ئەویش دوای ئەوەی (مامە)ی برای لە سێدارەرا درا چووە ریزی پێشمەرگایەتی لە ریزەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان بەوپێ یەی برایەکەی لەسەر ئەو حزبە لە سێدارە دراوە. من ئاگام لێ ی نەبوو کە لە سـەربازی ڕای کردبوو بووبووە پێشمەرگە. مامۆستا فارس دوای ڕاپەڕین وتێکەڵ بوونەوەی بەشـێکی سۆسیالیسـت لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردسـتان ئەویش بووە پارتی وئێسـتا ئەندامی لقی دووی پارتی یە لە هەولێر.

پێشتر ڕێکخستنەکانمان تۆکمە وبەهێزبوون. زۆر فراوان نەبوو، یەکەم جار لە بازنەی ڕۆشنبیری دەمایەوە دوایە وەک لایەنگر هەژمار دەکرای بێ ئەوەی ناوت لە هیچ شوێنێک بنوسرێ. دوای ماوەیەکی تر دەپاولێورای و ئەوسا دەبوویتە ئەندام.. . ڕۆژێک مامۆستا مەغدید پسوولەیەکی دەست نووسـی بۆ هێنام کە لە ڕێکخراوی هەولێر ئاڕاسـتەی من کرابوو مۆری ڕێکخراوی پێوەبوو، تیایدا پیرۆزبایی یان لێ کردبووم کە پلەی ئەندامیان پێ داوم. کەپسوولەکەم خوێندەوە وامزانی بوومەتە (گیڤارا)و ئیتر تەواو من هەموو شـتێکم. بەو پێ یەلە شانەکەم تەنیا من ئەندام بووم ومنیش سەرپەرشتیم دەکردن. خەبات و تێکۆشانی ئەوێ ڕۆژێ زۆر سەخت بوو.!

هەر لە ماوەیەک چەند کەسێک ئاشکرا دەبوون وڕژێم هەندێکی دەستگیر

دەکرد، سەیر لەوە دابوو پێمان وابوو لەگەڵ ئێمەی نی یە..! بۆ ئەوەی لەوە بســـلەمینەوە یان هەواڵی لە ســـێدارەدانی هاوڕێ یەکمان ساردمان بکاتەوە. من قەناعەتم زۆر بە سســـتەمی سۆسیالیزمی دروست بوو بەڵام نەک بە دکتاتۆریەتی پرۆلیتاری..! دوای چەند ســـاڵێک شارەزایی یەکم لە شـــێکردنەوەی ماتریالیـــزم و قۆناغەکانی گەشـــەکردنی کۆمەڵگا ولە سەرەتاکانی نەزەریەی مارکسی پەیداکرد. بەڵام ئەوساکەش بەخیلیم بە هەندێک دەبرد کە لەو بوارەدا زۆر لەب لەبان بوون. یەکێتی نیشـــتمانی کوردســـتان لە سەرەتاوەلە هەولێر جگەلەوەی تووشی هەندێک گرتن بوو ڕێکخســـتنەکان ئەوەندە فراوانیش نەبوون تا ساڵەکانی (١٩٨٢-١٩٨٣) خەریک بوو هەموو یەکتر بناسن. ئەوەی زۆر دیاربوون لە پەنجا کەسێک تێ نەدەپەڕین. شـــوێنێک هەبوو ئێســـتا ئەو گۆشـــەیەیە کە دەکەوێتە بەرانبەر بازاڕی نیشـــتمان عەسران زۆر لەو هاوڕێیانەی لە یەکێتی نزیک بوون لەوێ دەوەســـتان وتەسبیحی قەزوانی درێژیان بەدەستەوە دەگرت. یەک لەوانە (محمد عثمان علي) کە بە کاکە حەمە ناســـراوە لەســـاڵی ١٩٧٧ گیرا تا ساڵی ١٩٧٩ مایەوە. ئەو برادەرە دەبوا خۆتی لێ لابدەی، ئەگەر لەوبەری شـــەقامەکە چاوی پێـــت بکەوتابایە ئەو لەوبەرەکەی تر بـــووا لەناو ئەو خەڵکە بانگی دەکرد (فڵان خەبەرەکی نوێم پێ یە مەڕۆ وا دەپەڕمەوە..!) لەگەڵ ئەو هاوارەش دەســـتی هەڵدەشـــەقاند. ئەگەر پســـوولەیەک یـــان بڵاوکراوەیەکمان بۆ بهاتبایە دەبوا شـــەو بە دزی بۆ یەکترمان ببردایە ماڵەوە. زۆرجـــار ئەو نامیلکانەمان لەناو ڕۆژنامەیەکی دیار دەناو ئاســـایی بەدەســـتمانەوە دەگرت تا دەماندایە ئەو کەســـەی مەبەستمانە. چەندین جار تووشی هەڵوێستی سەیر سەیر دەبووین.

ڕۆژێکیـــان دوو گۆڤـــاری (کۆمەڵـــە) یـــان زیاتـــرم پـــێ بـــوو کە بڵاوکراوەیەکی ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســـتان بوو، لەناو ڕۆژنامەیەکی (الثورة)م نابوو. ڕۆژنامەی (الثورة) زمان حالی حزبی بەعـــس بوو ئەو ســـەردەم. لە زەرفێکی نایلـــۆن هەندێک (ئارو)م کڕی وڕۆژنامەکـــەم بە بڵاوکراوەکانەوە خســـتە ناو زەرفەکە ولەســـەر (ئارو)

ەکەم دانا. لە بازارەکەی شـێخەڵا بۆلای ڕیمەکانی گەرەکی کووران هاتم بۆئەوەی بگەڕێمەوەماڵەوە. ئەوساکە پاسەکانی ئەو گەڕەکانە لە شوێنی (یانـــەی فەرمانبەرانـــی کۆن) کە دەکاتە گۆرەپانەکـــەی پێش (بازاری نیشـــتمان)ی ئێســـتا دەوەستان. ئەو پاســـەی بۆ کووران دەهات بەرەو پڕبوون دەچوو. من ئەوســـاکە ماڵم لە شوقەکانی زانیاری بوو. کوڕێکی عەرەبی ئەمن دراوســـێم بوو، بەهۆی دراوســـێ یەتـــی وبەپێ ی ئەوەی مـــن فەرمانبەرم لە پارێزگا وگەلێ جاریـــش بەریدی ئەمنی بۆ دەهێناین لـــە (هۆبەی نهێنی) بۆیە ئاشـــنایەتیمان هەبوو گەلێ جاریش لەبەردەم ماڵەوە بەیەکەوە دەوەســـتاین. هەر قاچم خســـتە سەر دەرگای پاسەکە ئەو (ئەمن)ە لە بەرانبەری دەرگا دانیشـــتبوو یەکسەر ووتی (هەلو کاکە ســـعدی) شوێنەکەی تەنیشت خۆی بۆ دەســـت نیشان کردم، منیش بێ ســـڵەمینەوە چووم لە تەنیشتی دانیشـــتم وزەرفە نایلۆنەکەم لە نێوان خۆم وئەو دانا. لەڕێگا کە قســـەی دەکرد جار وبار ســـەری بۆ زەرفەکە وڕۆژنامەکەی ناوی شـــۆڕدەکردەوە. من قەناعەتم وابوو ئێستا دەست بۆ ڕۆژنامەکە دەبا ودەڵێ «(اشـــوف شکو بیها)» من ئەوەم دانابوو ئەگەر دەســـتی بۆ ببا من خێراتر دەستی بۆ ببەم وبڵاوکراوەکان بەشێوەیەکی ئاســـایی دەربهێنم وڕۆژنامەکەی بدەمە دەســـت. چونکە ئەوەم دەزانی خوێندەواریەکەی ئەوەندە بەهێز نی یە تا زوو بڵاوکراوەکە بناسێتەوە کە ئارمی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی لەسەر بوو.

بـــە تایبەتیش بە کوردی نووســـرابوو. ئەوەشـــم دەزانی ئەگەر دوو بڵاوکراوەکـــەی بدیبا وبیناســـیبایەوەئەوا وەک ئەوەبوو هەنگوینی لە دار دۆزیبێتەوە یەکسەر تووشی داوی دەکردم. بەڵام بە سەلامەتی گەیشتمە ماڵەوە.! وەکی پیاوان دەســـتی بۆ درێژ نەکـــرد. لەوانەیە (ئارو) وەکە دەربازی کردبم. جارێکی تـــر بڵاوکراوەیەکم بۆ هاتبوو پێش نیوەڕۆ بوو دەبـــوا بچم وەری بگرم وبۆ ئێوارە دابەشـــی بکەم. لـــە پارێزگا چوومە دەرەوە وبڵاوکراوەکـــەم هێنا و خســـتمە ناو چەکمەجـــەی مێزەکەم کە ئاســـن بوو. لە ژوورەکەم دوو کەســـی تری لێبوو، یەکێکیان (ڕەشـــاد

مەحمـــود) ونەوی تریان کچێک بوو بە ناوی (ئەحلام). نیوەڕۆ کە دەوام کۆتایـــی هـــات من وەک ئەوەی مێشـــم میوان نەبێ نـــە چەکمەجە ونە شـــتەکانی ناویم لە بیرما. کە گەڕامەوە ماڵەوە یەکسەر بە بیرم هاتەوە کـــە چ هەڵەیەکم کردووە. ئێ تازەش فەرمانگە دادەخرێ وچارم نی یە. کاک (هادی ســالح) کە بەرپرســـی هۆبەکە بوو ئێواران دەوامی هەبوو لەبەرئـــەوەی پارێزگار شـــەوانە دەوامی دەکرد ئەویـــش دەچوو نەوەک بروســـکەیەکی بەپەلە هەبێ. بیرم کردەوە ئەگەر لەکاتی دەوامی شەوانە بچم لەوانەیە شـــتێکی نەگونجاوبێ. من بەو شەوە بۆ دەچمە فەرمانگە. ناچاربووم شـــەوێکی ناخۆش بەڕێ بکەم وهـــەزار لێکدانەوەی بۆ بکەم. تۆ بڵێ ی بەیانی بەرلەوەی ئێمە بچین بەردەســـتەکە کە مێزەکان پاک دەکاتەوە چەکمەجەکە ڕانەکێشێ ونەخوێندەواریشە ئاسایی ئەو شتانەی پێ ســـەیر بێ بیانهێنێتە ســـەر مێزەکە. یا تۆ بڵێ ی کاک هادی ئێوارە لە شـــتێک نەگەڕابێتوو ئەوانەی دیبێ. ئیتر بـــەو دڵە ڕاوکێ یە بەیانیم کـــردەوە وکە چوومە ژوورەکە یەکســـەر تاوم دایـــە چەکمەجەکە. بەڵام ئەمانەتەکە وەک خۆی بوو. ئەوانەی لە ســـەردەمی ڕژێم نەژیاون نازانن بڵاوکراوەیەکـــی لەو بابەتە بەس بوو بۆئەوەی پەتی ســـێدارە بۆ خۆت حەلال بکەی. جگە لە کارەســـاتی هەکاری کە بەسەر یەکێتی نیشتمانی کوردســـتاندا هات. دوای ئەوەی گەورەترین هێز وتوانای خۆی لە دەست داو بەشـــە زۆرەکەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی لێ جیابووەوە و(حزبی سۆسیالیســـتی کوردســـتان)یان ڕاگەیاند بەردەوام شەڕی یەکتر کوشتن هەر هەبوو. هەندێک جار زۆر وهەندێک جار کەم. حزبی سوسیالســـت و حزبی شـــیوعی وپارتی لە بەرەیەک دابوون ویەکێتیش لە بەرەیەکی تر. ئەوەی ئازاری ئێمەی دەدا ئەو شـــەڕە خۆ کوژی یە بوو کە لە هەردوولا پێشـــمەرگە کوشتن بوو. شەڕی پێشـــمەرگە کوشتن لەلایەن پێشمەرگە خۆیەوە کارەســـاتێک بـــوو زمانی ئێمەی لە ناو شـــار لاڵ کردبوو..! تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ هێزەکانی سۆسیالست لە سنووری پارێزگای هەولێر لە هەمووان زیاتر بالادەســـت بوو. بەڵام بەهـــۆی ئەو هەموو پەیوەندی

کــــردن به ڕژێم کــــه چەندین ســــەرکردەیان یەکتریان قڕکــــرد، دوایەش دەهاتنەوە ناو ڕژێم ودەبوونەوە مەفرەزەی تایبەت و دەســــتیان بە ڕاوە پێشــــمەرگەدەکرد. سۆسیالست شکســــت لەدوای شکستی دەهێنا، لەناو شــــاریش ئێمە لەناو خۆمان دەومان تێک دەنا، زۆرجار وادەبوو نزیکترین برادەروخزم لەیەک زویر دەبوون، چونکە بەبێ قەناعەت و بۆچونی خۆیان هەریەکێک لایەنێکی پێ ڕاســــت بوو.. لەبیرمە چەندین جار تووشی ئەو جۆرە ململانێ و شەڕەدەمە دەبووم. من لە دیوانی پارێزگا بووم برادەری (بەکر گەردی) بووم، کاک بەکر گەردی برای عزیز گەردیە وهەردووکیان نووســــەربوون خەڵکی ناحیەی بەحرکەبوون. کاک بەکر گەردی ئێســــتا ئەندامی ئەنجوومەنی شــــارەوانیە لە هەولێر، من خۆم لە موناقەشەی ئەو بــــرادەرە لادەداو ئەویش بە هەمان شــــێوە.. بەڵام ڕۆژێک لە ژووورەکەی کاک بەکر دانیشتبووم کاک (ئەسعەد عەدۆ)ی هاوڕێی منالّیم هاتە ئەوێ. کاک ئەسعەد عەدۆ کەبەنووسەری فۆلکلۆر ناسرابوو لەمنالّیەوە برادەری یەکتربووین ولە هەمان کاتدا برادەری بەکر گەردیش بوو. نازانم حەفتانەبوو یان مانگانەبوو بەرنامەیەکی لە تەلەفزیۆنی کەرکوکی ئەو سەردەم هەبوو کەبەرنامەکــــە فولکلۆری بوو، ئەوێ ڕۆژێ ئــــەوەی لەتلفزیۆن و ڕادیۆی بەعــــس کاری بکردابایــــە پێوانەیەکی باشــــی بۆ نەدەکــــرا، هەرچەندە بەرنامەکەی کاک ئەسعەد تەنیا باسی فۆلکلۆری کوردی دەکرد.

ئــــەو ڕۆژە لەگــــەڵ بەکرگەردی لەبۆچوونەکانیانــــدا دژ بە من خۆیان تونــــد کرد، وبەهەردووکیــــان قانگیان دام و جێم پێ جێ نەبوو وشــــەو دەســــتەواژەم لەئاســــمان قەرزدەکرد بۆئەوەی وەڵامیان بدەمەوە، ئەوان بەرگرییان لەپارتی دەکرد.! یەک لەقســــەکانی کاک ئەسعەد ئەوەبوو کە دەیکوت ((ئەگەر یەکێتی ڕاســــتبی بۆبەتەنیایــــەو کەچی حزبەکانی تر هەموو بەیەکەوەن، لەبیرمە من کەباســــی کارەســــاتی هەکاری وکوشتنی مەفرەزەکان وکوشــــتنی پێشــــمەرگەی حزبی دیموکراتی کوردوستانی/ ئێران/ دەکرد. ئەوان بۆچوونی زۆر ســــەیر ســــەیریان هەبوو. قسەیەکی کاک (ئەسعەد عەدۆ)م لەبیرە کە گوتی:- (ئەو قسانە لەکنە من ناخوا.

ئەمن بە دەســـتە خۆم نی یە) دوو جار دەســـتی لە سنگی خۆی دا و لە قســـەکەی بەردەوام بوو وتی (ئەمن بە دەستە خۆم نی یە خۆشەویستی ئەو مەلا مســـتەفایە لەناو ئێرە دایە و نایەتە دەرێ ئەوجا پێ ی ناوێ.. ئای..!) ئەوســـاکە خوا لێ خۆشــبوو بارزانی لە ژیانـــدا نەمابوو. ئیتر دەمەدەمەکەمان بەو قســـەیە کۆتایی پـــێ هات و زانیم من هەرچی بڵێم ئاسنی سارده کوت دەکەم.

من ئەوســـاکە هەموو ڕووداوەکانم لەبەر چاو بوو، دەنگ و باسەکانم دەبیست، خەڵکی ناو ڕووداوەکانم دەدی، بۆیە هەندێک جار لە گفتوگۆو شـــەڕە دەمەکان سوور دەبوومەوە چونکە پاساوێک نەبوو بۆ خۆ دەرباز کردن و پەڕینەوە لە تاوانی کارەساتی هەکاری.

هەر لەســـەر ئەو جۆرە کنە و دەمەدەمی گەنجانی ناو شـــار خەڵک تووشـــی سەر یەشـــە دەبوون و هەندێک جار لای ڕژێم ئاشکرا دەبوون و دەگیران و گەلێ جاریش دەگەیشـــتنە پەتی سێداره. خەڵکانێک هەبوون ڕێکخســـتنی هیچ لایەک نەبوون بەڵام هەر لەبەر ئەوەی ڕقی لە کەسێکی دیـــاری ناو لایەنێک دەبـــووه وه لەوانەیە لەبەر کێشـــەی کۆمەڵایەتیش بووبـــێ، ئەوه دەبووه نەیاری ئەو لایەنەو دەبووه لایەنگری لایەنێکی ترو دژی لایەنەکەی تر دەدوا و هەزار ناو و ناتۆرەی بێ بەڵگەی دەهێنایەوە.. من تەنیا لەو کەســـانە ســـوور دەبوومەوە کە بە بێ بەڵگە ناتۆرەیان بۆ کەســـێکی ناو یەکێتی یان یەکێتی بە گشـــتی دروســـت دەکرد. یان بێ شارەزایی هەندێ بابەتی دەورژاند. کە تەنیا ڕستەیەکی دووبارە و سێبارە دەکردەوە بێ ئەوەی مانا و مەغزاکەی بزانێ کە وەک (بەبەغا) قســـەی کەســـێکی تری دووبارە دەکـــردەوە.. بۆیە زۆر هەوڵـــم دەدا لەو جۆرە موناقەشـــانە دوور بکەومەوە تا لای کەم خۆم لە چاو و گوێ ی ڕژێم بە دوور بگرم..

## * ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤

ماڵم لە شـــوقەکانی زانیاری بوو لە شوقەی ژمارە (٥٥) باڵەخانەی (٥) ســـاڵی ١٩٨٣ تا ڕاددەیەک بۆ من ســـاڵێکی پڕ نەهامەتی و خەم بوو. ئەوســـاکە ســـێ کچ و کوڕێکم هەبوو ((گوڵاڵە)) و ((ســـکاڵا)) و ((هـــاژە)) و ((کوڕەکەم)) لە ١٩٨٢\٤\١٤. دوای پێنج مانگ دکتۆرێک ئـــاگاداری کردینەوە کە ئەو منالە دڵـــی کونە و ئەگەر تەمەنی ما دەبێ نەشـــتەرگەری بۆ بکرێ ئەویش لەوانەیە لە بەغـــدا هەبێ.. ئەو هەواڵە بـــۆ ئێمە هەواڵێکـــی زۆر ناخۆش بوو. هەرچەندە پێـــش چەند مانگێک لە شـــەوی ١٩٨٢/١١/١٨ دوو خزمی پێشـــمەرگەمان لـــە گوندی منارە لـــە کاتی گەڕانەوەیان لە جەولەی ناوچەی کەندێناوە دەکەونە بۆســـەی مەفرەزەی ئەمنی قوشـــتەپە و مەفرەزەی (مەلا عوزێر)ی سەرەک جاش و دوو خزمەکەی من (خەســـرۆ ئیسماعیل ســـاڵح و کاکە زیاد حەسەن عەزیز) بـــوو کە هەردووکیان فەرماندەی مەفرەزە و جێگرەکەی بوون لە حزبی سیۆسیالســـت بە دەستی خۆفرۆشان شـــەهید دەکرێن.. هەر لە هەمان ســـاڵ لە ١٩٨٣/٢/٢٢ کوڕەکەم مرد.. ماڵێک لە باڵەخانەکەمان هەبـــوو ماڵی (مام حەمەد و پلکە ئامینـــە) تاقە کوڕێکیان هەبوو ناوی (فەرهـــاد) بوو، دیارە ئەو کوڕەیـــان هاتووچۆی ماڵێک دەکا. ڕۆژێکیان پیاوی ماڵەکـــە پەلی ژنەکەی دەگرێ و دێتە ماڵی (مام حەمەد و پلکە ئامینە)و هەڕەشـــەیان لێ دەکا گوایە فەرهاد پەیوەندی لەگەڵ ژنەکەی هەیە. لە ئەنجامی دەمەقاڵێ دەبێتە شـــەڕ و فەرهاد چەند چەقۆیەک لە پیاوەکـــە دەدا. ئەو ئێوارەیە لە باڵەخانەکە بووە هەرا و گریان و هاوار. کـــە دەرگام کردەوە من ژنی کابرایەکەم دی بە لەخۆدان و بە پای پەتی بـــۆ دەرەوەی باڵەخانەکە ڕای کرد و هـــاواری دەکرد و ناوی مێردەکەی دەهێنا و دەیگوت:- (کوشـــتی.. کوشـــتی). ئیتر هەواڵی پۆلیس دراو تەرمی کابرایان بە ئۆتۆمبێل برد.

ئـــەو ئێوارەیە ئێمە نەمانتوانی لە ماڵەوە ئارام بگرین دەرگای ماڵمان داخســـت و هاتینە ماڵی (حاجی سابیری خەزورم). چەند ڕۆژێک لەوێ

ماینـــەوە بەڵام کوڕەکەمـــان نەخۆش کەوت و ئێوارەیـــەک هێنامانەوەو بردمانە لای دکتۆر ((سەعد)) لە بنکەی تەندروستی زانیاری لە بەرانبەر ماڵەکەمان. دکتۆر ئاگاداری کردینەوە کە بە پەلە بیبەینە نەخۆشخانە.. کە بردمان و تەبەلەمان بۆی کرد و دەرزی یەکیان لێدا و خســتیانە ناو نایلۆنی ئۆکســجین. بەڵام لەگەڵ دەرزی لێدانەکە کەوتە گیانە لاو تەواو بوو.

کارەســاتی ماڵی (مام حەمەد و پلکە ئامینە) کارەساتێکی ناخۆش بـــوو. دوای ئەوەی فەرهـــاد کەوتە زیندان و دوای چەندین ســـاڵ ئازاد کرا و لە ڕاپەڕین بوو بە پێشـــمەرگە لای کاک (شـــاخەوان عەباس) کە خزمایەتیان هەبوو. بەڵام لە کۆچ ڕەوەکە لە شەڕەکەی کۆڕێ بوو گیانی لە دەست دا.

هەر لە ساڵی ١٩٨٣ یەک لە برادەرە نزیکەکانم ((قەرۆ)) کە پێشتر باســـم کردووە لە بەرەی شەڕی ئێران عێراق کوژرا و هەر لە هەمان ساڵ (نورەدیـــن) ی خاڵـــی مناڵەکانم کە ژن بە ژنـــم لەگەڵ کردبوو بە هۆی ڕووداوی هاتووچۆ گیانی لەدەست دا..

لە ســـاڵی ١٩٨٣ شەڕی براکوژی گەیشـــتە ڕۆپەی و تا کار گەیشتە ئەوەی شەڕی قرناقە و پشـــت ئاشانی لێ بکەوێتەوە و بارەگا سەرەکی یەکانی بەرەی (جود) لە لایەن یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان لە زنجیرە چیـــای قەندیل بگیرێن، بەو پێ یە شـــەڕی براکوژی چـــووە قۆناغێکی ترسناکتر.

لە بەرەکانی شەڕی (ئێران-عێراق)یش سوپای عێراق گورزی کاریگەری بەرکەوتبوو شـــوێنەکانی کە لە سەرەتای شەڕ لەناو خاکی ئێران داگیری کردبوون لە دەســـتی دابوو جگە لەمەش سوپای ئێران لە چەند شوێنێک هەوڵـــی دەدا بێتە ناو خاکـــی عێراق و لە هەندێ شـــوێنیش هاتبوونە ناوەوە..

جگە لە شـــەڕی بەرەی جووت یەکێتی تووشـــی شەڕێکی تریش بوو لەگەڵ ماڵی (ئەنوەر بەگی بێتواتە) هەرکاتێک یەکێتی شوێنێکی لە ڕژێم

ئازادبکردابایە ئەوان بەهۆی شـــارەزایی وخەڵکی ناوچەکە شـــوێنەکەیان دەگرتەوە. بەو شـــێوەیە دەبوایە یەکێتـــی تەقەلایەک بدا زەبرێک لەوانە بـــدا ئەگەر تا لـــە ناوچەکە بەتایبەتی ناوچەی بیتوێن ودۆڵی بالیســـان نەیدەتوانی جموجۆڵ بکاو گەشـــەی تیا بکا. لەمانگی تشـــرینی یەکەم یەکێتـــی هێزەکانـــی کۆکردەوەو لـــە ماوەیەکی کـــەم بێتواتە وناوچەی بیتوێنی ئازادکرد. ئەو شەڕە بۆ یەکێتی وەرچەرخانێک بوو بۆ باشتربوون وبەهێزبوونیان ودوایەش گفتوگۆی ئەوان ورژێمی بەدواداهات..

لە ڕێـــگای ڕێکخســـتنەکانەوە ئاگادارکراینەوە کـــە دەبێ بەتانی بۆ پێشـــمەرگە لە ناو شـــار کۆبکەینەوە. بڕیاری ئەوســـاکەش دەبوا جێ بەجـــێ بکرابایە. ئەوکات بیروباوەڕ وپرەنســـیپ ئەوەندە لەجێ ی خۆی دابـــوو تۆ مل کەچی هەموو فەرمانەکانی ســـەرەوە دەبووی. کە هەواڵی ئەوەیـــان پێدام تا بەتانی کۆبکەینەوە لە دووەم ڕۆژی پرســـەی خواڵێ خـــۆش بوو (نورەدیـــن)ی خاڵی مناڵەکانم بـــووم. دوای نیوەڕۆیەک لە پرســـەکە هاتمە دەرەوە وپەیوەندیم بە کاک (سەردار محەمەد عەبدولا) کرد، بەیەکەوە چەند ماڵێکمـــان کرد وچەند بەتانیەکمان پەیدا کرد، لە هەمووی ســـەیرتر کاک (ســـەردار) منی بردە ماڵێک لە گەڕەکی شۆڕش کە زەنگی دەرگای لێدا (ســـکرتێری پارێزگار) دەرگای لێ کردینەوە کە ناوی (شـــێردڵ خورشید) بوو شارستان بوو، سەردار بە تورکی لەگەڵی دوا. لە ســـەرەتاوە وام زانی سەردار هەر بۆ پشوودان وچای خواردنەوە لای داوەتە ئەو ماڵە..

کەچی یەکسەر داوای بەتانی لێ کرد، دیاربوو پێشتر پێ ی گوتبوو. مـــن زۆر نیگەران بووم ویـــەک دووجار چاوم لە ســـەردار چوقاند بەڵام گوێی نەدایە ئاماژەکانی من. پێم وابوو ســـەردار گاڵتە دەکا. ئاخر ئەوە سکرتێری پارێزگارە. دوایەش هەر بە تورکمانی قسەدەکەن شارستانەکان یان وەک ئێمەی هەولێری دەمانگوت (هەولێریەکان) کەم خۆیان لە قەرەی شۆڕش وخەبات وشتی مەترسیدار دەدا. کە شێردڵ چووە ژوورەکەی تر بۆئەوەی بەتانیەکەمان بۆ بێنێ بە سەردارم گوت (ئەوە شێت بووی. خوا شێتی کردی. دەتەوەێ ســـەرمان لە قوڕ ڕاکەی..؟) ئەویش بە ئاسایی

زەردەخەنەیەکی کرد ووتی (گویٚ مەدیٚ جانم.) دوایە بۆم بە دیار کەوت کە (شــێردڵ خورشــید) برایەکی لە ریزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێشــمەرگەیە وســکرتاریەتەکەی وەک هۆبە نهێنی یەکەی منە وئەویش وەک خۆم ڕوبع باویە وبەعســیش نی یە. هەر شــتێکمان دەکرد سەردار دەیگوت (کوڕە هەر گوێش مەدیٚ.. ). یەکێتی نیشــتمانی کوردســتان شەڕی لەگەڵ زەوی وئاسمان کرد. ئەوساکە ئەو شەڕانەمان بە پارێزگاری وبەرگــری کردن لە بوون وقەوارەی خۆی دەزانی. پێمان وابوو لایەنەکان شــەڕ بە یەکێتی دەفرۆشــن. تەنانەت جاش ومەفرەزە تایبەتی یەکانی ئیستخبارات ئەوانیش زیاتر رقیان لە یەکێتی دەبووەوە. پڕۆپاگەندەی زۆر توندو تیژ بەرانبەر بە یەکێتی دەکرا، گوایە لە شەڕەکاندا چەکی ڕژێمیان بۆ چووە. لە کۆتایی ســاڵی ١٩٨٣ دەنگ وباسی گفتەگۆی نێوان ڕژێم و یەکێتی بڵاوبووەوە، دوایەش لە ڕێگای ڕێکخستن ئەو پڕۆپاگەندانە پشت راست کرانەوە ولە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ لە هەندیٚ کەناڵدا بەشێوەیەکی ئاشــکرا باس لەو گفتوگۆیە کرا ومام جەلال سەردانی بەغدای کرد. ئەو گفتوگۆیە پشوویەک بوو بۆ پێشمەرگە وبۆ ڕێکخستنەکان. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٣ ئێمە وەک پۆلێک ڕێک خراین من لێپرسراوی شانە وئەندام پۆل بووم دوو برادەری تریش لە یەکەم کۆبوونەوەی پۆل یەکترمان ناسی یەکێکیان کاک (موحســین ئیبراهیم حەســەن) برای (مەولود ئیبراهیم حەسەن) بوو کە فەرمانبەر بوو لە تەندروستی هەولێر وکوڕێکی بە توانا بوو لە ڕووی فکرەوە ماڵیان لە گەڕەکی (کووران) بوو. ئەوی تریان کاک (نوری عومەر) بوو فەرمانبەر بوو لە ئەمانەتی گشتی شارەوانی وگەشت و گوزار بەرپرســی هۆبەی یاسایی بوو خەڵکی شاری سلێمانی بوو ماڵی لە خانووەکانی (ئەمیندارە گشتی یەکان) بوو بە تەمەن لە ئێمە گەورەتر بوو. لەبەرئەوەی خانووەکەی ئەو زۆر فراوان بوو سەیارەشــی هەبوو کە بەتانیەکانمانم کۆکردەوە بردمانە ماڵی ئەوان ولەوێش ســەیارەیەک هات بەتانیەکانی برد. وابزانم هەر هەمان شــەو بەتانیەکان گەیاندرایە شوێنی مەبەســت. مامۆســتا (مەغدید هەمزە) سەرپەرشتی ئەو پۆلەی دەکرد.

ئەو دوو برادەرە دوو کوڕی تێکۆشـــەرو دڵســـۆز بوون بەڵام لەبەرئەوەی کاک نوری عومەر خەڵکی هەولێر نەبوو بۆیە لە شـــانەکەی وابزانم تەنیا کەســـێکی لابوو دوایە ئێمە چەند کەسـێکمان پێ ی ناساند یەک لەوانە قاسم شێروانی بوو. لە دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی گفتوگۆی نێوان ڕژێم ویەکێتی زیاتر ڕێکخستنەکان تەکانیان داو خەڵک زیاتر لە ڕێکخستنەکان نزیک بوونەوە. دیارە دڕندایەتی ڕژێم وای کردووە لەکاتی گفتوگۆ وباری ئاســـایی خەڵکانێک لە ڕێکخســـتن نزیک ببنەوە کە پێشـــتر لە ترسان نەدەوێران. خۆ هەموو کەســـیش لەو ســـەردەمە نەدەوێرا بە ئاســـایی گەردنی لە چەقۆ بخشـــێنێ. ئەوە ڕژێمـــی بەعس بوو بەزەیی نەدەزانی. هەرچەندە گفتوگۆ پشـــووبوو. ڕێکخستنەکان فراوانتربوون بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ترس لە ڕژێم کەمتربووبو. وە موناقەشە وشەرە قسە لەنێوان هەڤاڵانی یەکێتی ولایەنەکانی تر زیاتر بوو. لەبەرئەوەی ڕێکخســـتنەکان لە پێشـــتر زیاترو بەزەقی تـــر کۆبوونەوەی فراوانتـــر کاریان دەکردو دەجووڵانەوە، لەبەرئەوەی ســـەردانی ناو هێزی پێشمەرگە زیاتر لەلایەن هەڤاڵانی ڕێکخســـتن ئەنجام دەدرا ئەو حاڵەتە بووە هۆی ئەوەی لەدوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ بەشـــێک لە هەڤاڵانمـــان بخرێنە ژێر چاودێری و دوایـــەش ڕاوەدوونانیـــان وگرتنیان وهەربۆیەش لـــەدوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ. ڕێکخستنەکان گورزی کوشندە ویەک لەدوای یەکیان بەرکەوت.

* * *

کەماڵەکەم لەشوقەکانی ئیسکان بار کردوچوومە شوقەکانی زانیاری پێم وابوو لەشارێکەوە چوومەتە شـــارێکی تر. ئاسیاوو خزمانم زیاتر لە کووران بوون خۆشم زۆر لە کووران، ژیابووم بۆیە ئەولایەم پێ خۆشتربوو کەچی بەداخەوە ئێمە هیچ خۆشـــیمان لەوشـــوقەیە نەدی.. . تەنانەت دراوسێکانیش وەک دراوسێکانی شـــوقەی ئیسکان نەبوون، شوقەیەکی تەنیشـــتم (رفیق حزبی)ێکی چەکداری دڵسۆزی حزبی بەعس بوو ناوی (ڕەســـول) بوو بە ئەســـڵ خەڵکی شـــارۆچکەی پردێ بوو هەتا بڵێ ی دڵسۆز بوو بۆبەعس وئامادەبوو سەری باوکی خۆی لەقوڕنێ بۆ پارەوپلە

ئافەرینێکی بەرپرسـەکەی.. یەک لەو رەفیق حزبیانەبوو کەبەشـداری لە گولله باران کردنی ئەو سـەربازەکوردانەکرد لەناوسەربازگەی هەولێر کەلەسـەربازی رایـان کردبوو لەبەر ئەوەی پیاوێکی ترسـنۆک بوو ئەو کارەشـیان پێ ئەنجامدابوو، ئـەو ئێوارەیەی لە گوللەبـاران کردنەکە دەگەرێتـەوە بە لەرزە لـەرز خۆی دەخزێنێتە نـاو پێخەف تا دوو رۆژ نایەتە دەرەوە، دوایە (هەدیە)ی خێزانی ئەو قسـەیەی لای دراوسێکان بـاس کردبوو کە چۆن بە لێوەلەرزە خـۆی خزاندۆتە ناو جێگا... زۆرم پێ ناخۆشبوو کەچەند جار(ناسیاوێکی گونی قورشاغلو) م دەدی لەگەل چەند (الجیش الشعبی)یەک بەچەکوجلی زەیتوونیەوە دەهاتنە مالّیان بۆ ئەرکـی راوەدوونانی خەلّک گرتن دەردەچوون تابەزۆر بیانگرن وڕەوانەی بەرەکانی شـەڕین بکەن.. مالّێکی تر لەبالّەخانەکەی بەرانبەرمان هەبوو ناوی (ئەبو فارس)بـوو بەناو کرێکاربوو لە فەرمانگەیەک بەلاّم (ئەمن) بوو ئامۆزاو پورزاو برایەکی لە ئەمنی هەولێر بوون، خەلّکی لای (گوێر) بـوون، تەنانەت رقـی لە بەرگی کوردیش دەبـووەوە نەک کورد خۆی. بەرلەوەی من بگیرێم ئەو پیاوە بەهۆی نەخۆشی کۆچی دوایی کرد. جگە لەو ئەمنەی کە پێشتر باسم کرد کە لەناو پاسەکە تووشم بوو. نزیکترین دراوسـێ کە دەرگامان بەرانبەریەک بوو مالّی (سەید کەریم) بوو. سەید کەریم بە پیاوێکی شـێتۆکە لە هەولێر ناسرابوو، چەندین مەتر قوماشی لە تەنگەو سـەری خۆی دەئالاّند وهایوهووی پێ دەکرد وسوالّی دەکرد. بە رواڵەت وەک شێت ودێوانە وهەندێک جار وەک پیاوێکی نوورانی خۆی پیشـان دەدا. بەلاّم لەژێرەوە کابرایەکی فێلّ بازبوو. ژنێکی سـەقەتی هەبوو، ئەو ژنە کچی پیرەژنێکی کوردستانی ئێران بوو بەناوی (ئایشە). ئایشـە وەک لە سـەید کەریمان بیستبوو، شـووی زۆری کردبوو واتە دواجار مێردی بە (سـەعیدە دۆم) کردبوو کە باوکی (جەلال سەعید)ی گۆرانی بێژبوو. ئەوانیش واتە (ئایشـە) و(سەعیدە دۆم) کە بەو دوایی یە سـەردانی کابە ومالّی خواشـی کرد بەیەکەوە لەگەڵ سـەید کەریم دەژیان. حاجی سەعید پیاوێکی دڵساف ودەست بڵاوبوو. لەهەموو شتە

خراپەکانـــی ئەوەبوو کە مودمین بوو لەســـەر خواردنـــەوەو بەو تەمەنە گەورەیە گەلێ شەو بە سەرخۆشی دەگەڕایەوە. تا ئەو کاتەی چووە حەج وابزانم وازی لە خواردنەوە هێنا..

ئەو ماڵە سروشتێکی تایبەتیان هەبوو. بەردەوام دەرگایان ئاوەڵابوو. بـــەردەوام گاڵە وقیرە قیریان گوێ ی دونیای کاس دەکرد، بەردەوام بە هەراو هۆریان بوون. حاجی ســـەعید زۆرجار لەبـــەردەرگای باڵەخانەکە مەقەرەیەکی پڕلە خەڵووزی دادەنا وگون وگوان وسپلی ئاژەڵی لە شیش دەدا و ئەو بۆن ودووکەڵەی بڵاودەکردەوە ومناڵ دەوریان لێ دەدا ئەویش نیوەی بەخۆی دەیخوارد کە کابرایەکی نەوسن بوو نیوەشی دەفرۆشتەوەو ســـەر وبەر دەردەهات. سروشتی سەعیدە دۆم وسەید کەریم زۆر لەیەک جیاوازبوون بۆیە هەر لەشـــەڕ ودەوە دەودا بوون... ڕۆژێکیان ئایشە زۆر جوێنی بە ســـەید کەریم دا، منیش گوتم (ســـەید ئەوە چیت کردووە وا ئایشـــە ئەو هەمـــوو جوێنەت پێ دەدا..؟) ووتـــی (بەخودای هیچم پێ نەگۆتـــی یە هەر ئەوەنـــدە دەرێم ئەتو دۆمە ئەســـلی یەکانی . ئێ خۆ نەمگۆتی یە دۆمە خراپەکان..) لەگەڵ ئەو قسەیەش هێواش هێواش پێ دەکەنی. برادەر وناســـیاو دەیانزانی سەید کەریم دراوسێ ی منە زۆرجار بە گاڵتە هەواڵی منیان لێ دەپرسی. سەید کەریم باخچەیەکی لە قامیش دروســـت کردبوو بە ئاوی تانکی ئاوی دەدا. ئێمەش شـــەش ماڵ تانکی یەکانمان بەیەکەوە بوون بەهۆی ئەوەی ســـەید کەریم قامیشـــەکانی بەو ئـــاوە ئاو دەدا زۆرجار بێ ئاو دەماینەوە. ڕۆژێکیان ئێوارە بوو بەتەمای خۆشووشـــتن بووم کە ســـەیرم کرد ئاو نایە وتانکی یەکان بەتاڵ بوونە لەولاش دیتم سەید کەریم باخچەکەی هەموو ئاوداوە وسۆندەکەی هێشتا کراوەتەوە. ناچاربووم بچمە گیانی ولەبەرئەوەی ماوەیەک بوو زۆر لێ ی بێ تاقەت بووبووم قورگم گرت وپێم گوت (سەگی سەگ باب جارەکی تر ئەو ئـــاوەی بەردەیەوە وەعدبی بتخنکێنم) ئاوەکەی ئەوانم لە قوفلەکەی گرتەوە ئەویش خۆی لە چنگم ڕاپســـکاند وچووە ســـەر شەقامی گشتی کە دەکاتە شـــەقامی شەست مەتری و دەستی بە هاوار هاوار کرد (ئەی

هاوار خەرکینە ســـەعدی دەمکوژی) من هەر زوو لە جوێنەکە پەشـــیمان بوومەوە چونکە من ئەگەر زۆر ناچار نەکرێم ڕەوشتم وایە جوێن بە دەوم دانایە. ئەوەندەی سەعید ودراوسێکان هەوڵیان دا بێ دەنگی بکەن بەڵام بێ ســـوودبوو. من نیگەران بووم لـــە جوێنەکەم چونکە لە منالّییەوە وا پەروەردە کرابووین کە جوێندان بە (ســـەید) کە وەک نەوەی پێغەمبەر ناســـراون شـــتێکی باش نی یە بەتایبەتی کە باوکی ســـەید کەریم وەک باســـیان دەکرد پیاوێکی باش ولەخوا ترس بووە. (سەید تەها)ی براشی لە مەنتکاوە دراوســـێ ی خزمەکانی من بوو بەڵام لە ســـەید کەریم بێ بەری بوو. ئیتر ســـەید کەریم تا نیوەی شـــەو لەسەر شەقامی شەست مەتری لەبەرانبەر ماڵەکەی خۆیان شـــیرو زەرگەکانی هەڵتەکاند وهاواری کـــرد هەر دەیگوت (ئەگەر عوکمەت عەقم نەکا دەبی جدی باب وباپیرم عەقم بکا..) ئەوســـاکە زانیم من بەڕاســـتی دارم لە کونی زەنگە سوورە وەرداوە. ســـەید کەریم هەربەوە نەوەســـتا پێش نیـــوەڕۆی ڕۆژی دوایی بەخۆی وشـــیر وزەرگ و دە مەتر قوماشـــی ســـەوزی سەرشان وپشتی هاتە پێش پارێزگا وبە دەستێک شـــیرەکەو بە دەستێکیش زەرگەکەی، دەســـتی بە هاوار هاوار کرد، دەیگـــوت (موتەصەریف معافیز لێم وەرە دەرێ وەرە عەقم بســـتینە سەعدی والەکنە تووە دەیەوێ بم خنکێنی..) هەر سەیارەیەک دەهات بە غاردان بۆی دەچوو بە های وهو دەگەڕایەوە. ئەوە کابرایە تا ســـەعات یەک لە شـــوێنی خۆی لە هاوار هاوار نەکەوت. هەندێک جار پۆلیســـەکانی بەردەرگا لـــێ ی کۆدەبوونەوە وهەندێک جار چەند کەســـێک لە خەڵکی شەقام هەڵوێستەیەکیان لەلا دەکرد وئەویش باســـی شـــەڕی مەغلوبەی دەکرد کە چۆن هێرشـــم کردۆتە سەر وچۆن قورگـــم گرتووە وچۆن جوێنم پێ ی داوە. ناچاربووم نیوەڕۆ چوومە لای سکرتێری پارێزگار و تێم گەیاند کە ئەو کابرایە ئەو هەرایەی لەگەڵ منە مەسەلەکەش بەو شێوەیە. پارێزگار ئەوساکە (یەحیا جاف) بوو بڕیاری دا کەبیخەنە زیندان. ئەو ڕۆژە تا نوێژی عیشـــا سەید کەریمیان زیندانی کرد. کە دوای دەوام گەڕامەوە بە ماڵی (ســـەید کەریم)م گوت کە سەید کەریم لە زیندانە لەســـەر ئەو هەرا وهۆریایـــەی کە کردوویەتی. دیاربوو

ســـەعیدە دۆم زۆری پێ خۆش بوو. دوای عیشا هاتەوە ماڵەوە بەڵام کڕ وبێ دەنگ وهیچ قسەی نەکرد. بەیانی کە قسەم لەگەڵ کرد زۆر ئاسایی بوو زوو چاک بووینـــەوە بەڵام ئەوجارە زۆر کەم ئاوی بەفیڕۆ دەدا.

حاجی سەعید، خوێندەواری نەبوو بەڵام نووشتە وناو لەپ خوێندنەوەی دەکرد وزۆرجار خوێنـــدەواری زانکۆمان دەدی کوڕ وکچ دەهاتنە لای بۆ نووشـــتەی خۆشەویستی وشـــتی تر. من زۆر بەو کارە دڵتەنگ دەبووم، چونکـــە دەمزانی ئەو پیاوە چەند شـــەوان بە سەرخۆشـــی گەڕاوەتەوە ماڵەوە وئەو کابرایە چەند دواکەوتـــووە کەچی خەڵکی خوێندەوار وەک خوێنـــدکاری زانکۆ بێنە لای ونووشـــتەی پێ بکـــەن. زۆرجار دەمگوت گوناهە پیاو بۆ ئەو جۆرە خەڵکە خەبات وتێکۆشـــان بکا وخۆی تووشی هەڵدێری هەزار بە هەزار بکا. خۆ ئەو پیاوە لە دەروون ناسی وپزیشکی و پاراســـایکۆلۆژی هیچ نازانێ، بەڕاســـتی شتەکەم لا ســـەیر بوو. حاجی سەعید بەرانبەر سەید کەریم پشوویەکی زۆر درێژ وسنگێکی زۆر فراوانی هەبوو. زۆر ئایشەی خێزانی خۆش دەویست کە پێ یان دەگوت (ئایشە شیلان) هەرجارێک کە کاک (جەلال سەعید) لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەربکەوتایە (ئایشە شیلان) دەهاتە دەرگاو دەستێکی جگەرەی پێ بوو دەستەکەی تری هەڵدەشەقاندو دەیگوت (تەلەفزیۆنەکە بکەنەوە جەلالی ئێمەیـــە..) زۆرجار تا ئێمە تەلەفزیۆنەکەمان دەکردەوە یان کەناڵەکەمان دەگۆڕی فریا نەدەکەوتین و گۆرانی یەکە تەواو دەبوو. ڕەحمەت لە گۆڕی حاجی سەعید کە پیاوێکی بێ وەی بوو دڵ فراوان و لەسەرخۆ بوو..

**- من و تیپی نواندنی کرمانج**

لە کۆتایی بەهاری ســـاڵی ١٩٨٢ کۆمەڵێ گەنجی گەڕەکی (کووران) داوایـــان لێ کردم کە سەرپەرشـــتی تیپێکی نوانـــدن بکەم کە بڕیارە لە (بنکەی لاوانی کووران) دروســـتی بکەن. ئـــەو گەنجانە لە ڕێگای کاک (ئەرســـەلان ســـابیر هێلەوەیی) کە ئەوســـاکە خوێندکاری ناوەندی بوو دەنگ وباســـی ئەوەیان پێ گەیشـــتبوو کە من زۆر شەیدای شانۆم و لە نووسینی دەقی شانۆ شارەزاییم هەیە، بەڵام هیچ شارەزاییم لە دەرهێنان نەبوو. بنکەی لاوان کە ڕژێمی بەعس لە چەند گەڕەکێکی مللی شارەکان

دروســـتی کردبوو بـــۆ لاوەکان و کۆکردنەوەیانو هاندانیـــان بۆ هونەرو وەرزش کە شــتێکی چاک بوو. هەرچەندە ڕژێم ئەوکاتی ئەگەر شــتێکی باشیشـــی بکردابایـــە ئێمە هەر بە خراپ لە قەڵەممـــان دەدا. زۆربەمان پێمان وابـــوو ئەو بنکانە بۆئەوەیە کە لاوەکان بـــۆ فێربوونی بەرنامەی بەعس هاندەدا، لە ڕاســـتیش دا دوای ئەوەی خـــۆم چوومە ئەو بنکەیە وانەبوو. هیچ ڕێنمایی وئامۆژگاریەکی بەعسیانەی تیانەبوو. لەسەرەتاوە من پێم نەنگ بوو پێم شـــەرم بوو. تەنانەت لە دیواری ئەو بنکانە نزیک ببمەوە کە بە قوتابخانەیەکی بەعســـیم دەهاتـــە بەرچاو. بەتایبەتی ئەو سەردەم من ئەندام پۆل بووم لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرەدانی کوردســـتان، بەڵام ســـووربوون و پێداگرتنی ئەو گەنجانە وبیرکردنەوەی خۆم کە شـــتێکی بە دڵی خۆم بنووســـم وای کرد مل بۆ داواکەیان کەچ بکـــەم وتیپێکی نواندن بەنـــاوی (تیپی نواندنی کرمانـــج) دابمەزرێنم. شـــانۆگەریەکم بەناوی (ژانی گوندەکەمان) نووسیەوە کە بەڕاستی دوای نیشـــاندانی ئەوەندە نـــاوی دەرکرد کە خۆم لـــەو باوەڕەدانەبووم. ژانی گوندەکەمـــان گوزارشـــتی لە ژان ومەینەتی یەکانـــی گوندێک دەکرد کە دووبەرەکی خەریک بوو ئەو گونـــدەی وێران دەکرد. بەتایبەتی کوێخواو دەست ڕۆیشـــتووی گوندەکە ڕۆڵی سەرەکیان دەبینی لە دروست کردنی دووبەرەکی وئاژاوەنانەوە لە نێوان دانیشتوانی گوندەکە، بەوەی هەر ڕۆژەی لـــە ڕێگای پیاوەکانی دزی لە گەڕەکێک دەکرد وبۆ بەیانی پڕۆپاگەندەی دەکرد گوایە خەڵکـــی گەڕەکەکەی تر دزیان لەو گەڕەکە کردووە.. ئیتر دەمە دەم وشـــەڕ وئاژاوە بەردەوام دەبێ، تا کار دەگاتە ئەوەی دزی لە بەڕاوگەی ماڵە ڕۆشـــنبیرەکان بکرێ کە کتێبخانەیان لە ماڵەوە هەبووە. ئـــەو گێژاوەیە بەردەوام دەبێ تا ڕۆژێک دزەکان دەگیرێن ودەبینن پیاوی کێخوان وهەموو شت ئاشکرا دەبێ وئیتر هەردوو گەڕەک ئاشت دەبنەوەو کێخواش شەرمەزار دەکەن. لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کەپیاوەکانی کێخوا ئەوانەی لەسەر دزی دەستگیر دەکرێن گەنجی دانیشتوانی ئەودوو گەڕەکەبوون فریودرابوون و باوکیان پێیان شـــەرمەزار دەبێ.. .. دیارە مەبەستم لەو نووســـینە بارودۆخی ئەوسای شۆرشی کورد بووە، چونکە

له گەرمە گەرمی شــەڕی برا کوژی ئەو دەقە شــانۆیی یەم نووسیوە..
هــەر چەندە من هیچ شــارەزایی یەکم لە دەرهێنــان نەبوو تەنانەت ڕۆژێکیــش لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان دەوامم نەکردووە بە ناچاری ملم بۆ داواکانی گەنجەکان کەچ کرد وجگە لە نووســینی دەقەکە دەستم بە دەرهێنانی کرد بەو بەهرە خۆڕسکەی کەخۆم هەمبوو دوور لە هونەری دەرهێنــان. جگە لەوەی کە خۆم یەکەم جارم بوو بچمە ســەر تەختەی شــانۆ وەک دەرهێنەر، ئەکتەرەکانیش یەکەم جاریان بوو دەچوونە سەر تەختەی شانۆ. هەربۆیە ماوەیەکی زۆر پرۆڤەمان کرد ولە کۆتایی مانگی ئەیلــول لە دهۆک بەشــداریمان لە ڤیســتیڤاڵی شــانۆی بنکەی لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمــی کرد وکارەکەمان بە ســەرکەوتوویی ئەنجام دا. لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ ئەو شانۆگەریە لە هۆڵی ڕۆشنبیری بۆمــاوەی ٣ ڕۆژ نیشــاندرا هیچ ڕۆژێک هۆڵەکە جێگای تەماشــاکەرانی نەدەبــووەوە. یەک لــە هۆیەکانی ئەوە بوو شــانۆگەریەکە جگە لەوەی بەشــێوەیەکی کۆمیدی هادف نووسرابووەوە ڕاستەوخۆش گوزارشتی لە واقعی ئەوسای کوردستانی دەکرد. هەڵبەتە ئەوکات هەستی نەتەوایەتی لە هەڵچوون وجۆش وخرۆش دابوو. زۆرکەس قەناعەتیان وابوو کە دوای تەواوکردنی شــانۆگەریەکە ئێمە یەکسەر ڕاپێچی دایەرەی ئەمنی هەولێر دەکرێین. هەر دوای ئەو شــانۆگەریە چەند شانۆگەریەکی ترم نووسیەوە بەلام مۆڵەتیان بە هیچیان نەدا بەتایبەتی شــانۆگەری (ڕێبوار) لەدوای ئەوەی ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕی ووەلامیان نەدایەوە ڕۆژێک من و چەند برادەرێک لەبەر دەرگای هۆڵی ڕۆشــنبیری تووشی کاک (سەعدون یونــس)ی هونەرمەند بووین کە ئەوســاکە ئەندامی لیژنەی مۆڵەتی دەق بوو. لێمان پرســی کە بۆ مۆڵەتمان پێ نادەن. وتی:- (تێت ناگەم تۆ مەبەســتت لە نووسینەکە چی یە..؟) منیش پێم وت (ئاخر چۆن دەبێ من مەبەســتی خۆمت پــێ بڵێم.. تۆ هونەرمەندی دەبێ لە مەبەســتی نووســینەکەم بگەی..) زۆر بە توندی وەلامی دامــەوەو وتی:- (کاکە چــۆن دەبێ تۆ کرێچی بی و جوێن بە خاوەن خانوو بدەی..) ئیتر ئەوە پێچەوانەی قســەی یەکەمی بوو کە وتی من لە مەبەســتت ناگەم. زانیم

شانۆگەری یەکەی باش خوێندۆتەوە. ئەو کات (کەریم عەزیز حاجی) واتە کەریم مەرەگە لە تەکمەوە وەستابوو دیار بوو دەمارەکانی جووت بووبوون. وتی:- (کاکە ســەعدون بە شەرەفت ئەمە کرێچین..؟) ئەویش دوو جار ســەری لەقاند و بە هەمان رِتم وتی:- (ئا کرێچین..!) ئیتر تێ گەیشتم من هەر شــانۆگەری یەک بنووســم مۆڵەتم پێ نادەن و هەر واش بوو..

دوای ئەم شــانۆگەری یە شــانۆگەری (شەمە و شەماڵ) م بۆ ناردن رەزامەندیان لەســەر ئەویش نەدا. ئەو جارەیان ناچار بووین شانۆگەری یەکی بڵاوکراوەی چیرۆک نووســی مامۆستا (حوســێن عارف) بەناوی (پێکەنین بە پێ ی یاســا) بۆیان رەوانە بکەین و مۆڵەتیان پێ داین و ئەو شانۆگەری یەمان پێشکەش کرد.

دوای ئەوە من بەرپرسیاری یەتی حزبایەتیم گەورەتر بوو جگە لەوەی ماوە ماوە تووشی خۆ حەشاردان دەبووم بۆیە نەمتوانی لەو کارە هونەری یانە بەردەوام بم و لە کۆتایش دا بە دەســتگیر کردنم لە لایەن رژێم بە تەواوەتــی لــە هونەر دابرِام.. لە دوای من کاک (موحســـین محمەد) لە تیپەکە بەردەوام بوو. وابزانم ئەو برادەرەش یەکەم جار شــانۆگەریەکی منالأنی پێشــکەش کرد. کاک موحســین لە شــانۆ و لە هونەری شانۆ زۆر لە من شــارەزا تر بوو، بەڵام ئەو دەرفەتەی بۆ من رەخســا بۆ ئەو نەرەخســا، بۆیە دوای ماوەیەکی کەم ئەویش دەستبەرداری تیپەکە بوو ئیتر هەڵوەشــایەوە. لە خوارەوە ناوی ئەو گەنجانە دەنووسمەوە کە لەو تیپە وەک ئەندام بەشدار بوون:-

١- عبدالكريم عزيز حاجی- کەریم مەرەگە
٢- يوسف صالح سمێر
٣- جعفر عزيز حاجی-جعفر مەرەگە
٤- ارسلان صابر هێلاوەیی
٥- گەیلان پیرباڵ- گەیلان خەتات
٦- محمد عمر
٧- کامەران علی
٨- عبدالصمد عمر

٩-سعدی اکرم
١٠- غازی صابر هێلاوەیی
١١- کاکە جلال حمد
١٢- عبدالرحمن معروف
١٣- دڵشاد اکرم حسن
١٤- احمد عباس محی الدین
١٥- پوشۆ خدر نادر- پوشۆ قەساب
١٦- دڵشاد عبدالرحمن عبدالله
١٧- سید احمد محمد
١٨- جوهر انور شێخە
١٩- محمد عباس محی الدین
٢٠- گەیلان خدر نادر
٢١- فرهاد حسین قادر
٢٢- یاسین مصطفی احمد
٢٣- کمال صابر مصطفی
٢٤- عثمان عمر
٢٥- روستم ابراهیم
٢٦- عبدالخالق جبار مولود
٢٧- خطاب حامد کاروانی



نووسەر لە کاتی تەواو بوونی شانۆگەری (ژانی گوندەکەمان)



دیمەنێک لە شانۆگەری (ژانی گوندەکەمان)

## * کۆنفراسی سێی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان: -

وەک وتــم گفتوگۆی نێوان ڕژێم و یەکێتی پشــوویەک و تەکانێکیش بوو بۆ پێشمەرگە و ڕێکخستنە نهێنی یەکان. لە ماوەی ئەو ساڵە هێزی پێشمەرگە بارەگاکانی بە ئاشکرا بە شێوەیەکی کاتی هێنایە گوندەکانی نزیک شــار وەک بەحرکە و مورتکە و چەند شــوێنێکی تر و خەڵک زۆر پەیوەندیان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســتان پێشتر لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ دوو کۆنفراســی گرتبوو بە دەرفەت زانرا لە کاتی وەستانی شەڕدا کۆنفراسی خۆی ببەستێ. بە تایبەتی چەند کێشەیەک لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستن و هێزی پێشــمەرگە مقۆ مقۆی عێراقچی و داش عێراقی دروست وەک دوو دیــدەی جیاو دوو بیر کردنەوەی جیا ســەری هەڵدابوو، پێویســتی بە چارەســەری هەبوو. دیارە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســتان لە ســەدا حەفتای پێکهاتەی یەکێتی پێک دەهێنا. من تا ئەوساکەش لە (مامۆستا مەغدید) زیاتر لە ســەروی خۆم کەســم نەدەناســی. ئەو سەرکردانەی کۆمەڵــەو یەکێتیم بە مام جەلالەوە نەدیبــوو. کە هەواڵیان پێ دام من ئەندامــی کۆنفراســم زۆر دڵم خــۆش بوو. بەڵام من لــە وەزیفەکەم لە شوێنێکی زۆر هەستیار بووم چۆن بچمە کۆنفراس و چۆن هەست بە شتێ نەکــەن..؟ لە ماڵەوەش دەبوا چارەســەرێک بدۆزمەوە چونکە بە تەنیا بوون پێویستی دەکرد خۆی و مناڵەکانی کە ئەوساکە کچێکی ترمان زیاد کردبوو ناومان نابوو (هێرۆ) واتە هاوســەرەکەم و چوار مناڵ..باشترین شوێنیش کە ئەو چەند ڕۆژە تیایدا بحەوێتەوە ماڵی باوکیەتی..ڕێکەوتین کە لەوێ بێ و پێ یان بڵێ (ســەعدی ســەفەری بەغدای کردووە خولی ڕاهێنانــی هەیە) هەر بۆ ئەوەی لە فەرمانگە گومانم لێ نەکەن کاتەکەش وابوو ڕۆژی شــەممە ڕێکەوتی (١٤) ی تەمووزی دەکرد کە پشــوو بوو من مۆڵەتی یەکشــەم و دووشەمم وەرگرت کە دەکاتە ڕۆژانی ١٥-١٦ی

ئەمووز ڕۆژی سێ شەم ((١٧))ی تەمووز بوو ئەویش پشوو بوو. لەبەر ئـــەوەی نەمدەزانی ڕۆژانی کۆنفـــراس چەند دەخایەنێ بۆیە وەک یەدەگ دوو ڕۆژی ترم مۆڵەت نووسی بۆ ڕۆژانی چوارشەممە و پێنج شەممە کە دەیکـــردە ڕێکەوتی ١٨-١٩ تەمـــووز و داواکاری یەکەم لای کاک (بەکر گەردی) دانا. پێم وت:- (من ســـەفەرێکی بەغدام هەیە نەوەک نەتوانم بـــۆ ((١٨))ی مانـــگ بگەڕێمەوە، ئەگەر نەگەڕامەوە تـــۆ ئەو مۆڵەتەم بۆ پێشـــکەش بکە..) ئێســـتاش کاک بەکر گەردی نەیزانی من سەفەری بەغدام نەکردووە..! دوایە بۆچوونەکەم ڕاست دەرچوو نەمتوانی لەو ڕۆژە بگەڕێمـــەوە و کاک بەکر مۆڵەتەکەی بۆ وەرگرتبووم. لە ســـەرکردایەتی کۆمەڵە لەبەر خەڵکی ناو شـــار کاتێکی باشیان هەڵبژاردبوو کە لە ڕۆژی هەینی دەستی پێ دەکردو حەفتەکەش دوو پشووی تیا بوو.

ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٤/٦/١٢ لەگەڵ مامۆستا مەغدید هەمزە کاتێکمان دیاری کرد کە لە گەراج ئامادە بین بۆ ئەو ســـەفەرە. من نەمدەزانی بۆ کوێ ســـەفەر دەکەین و کێمان لەگەڵ دایە. پرســـیار کردن زۆر پەسند نەبـــوو. بەڵام کە لە گەراج یەکترمـــان بینی پێ ی گوتم دەبێ چاوەڕێی کاک ((قـــادر)) بکەیـــن چونکە ئەو دەزانێ بۆ کوێ ســـەفەر دەکەین.. کەمێک ڕاوەســـتاین دیم مامۆســـتایەک هات سەری کەمێک سپی بووبوو لە تەمەنی ماۆســـتا مەغدید بوو، مامۆستایەکی قۆز و ڕێک و پێک بوو. مامۆستا مەغدید وتی:- (ئەوە قادرە) منیشی بەو ناساند بەڵام بە ناوی نهێنیم نەک ناوەکەی خۆم.. دیار بوو کاک قادر پێشتر منی لە دوورەوە دەناســـی. یەکسەر سواری سەیارەی هێڵی سلێمانی بووین، ئەوجا زانیم ســـەفەرەکەمان بەرەو سلێمانی یە. مامۆستا مەغدید زوو تێ ی گەیاندم کە من مافم بەســـەر کرێ ی سەیارەو ئەو شتانە نەبێ چونکە کاک قادر بەرپرســـە لەو کارانە. لە ڕێگا کاک قادر هەندێک گفتووگۆو دەمەدەمیان لەگـــەڵ نەفەرێکی تـــر کرد، ئەو دایلۆگە بـــووە ((الاتجاه المعاکس)) و هەریەکە لە ئاشـــێک ئـــاردی دەهاڕی. لەوێ زانیـــم کاک قادر پیاوێکی

بە ســـەلیقەو دڵســـۆزو بە توانایە.. من نازانم چۆن بوو لە کۆیە زیاترم نەدیبوو، واتە تا ئەو تەمەنە لە هەیبە ســـوڵتان ئـــاوا نەبووبووم. بۆیە ئەوەندە گرنگیم بە دەمەدەمی ناو ســـەیارەکە نـــەدەدا ئەوەندە گرنگیم بـــە دیمەنی ناو شـــاخ و داخ وئـــەو ناوچە خۆشـــانە دەدا کە لە جامی ســـەیارەکە وە سەیرم دەکردن.. مامۆســـتا مەغدیدیش کەم کەم دەهاتە نـــاو بابەتەکەیان. دەمزانی ئەگەر ســـەردەمی گفتوگۆ نەبووا کاک قادر نەیدەتوانی ئاوا بە سەربەستی هەندێ مەسەلە بوروژێنێ..

کە گەیشـــتینە جادەی یەکتر بڕی ســـلێمانی – سورداش کاک قادر بە ســـایەقەکەی گوت:- (لێرە بوەستە دادەبەزین..) ئیتر بە پیادە بەو جادەیە هەوراز بووینەوە کە بۆ شـــارۆچکەی سورداش دەچێ. لە نیوەی ڕێگا تووشـــی سەیارەیەک بووین پەکی کەوتبوو وابزانم پەنچەر بوو کاک قـــادر گوتی:- (ئەوە کاک بەهرۆزە) دیار بوو کاک بەهرۆز قەشـــقە بوو ئەوســـاکە من نەمدەناســـی یادی بەخێر کاک بەهرۆز لـــە ٢٠٠٤/٢/١ لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان لە کارە تیرۆرســـتی یەکەی ناو مەڵبەندی ((٣))ی یەکێتی شـــەهید بوو. ئەو برادەرە ڕێگا و شوێنەکەی پێ وتین کە ئێســـتا دەچینە بارەگای ڕاگەیانـــدن لای کاک قادر حاجی عەلی کە بەرپرســـی ڕاگەیاندنی یەکێتی و لەوێش بە سەیارەی خۆیان بۆ شوێنی مەبەســـت دەمانبەن. لەناو سەیارەکەی هەندێک شت هەبوون دەستی بۆ بردن گوتی:- (ڕاوەســـتن با یەک دوو ڕووپۆشتان بدەمێ کە گەیشتنە ئەوێ لەسەری بکەن..) ڕووپۆشەکە لە قوماشێکی قاوەیی دروست کرابوو جۆرکێک بوو وەک ئەو جۆرکانەی ئەمەریکەیەکان لەسەر تاوانبارەکانیان دەنا..! دەبوا خۆمان لە ڕوویەکی سێ کونی بچووکی تێ بکەین بۆ هەردوو چاومان و دەممان. کە گەیشتینە سەرەتای ناحیەی سورداش خانووەکەی ڕاگەیاندن لەســـەر جادە بوو قەرەباڵغی پێشـــمەرگەی زۆری پێوە دیار نەبوو پاسەوانیشـــی هەبـــوو. کاک قادری حاجی عەلی کە من پێشـــتر نەمدیبوو لە دەرەوە وەســـتا بـــوو زوو ئاماژەی بۆ ئێمە کرد کە بە پەلە

بچینه حەوشەکە کە چووینە حەوشەکە پێشمەرگەیەک ڕای کردو بە پەلە ئێمەی خستە ژوورێک و وەک سێ بەندکراو دەرگای لەسەر داخستین و پێ ی گوتین ((ئێستا کڵاوتان بۆ دێنم..)) بەڵام تێمان گەیاند کە کڵاومان لایە. پاش ماوەیەک لە ژوورەوە من دڵم زۆر توند بوو دەرگاکەم کردەوە و هاتمە دەرەوە. دیاربوو کاک قادری حاجی عەلی لەناو حەوشەکە بوو، کە چاوی بە من کەوت بە توورەیی گوتی÷ (بڕۆ ژوورەوە کاکە گیان بڕۆ ژوورەوە بەبێ ڕووپۆش مەیە دەرەوە..) تێگەیشتم ئەوانەی لە دەرەوەن و چەکدارن پەرۆشی ئێمەیتیان، چونکە پاش چەند ڕۆژێکی تر دەگەڕێینەوە ناو شار. من کەمێک لام سەیر بوو لە دڵی خۆم دەمگوت (( ئاخر لەناو بارەگای هێزی پێشمەرگەوە کێوە..؟ تۆ بڵێی کەسێک هەبێ ئێستا لێرە چەکی پێشمەرگایەتی لە شان کردبێ و خایەنیش بێ و پەیوەندی لەگەڵ ڕژێم هەبێ..؟)) زۆر سادەو ساکارانە بیرم دەکردەوە. ئیتر بە پەلە گەڕامەوە ژوورەوە. دوای کەمێک یەکێک هات و پێ ی وتین کڵاوەکانتان لەسەر کەن و وەرنە دەورەوە. ئێمەش ڕووپۆشەکەمان ئامادە کردبوو، واتە کونی هەردوو چاو و شوێنی دەممان بۆ دروست کردبوو. لەسەرمان کرد، ناوە ناوە سەیری یەکترمان دەکرد و بە یەکتر پێدەکەنین چونکە زۆر سەیر دیار بووین. ئێمەیان سواری سەیارەیەکی (لاند کرۆز) کرد و هەرسێکمان لە چاوەی ناوەندێ دانراین، دوو کەسی تریش لە ژوورێکی تر هاتن ئەوانیش ئەو جۆرکانەیان لەسەر بوو، لە پشتەوەی سەیارەکە دایان نان. سەیارەکە بە خێرایی بۆ ناو شاخەکان بە ڕێگایەکی خۆڵدا دەڕۆیشت. سەربازگەیەکمان لێ بەدیار کەوت، ڕێگاکەش دەچووە ناو سەربازگەکە کە کۆمەڵێک ڕەبایەو شتی تر بوو.. ئەو برادەرەی لە پێشەوە کە لە تەک سایەقەکە سوار بووبوو نەمدەناسی پێ ی وتین (تا لە سەربازگەکە ڕەت دەبین کڵاوەکانتان لەسەر بکەنەوە بەڵام ئاوڕو شتی وا مەدەنەوە) کە گەیشتینە ناو سەربازگەکە هۆڕینێکیان لێدا و لە بازگە بچووکەکە ڕەت بووین، ئەوسا کڵاوەکانمان خستەوە

ســـەرمان. تا گەیشـــتینە (مێرگەپان) لە بناری پیرە مەگروون کەسمان نقەمان لێوە نەهات..لە دوورەوە چەندین خیوەتمان لە قەدپاڵەکە بەدی کرد لەگەڵ چەند شـــۆفەڵێک و چەند سەیارەیەکی (لاندگرۆز). هاتوچۆو پیاســـەی پێشـــمەرگەکانمان لە دوورەوە بەدی کرد..من یەکەم جار بوو ناو هێزی پێشـــمەرگە ببینم. بەرپرســـەکانیم کـــەس نەدیبوو. تازە ڕۆژ ئاوا بووبوو کە گەیشـــتینە بناری پیرە مەگرون. فەزایەکی زۆر جیا بوو لەگەڵ ئەو فەزایەی پێشـــتر تیا ژیابووم. دیاربوو لەناو هێزی پێشمەرگە مل ملانێکان توند بوون بە پێچەوانەی ڕێکخســـتنەکانی ناو شار کە ئەو جـــۆرە مل ملانێ یە زۆر کەمتر بەدی دەکرا. یان هەســـتی پێ نەدەکرا. هەر دوو دوو یان ســـێ سێ پیاســـەیان بەیەکەوە دەکرد و بە دەست و دەم قســـەیان دەکرد. بۆ هەر خیوەتێک بە شۆفەڵ شوێنەکەیان تەخت کردبوو. کە لە ســـەیارەکە دابەزیـــن پیاوێکی باڵا بـــەرز دەمانچەیەکی بەســـتابوو زوو بەرەو ڕوومان هات و پێشـــوازی لێ کردین لەبەر ئەوەی دەم و چاومان داپۆشـــرابوو نازانم کەسیانی لە ئێمە ناسی یان نا. دوایە زانیـــم ئەوە کاک (عەبدولڕەزاق)ە کە بە داخەوە لە ئازاد کردنی شـــاری کەرکوک لە ١٩٩١/٣/٢٠ شـــەهید بوو. شـــەهید عەبدولڕەزاق ئێمەی بۆ خیوەتێـــک برد و ڕێنمایی یەکانی تێگەیاندین کە تەنیا کە گەڕاینەوە ژێر خێمەکە بۆمان هەیە ئەو ڕووپۆشـــە لەسەرمان داکەنین، ئەگینا بەردەوام و لە کاتی دانیشـــتنەکانی ناو هۆڵی کۆبوونەوەکانی کۆنفراس هەر دەبێ لەسەرمان بێ، ئەویش بۆ پارێزگاری کردن لە ئایندەی خۆمان و ئاشکرا نەبوونمان.. تێ ی گەیاندین کە چوار کەســـی ترمان لە خێمەکە لەگەڵ دایە. ئێوارە بۆ نان خـــواردن چووین کە (محەمەد جەزا)ی هونەرمەندو پێشـــمەرگە سەرپەرشـــتی ئامادەکردنی چێشـــتەکەی دەکرد. چەندین مەنجەڵی گەورە دانرابوون بۆ چێشت لێنان و بە سەدان قاپ و کەوچک و گلاس دانرابـــوون بۆ ئەو هەموو خەڵکە..ئەو کەســـانەی جگە لەو ســـێ کەســـەمان لەگەڵمان لەناو خێمەکە بوون و ڕووی یەکترمان دەبینی سێ

کەسـی شـاری کۆیە بوون یەکێکیان ناوی نهێنی (چیـا) بوو یەکێکی تریان کاک (د. محەمەد سابیر) بوو کە ئێستا بەڕێوەبەری گشتی یە لە وەزارەتی خوێندنی بالا بەلام سـێ یەمیان لـە بیرم نەماوە لەگەڵ کاک (عەبـدوڵا حەبیب) ی کادری کۆنی یەکێتی خەڵکی شـاری ڕەواندز بوو بەهۆی برادەرایەتی کۆنی لەگەڵ کاک قادر و مامۆسـتا مەغدید هاتبووە خێمەکەی ئێمە. هەرسـێکیان پێشـتر لە باڵی مەکتەبی سیاسی بوونە.

بە هیوای ئەوە بووم ڕۆژێک لە ڕۆژان کاک (نەوشـێروان) ببینم بۆیە کە گەیشتمە ئەوێ مامۆستا مەغدید کە لەپێش ساڵی ١٩٧٠ دەیناسی زوو پێ ی نیشان دام. هەر لەوێ هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵەم بۆ یەکەم جار بینی. یەک لە شتە دڵخۆشکەرەکان کە من زۆر دڵم پێ ی خۆش بوو ئەوە بوو کە دەمدی زۆربەی بەرپرسەکان وەک ئێمە لە ڕیز دەوەستن بۆ ئەوەی خواردن وەربگرن و لەگەڵ ئێمەش لەبەر هەتاوەکە دادەنیشتن تا نانەکەیان دەخوارد، واتە ئەوان نانێکی تایبەتیان جیا لە ئێمە نەبوو.. پێم سـەیرە و جێگای داخە کە ئێستا سەرکردەکان ئاوا بە قەڵەمبازێک چوونە کەناری ئەوبەر و خۆیان لە جەماوەر جیا کردەوە — جل و بەرگ — خواردن و خواردنەوە — کۆشـک و تـەلار و منداڵەکانیان هەمووی لە هی جەماوەرەکەیان جیایە و ئاسمان و ڕێسمانیان نێوانە. بەداخەوە ئەو سـەرکردەی لەگەڵ ئێمە لە ڕیز دەوەستا تا خواردنەکە وەرگرێ. دەبێ ئێسـتا تۆ لە ڕیز بوەستی تا دەگەیە لای دەرگای سکرتێرەکەی و ئەگەر ئەو خواردنەی ئەوان دەیخۆن پاشـماوەکەی کە بۆ فڕێ دان لای دەدەن بیدەنە تۆ، تۆ لە شوێن خۆت دەبی بە پاشا..لەوانەیە هێندەی لێ بخۆی تووشـی پاڵەپەسـتۆی خوێن و شـەکرە ببی..لەوێ مام جەلال و کاک نەوشـێروان و فەریدون عەبدولقادرو ئـازاد هەورامی و جەبار فەرمان و جەبـار یاوەرو مـەلا بەختیار و قادری حاجی عەلی و ئەرسـەلان بایزو چەندین بەرپرسـی ترم بینی. کاک کۆسـرەت هەرچەنـدە تا ئەو ڕۆژە هەر لە شـار بوو لێپرسراوی ڕێکخراوی هەولێر بوو کە بەرزترین ئۆرگانی

شارێک بوو لەوێ لەگەڵ شــەهید عەبدولڕەزاق و شەهید بەهرۆز قەشقە چەند جارێک ســەردانی خێمەکەی ئێمەیان کرد. ئەو سێ برادەرەی ناوم هێنان ئەوان ڕووپۆشیان لەسەر نەبوو، دیارە لە سەرەتاوە بڕیاریان دابوو نەگەڕێنەوە ناو شار.

هۆڵێکیان لە دار و عەسیر دروست کردبوو بە (موەلیدە) ش کارەبایان دابین کردبوو. ئەو هۆڵە تەنیا بۆ سێبەر بوو، هەمووی کورسی پلاستیکی یان لێ دانابوو. شــانۆیەکی بچووک کە تەنیا شــوێنی ئەوانە دەبووە وە سەرپەرشتی کۆنفراسەکەیان دەکرد مێز و مایکرۆفۆنیان دانابوو. هەرچەندە ناوەڕاســتی مانگی تەمووز بوو بەڵام شوێنەکە کوێستان بوو، فێنک بوو شەوانە بەتانیمان بەخۆمان دادەدا. لە دانیشتنی یەکەمی کۆنفراس چەند میوانێک هاتبوون لەوانە (عەبدولڕەحمان قاســملو) کە بە زمانێکی زۆر شیرین وتارەکەی دا، زمانەکەی تێکەڵاویەکی نێوان بادینی و سۆرانی تێدا بوو. بەڵام بە پەیڤی ســۆرانی. لەبیرمە لە کاتی باس کردنی مەســەلەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم و پەیوەندی خۆشــی لەگــەڵ ئەولا و ئەولا گوتی:- ((برادەرینە نابێ پیاوی سیاسی بە دڵ و عاتیفە بڕیاڕ بداو بیر بکاتەوە چونکە دڵ بۆ دڵداریە و مێشــک بۆ سیاسەتە..)) هەر کەسێک قاسملۆی بدیبا خۆشــی دەویســت. یەکێکی تر لە میوانەکان سەرکردەیەکی باڵی کۆمەڵەی زەحمەت کێشــانی کوردستانی ئێران (سەید عەلی زادە) بوو. ئەویش وتاری خوێندەوە کە هەمووی بریتی بوو لە پیرۆز کردنی ڕێبازی مارکس و کۆمۆنستی و دژی دین قسەی کرد.

لەناو باڵی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســتان وەک پێشتر باسم کرد مقۆمقۆی بیروبۆچوونی جیاواز هەبوو بەتایبەتی مەسەلەی کوردستانیەت و عێراقی یەتی کۆمەڵە.. بەشــێک لــە کادران قەناعەتیان وابوو کە دەبێ کۆمەڵەیەکی عێراقی بین چونکە ئێمە وڵاتێکی ســەربەخۆ و ژێرخانێکی ئابووری سەربەخۆ و یەکەی ئابووری سەربەخۆمان نی یە بەڵکو بەشێکین لە عێراق و ئابووریشــمان بەستراوەتەوە بە عێراق بۆیە هەر ڕێکخراوێکی

مارکســـی ئەگەر هەبێ دەبێ لە عێراق جیا نەکرێتەوە، چونکە ڕێکخراوی لەو جۆرە لەســـەر یەکێتی ئابووری دادەمەزرێ. هەندێ جاریش ئەوان لە گفتوگۆکان ڕوونیان دەکردەوە کە نایانەوێ ڕێکخراوێکی عێراقی بێ تەنیا دەیانەوێ وشەی عێراق بکەنە پاشگری ناوی ڕێکخراوەکە کە ئەوانە زیاتر بە داش عێراق ناسرابوون.

بەرنامـــەی کۆمەڵە و پەیڕەوی ناوخۆ زۆرترین کاتەکانی دانیشـــتنی کۆنفراسی داگیر کرد. مەلا بەختیار سەرپەرشتی ئەو بۆچوونانەی دەکرد کە بە عێراقچی ناســـرابوون. لە یەک لە دانیشـــتنەکان کاک نەوشێروان لەبەردەم مایکرۆفۆن وتی:- ((کێ دەیەوێ کۆمەڵە ڕێکخراوێکی عێراقی بێ با بێتە بەردەم مایکرۆفۆن بە ڕاشـــکاوانە وا بڵێ..؟)) لەبیرمە هەڤاڵ (کاکلە ڕەش) کە تاقە کەس بوو هەڵسایەوەو چووە پێش مایکرۆفۆنەکەو وتی:- (من پێم باشـــە کۆمەڵە ڕێکخراوێکـــی عێراقی بێ..) لە دواجار موناقەشـــەکان ( توندی) ی تێ کەوت و مـــەلا بەختیار لەگەڵ کۆمەڵێک ئەندامـــی کۆنفراس هۆڵەکەیان بەجێ هێشـــت و جەلســـەی دانی ئێوارە نەبەســـترا و هەواڵ گەیشتە مام جەلال کە ئەوساکە لە (سورداش) بوو. بۆ ئێوارە مام جەلال گەیشـــتە بناری پیرەمەگـــروون و توانی قەیرانەکە بە شـــێوەیەکی کاتی چارەســـەر بکا و ئەو برادەرانە بۆ دانیشـــتنەکان بێنەوە..لە ڕۆژی هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی کە دەبوا ((٧)) حەوت کەس بۆ ســـەرکردایەتی هەڵبژێردرێ لەگەڵ ((٣)) ســـێ یەدەگ، کاک نەوشـــێروان کە سکرتێری کۆمەڵە بوو بەشـــداری لەو دانیشتنە نەکرد، تەنیا نامەیەکی جێ هێشـــت و ڕایگەیاند کە بۆ بەرژەوەندی گشـــتی ئەو بەشـــداری لەو جەلســـەیە ناکاو لە نامەکەش دا ناوی چەند کەســـێکی هێنابوو کە خەڵکی زۆر تێکۆشـــەرن و لە شـــار یان لە شـــاخ قوربانیان داوە. یەکێـــک لەوانە کە کاک نەوشـــێروان زۆر باســـی کرد کە چالاکی گەورەی لە شـــاری هەولێر ئەنجام داوە و سەرپەرشـــتی ڕێکخستنەکانی شـــاری کردووە و ڕێکخستنەکانی پاراستووە ئەویش کاک (کۆسرەت) ە.

بـــەو پێ یە ئەو نامەیە بووە پاڵپشـــتی یەکی زۆر گەورەو لە هەڵبژاردن بە ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە هەڵبژێردرا. هەروەها زۆر باســـی قارەمانی یەتی و قوربانی یەکانی (حەســـەن کوێستانی) کرد کە چەند تێکۆشەرو پیاوی ئازا بووە لە شـــەڕی بەرگری و پێشـــمەرگایەتی و باسی شەهید بوونـــی براکانی تیا کرابوو. ئەویش بە ئەندامی یەدەگی ســـەرکردایەتی کۆمەڵە دەرچوو. لە نامەکەدا ناوی دوو کەسی شاری سلێمانی تیابوو کە یەکێکیان بە ناوی (مامۆستا سەلیم) ناوی بردبوو. وابزانم ئەو هەڤاڵەش بووە ئەندامی یەدەگی ناوەندی کۆمەڵە.

بـــەو پـــێ یە لە جەلســـەی ئێوارە کۆنفـــراس کۆتایی هـــات، بەڵام کێشەکان بە تەواوی چارەسەر نەکران و بە ناکاملی مانەوە لە کۆتاییش جیابوونەوەی کاک (مەلا بەختیار) و کاک (سالار عەزیز) و کاک (عیماد ئەحمەد)و چەندین کادری پێشکەوتووی لێ کەوتەوە..جگە لەوەی ڕۆحی تۆڵە ســـەندنەوە لەناو ڕیزەکانی پێشـــمەرگە و ڕێکخستن سەری هەڵدا. لەجیاتـــی ئەوەی بیـــرو بۆچوونە جیا جیاکان لەیـــەک نزیک بکرێنەوە. ئـــەو برادەرانەی کە جیابوونەوەیان بە بـــاش نەدەزانی و لەگەڵ ئەوەی بیـــرو بۆچوونیان جیا بوو بەڵام مانەوەو یەک ڕیزیان پێ باشـــتر بوو بە زۆرو زۆرداری دەربەڕێندران..هەر بەوەش نەوەســـتان وەک ڕۆحی تۆڵە ســـەندنەوە ئەگەر (سەرتیپ) ێک خۆشی لە سەروچاوی (ڕابەرسیاسی) یەک نەهاتبایە یان بە پێچەوانە، ئەوا ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی لەســـەر دەنووســـی و بە عێراقچی لە قەڵـــەم دەدرا. ئەوەندەیان دەهێنا و دەبرد ئەگەر هەویش نەبووا بێ تاقەت دەبوو.. ئەو جۆرە هەڵوێستانە وای کرد بە دەیان کادری خاوەن ئەزموون بێنەوەو تەسلیمی ڕژێم ببنەوە. چونکە قێزیان لە سیاســـەت دەبـــووەوە.. من قەت ڕۆژێک لـــە ڕۆژان لایەنگری ئەو بۆچوونە نەبوومە کە کۆمەڵە بەرەو عێراقچی بچێ..زۆریشـــم ڕق لەو بۆچوونە بۆتەوە، بەڵام مێژووی یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان پڕ بووە لـــە جیاوازی..جیاوازی یەکان خاڵی لاواز نەبوونە. بەڵام هەر کاتێک ئەو

جیاوازی یه بوویێته لەیەک ترازان ئەوا ئەو هەوڵانەی کە بۆ کەم کردنەوەو تەسک کردنەوە ئەو لێک ترازانە دەدرا زۆر زۆر کەمتر بوو. لەو هەوڵانەی بۆ گەورەکـــردن و فراوانکردنی ئەو لێک ترازانە دەدرا..ئەوە نەخۆشـــی یەکی ترسناک بوو لەناو کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا کە لە جیابوونەوەی ((گۆڕان)) هەمان حاڵەت خۆی دووبارە کردەوە. بە دەیان کادریـــان دڵگیر کرد و بە دەیان کادری دڵســـۆزیان بەزۆر بۆ ناو گۆڕان پاڵدا هەر بۆ ئەوەی ئەوانەی کادر نین و بێ ڕابووردوی خەباتن و ئەوانەی نەخوێندەوار و هیچ لەبار نەبوون جێگایان بە ئاسانی ببێتەوە..

### * ئەرکەکانم لەدوای کۆنفڕاس:-

دوای ئـــەوی ئێوارە کۆنفـــڕاس کۆتایی پێ هـــات و بەیانی کۆتایی خوێندرایـــەوە بۆ بەیانی یەکەی کە ڕۆژی هەینی بوو ئێمە هەرســـێکمان لەگەڵ ملازم (ســـەید کەریم) کە ســـەرکردەیەکی پێشمەرگەی ئازاو چاو نەتـــرس بوو کە دوو کەســـی تری لەگەڵدا بوو ئێمـــە لە ڕێگایەکی خۆڵ گەیاندراینە سلێمانی و لەسەر شەست مەتری دابەزین. ئەو ناوچەیەی کە پێ ی دا ڕۆیشـــتین دیاربوو پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێرانی زۆر دەهاتێ، بۆیە لە ڕێگا کاتێ لای شـــوانێک وەســـتاین ئێمە بە شێوەزاری هەولێری قسەمان کرد پێ ی وتین:- (چما ئێوە کۆمەڵە نین..؟) وتمان: (بەڵێ کۆمەڵەین..) وتی:- (ئەی بە شـــێوەزاری هەولێری قســـە دەکەن..؟) قسەکەیمان پێ سەیر بوو بۆ دەبێ هەولێر کەسێکی کۆمەڵەی تیا نەبێ.. دوایە تێگەیشـــتین ئەو برادەرە مەبەســـتی کۆمەڵەی زەحمەت کێشانی ئێران بوو. جا پێمان وت :- (ئێمە یەکێتین..). ناوچەکە لە نزیک گوندی ((قزلەر)) بوو من شارەزای ناوچەکە نەبووم.

کە گەڕامەوە هەولێر لەبەر ئەوەی کلیلی ماڵەوەم پێ نەبوو یەکسەر بۆ ماڵی (حاجی سابیری خەزورم) چووم لە کووران..دیارە لەوێ گوتبوویان

ســـەعدی لە بەغدایە.. ئەو ڕۆژەی من گەڕامەوە (مەلا محەمەد)ی کوڕە گەورەی خەزورم لەوێ بوو کە چاوی بە من کەوت کورتەک و شـــەروالّم لەبەرە و کەمێک ڕیشم هاتووە و گیانم کەمێک تۆزاوی بوو. بە خوشکەکەی دەڵێ:- (خوشـــکم ئەوە ســـەعدی چویتە بەغدایـــێ وا نی یە..تخوا ئەو ســـەروچاوە هـــی بەغدایێ یە) بە ماوەیەکی کـــەم دوای گەڕانەوەمان لە کۆنفڕاس مامۆســـتا مەغدید بە شـــێوەیەکی کت و پـــڕ بڕیارِی دا واز لە بەرپرسیاری یەتی پۆلەکە بهێنێ، ئیتر من دەست نیشان کرام بۆ ئەوەی ببمە لێپرســـراوی ئەو پۆلە. هەرچەندە پێـــم ناخۆش نەبوو بەڵام بۆ من کەمێک گران بوو، پێم وابوو لە ڕووی فکری یەوە هێشتا ماومە بەتایبەتی هەڤاڵ (موحســـین ئیبراهیم) لە ڕووی فکری یەوە پیاوێکی بە توانا بوو. بەڵام ئەوە فرمانی حزبە و دەبێ جێ بەجێ ی بکەین. مامۆســـتا مەغدید تێ ی گەیاندم کە کاک قادر دێ و چاوی پێم دەکەوێ ئەو کە لێپرسراوی کەرتە دەبێتە بەرپرسی ڕاستەوخۆم، لێرەوە دەبێ کۆبوونەوەی کەرتیش ئەنجام بدەم چونکە شێوازی ڕێکخستن ئەوهابوو هەموو لێپرسراو پۆلێک ئەندامی کەرتیش بوو. کە ئێســـتاش ڕێکخســـتنەکانی یەکێتی هەر بەو شێوەیە.

ڕۆژێکیان لە ژوورەکەی خۆم لە دیوانی پارێزگا خەریکی کاری وەزیفی خۆم بووم، بەردەســـتەکەمان هات پێ ی گوتم:- ((مامۆســـتا یوسفێک هاتووە دەڵێ کارم پێ یەتی..)) منیش کەهیچ مامۆستا (یوسف)م برادەر نەبوو کەمێک هەڵوەستەم کرد و دوایە گوتم بابێ..کە هاتە ژوورەوە هەمان ئەو کاک (قادر) ەبوو کە لە کۆنفڕاس بەیەکەوە بووین. ئەو ڕۆژە تێ ی گەیاندم کە ئەو ناوی قادر نی یە بەڵکو ((یوسف دەرگەڵەیی)) یە. ئیتر لەگەڵ مامۆستا یوسف قسەمان کرد و لەماڵەکەی خۆی کات و شوێنی یەکەم کۆبوونەوەی تازەی کەرتەکەی دیاری کرد. لە کۆبوونەوەکەدا ئێمە ســـێ لێپرسراو پۆل بووین یەکێکیان بەناوی (ڕێباز) کە ناوی نهێنی بوو ئەوی تریان ناوە نهێنی یەکەم لەبیر نەماوە. کاک ڕێباز لە ساڵی ١٩٨٦

دوای ئەوەی بۆ ناو هێزی پێشـــمەرگە دەرچوو زانیم ناوی ڕاستی (حاكم شێرزاد عوسمان) ە كە لە بنەڕەتا خەڵكی گوندی سۆربەش خدر بوونەو خوارزای (مەلا عەولا) بوو كە بـــە مەلا ماتۆڕ بەناوبانگ بوو. بەداخەوە لە ســـاڵی ١٩٩٥ بە كارەســـاتێك گیانی لەدەســـت دا. ئەویتریان دوای شـــەهید بوونی (یوســـف دەرگەڵەیی) و پچڕانی پەیوەندیمان نەمدۆزی یەوە. لە ســـاڵی ٢٠٠٨ كە كارگێڕی مەڵبەندی سێ ی یەكێتی نیشتمانی كوردســـتان بووم بۆ سەردان سەرم لە كۆمیتەی ((١٤)) دا لەوێ چاوم بەو پیاوە كەوت كە ئەندام كۆمیتە بوو، بە تەمەن دا چووبوو، تووشـــی نەخۆشـــی یەكی كوشـــندە بووبوو، پێم وت:- (تۆ من ناناســـیەوە..؟) زۆر ســـەیری كردم و ســـەری بادا. ئیتر كۆبوونەوەكان و كەرتەكەمان و شـــەهید یوســـف دەرگەڵەییم بەبیر هێنایەوە. یەكسەر لە شوێنی خۆی هەڵسایەوەو باوەشی پێدا دام و چاوەكانی ڕۆندكی پیادا هاتە خوارەوە.. بە دڵێكی پڕ لە حەســـرەتەوە وتی:- ((كاكـــە گیان من چەند بە دواتا گەڕام، چەند پرســـیارم كردی، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوە ڕاســـتەقینەكەتم نەدەزانـــی نەمتوانی بتدۆزمەوە. دوایە درەنگ زانیم كە تۆش گیراوی..)) ئەوســـاكە مـــن و كاك (جەلال) ناوی یەكترمـــان نەدەزانی تا ئەو ڕۆژی لە (٢٠٠٨) لە كۆمیتەی (١٤) تووشـــی یەك بووینەوە. ئەوجا من زانیم ناوی (جەلال) ە و ئەو زانی من ناوم (ســـەعدی) یە واتە دوای ٢٤ ساڵ ئەوجـــا دوو ئەندام كەرتی ناو یەك كەرت كە چەندین جار كۆبوونەوەمان لە ماڵی یەكتر كردووە. ناوی یەكترمان نەزانیوە. ڕێكخســـتن پێشتر بەو شـــێوەیە بوو. توند و تۆڵی ڕێكخســـتن ئەوەندە پتەو بـــوو دەبوا ئێمە ناوی ڕاستی یەكتر نەزانین. بۆ ئەوی ئەگەر یەكێكمان گیراین و بەرگەی ئازارەكانمان نەگرت، نەتوانین ناوی ڕاســـتەقینەی هاوڕێكانمان بدەین.. كاك جەلال یادی بەخێر لەدایك بووی ١٩٣٧ بوو تا بڵێ ی پیاوێكی ئازا و چاو نەترس بوو قســـە لە ڕوو بوو، دڵســـۆز بوو، پیاوێكی ماندوو بوو، كە ئێمە بەیەكەوە بووین ماڵی لە خانووەكانی (دەواجن) بوو لە هەولێر.

بەداخەوە نەخۆشـــی یەکەی زۆر کاریگەر بوو لە شەوی ٢٠١٠/٣/٢١/٢٠ کۆچی دوایی کرد و چووە ڕیزی نەمران..

ئەرکەکانــم زۆر زیادی کرد، جگە لەوەی کـــە گفتوگۆ بەرەو کۆتایی دەچوو ترســـی ئەوەمان هەبوو خەڵکانێک ئاشکرا بووبن، لەو ماوەیەش چەند کەســـێک لە پۆلەکەمان زیادی کردبوو. مامۆســـتا یوسف ((کاک زیاد عومەر))ی پێ ناســـاندم کە ئەویش لێپرســـراوی شانەیەک بوو لای خۆی بوو کە لە پۆلەکەی ئێمە بێ..کاکە زیاد ماڵی لەســـەر کۆنە ڕێ ی بەحرکە بوو کە ئێســـتا ڕێ ی تازەی بەحرکەیە. زیاتر حەزی لە چالاکی ســـەربازی دەکرد. چەند کەسێکی ڕێکخســـتنی لەگەڵدا بوو. کاک قاسم شێروانی کە لای کاک سەردار بوو لە شانەکەی کاک (نووری عومەر) مان دانا کە ئەو تەنیا یەک کەسی تری لا بوو کە ئێستاش نەمزانی کێ یە.. کاک قاسم شێروانی کوڕێکی تری لەگەڵدا بوو بەناوی (عەبدولفەتاح) کە ئەویشم نەدەناســـی. هەڤاڵێکی تر بەناوی (فەرمان) لای هەڤاڵ سەردار بوو(ئێســـتا ئەندامی پەرلەمانی کوردستانە لەسەر لیستی گۆڕان ). من جگە لەوەی لێرســـراوی پۆلەکە بووم لێپرسراوی شانەکەی خۆشم بووم کە ئەویش زیادی کردبوو. مامۆستا مەغدید (سەرباز) ی خوارزای بە من ناساند کە تەنیا پەیوەندی لەگەڵ من هەبێ و لای خۆشمەوە (نەبەز تایەر ئەحمەد داود) ی قورشاغلو پەیوەندی پێوە کردم..هەرچەندە قسەی زۆر لە ســـەر مامێکی هەبوو کە ناوی (مامە ئەحمەد داود) بوو، چونکە ئەو زانیاری یانەی من لەولاو لەولا بیستبووم، ئەوە بوو دوای ئەوەی شۆڕش هـــەرەس دێنێ و خەڵکێکـــی زۆر بۆ خـــوارووی وڵات دوور دەخرێنەوە (مامە) یەک لەو کەســـانە دەبێ کـــە دوور دەخرێتەوە. (مامە) یەک لە سیاسی یە کۆنەکان بوو کە لە کاتی دروست بوونی کۆماری مەهاباد ئەو تازە گەنج دەبێ ڕوو لە ئێران دەکا و لەوێ دەبێتە پێشمەرگە.

وەک بیستبووم ((مامە)) لە شاری (دیوانیە) ئەمن پەیوەندی پێوە دەکـــەن و هەر بـــە فەرمانی ئەوان بۆ (مصلحة نقـــل الركاب في اربيل)

دەگوازرێتـــەوەو لە دوای ڕاپەڕین (مامە) لە لایەن (ســـەعد عەبدوڵا) ی پیاوی دووەمی ناو سۆسیالیســـت لەو ساکە دەستگیر دەکرێ و لە ڕانیە دەخرێتـــە زیندانی ئەوان !!!دوایی (کاک کۆســـرەت) بە توندی دێتە ناو مەســـەلەکەو ((مامە))ی لە مەرگێکی مسۆگەر دەرباز دەکا. من لەگەڵ نەبـــەزی برازای جارێـــک چوومە ماڵی مامە لە گەڕەکـــی قەلا ئەو ڕۆژە (واحیدی مەجید عەیشـــێ) کە خـــوارزای ناوبراو بوو لـــەوێ بوو. زۆر پرســـیارم لێ ی کرد، چونکە دەمزانی کابرایەکی سیاســـی و دونیا دیتە بوو، بەو تەمەنە گەورەیەوە بەردەوام دەیخوێندەوە..لە مێژوو دەریایەک بـــوو. کتابێکم لای هێنـــا پێ ی وتم بەو مەرجـــەی دوای ئەوەندە ڕۆژە بیگەڕێنمـــەوە. پێ ی وتم - (من گەلی جار بۆ کتاب خوێندنەوە مۆڵەت لە فەرمانگە وەردەگرم..) ((مامە)) لە قسەکانی ئەو ڕۆژی زۆر بە توندی ڕەخنـــەی لە هەندێ کەس گرت کە تۆمەتباری دەکەن بەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەمن هەیە..اقسەیەکم لەبیر ماوە کە گوتی: (یەکێک ئەگەر هیچ زیانی بـــۆ میللەتەکەی نەبێ با جارێک دووان ســـەردانی دایەرەی ئەمن بکا..مەگـــەر فەرمانگەیەکی حکوومی نی یە..؟ بۆ دەبێ بەوە تاوانباری بکەن کە بۆتە جاســـووس..) دیارە لەو قســـانە زیاتر مەبەستی (ع.ع) بوو کە ئەویش لە خزمەکانی بندیان بوو خەڵکی گوندی قورشـــاغڵو بوو خوێشـــی یەکتر بوون. ماوەیک بوو لە هەولێـــر پڕوپاگاندەیەکی توندی لە دوای ((مامە)) دەکرد کە جاسوســـی ئەمنی هەولێرە..یادیان بەخێر هەردووکیان نەماون..

نەبەز ئەوەندەی من دەمناســـی کوڕێکی دڵســـۆزی کوردایەتی بوو. لەگەڵ من وەک برا بوو. جێ ی متمانەم بوو، هەموو قسەیەکم لای دەکرد. بەڵام لە کۆتایی بەدیار کەوت کەوتبووە ژێر کاریگەری (مامە) ەی مامی کە قـــەت ئەوەم لێ ڕەچاو نەدەکرد. وابزانم لە دوای دەســـتگیر کردنی (یوســـف) ی برای لە گوندی قورشاغڵو کە پێشمەرگە بوو بۆ پاراستنی گیانی براکەی بە ناچاری کەوتە ژێر ئەو کاریگەرییەو توانرا (یوســـف) لە

(یوسـف) له زیندان دەرباز کەن..!!! (یوسـف )هەردوای بەربوونی یەکسـەر پەیوەندی بە هێزی پێشـمەرگە دەکاتـەوە. ڕۆژێک لەگەڵ (سـەمەد سالّح) ی گوندی قورشاغلّو بۆ چالاکی یەک دێتە ناو شار و لە گەڕەکی ئازادی هەولێر لە لایەن (ا. ن) کە پیاوێکی سـەر بە ئەمن بوو شەهید دەکرێ..

جگە لەو هەڤاڵانە وەک لە سەرەوە ناوم هێناوم هەڤاڵ (فەرمان) یەک دوو جـار بەر لە گرتنم چاوم پێ ی کەوتووە کە لەگەڵ کاک (سـەردار محەمەد عەبدوڵا) بوو. لە پۆلەکەمان خەڵکی تر هەبوون داوای لێبووردنیان لێ دەکەم کە یان نەمناسیون یان ناوەکەیانم لە یاد نەماوە.

لە ١٩٨٥/١/١٥ بەیانی کۆتایی هاتنی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم کەیشـتە دەسـتمان و لە شار بڵاومان کردەوە. هەر دوای ئەو کاتە بە ئەنجامدانی گەورەترین چالاکی هێزی پێشمەرگە لە زنجیرە چیای دابان و هەلاج شەڕ دەسـتی پێ کردەوە و ڕژێم دەسـتی بە ڕاوە دوونان و گرتنی کۆمەڵە خەڵکێـک کرد بە تایبەتـی ئەوانەی گومانی لێ هەبـوون. ئەو ماوەی گفتوگۆیە ئەگەر پشـوویەک بوو بۆ ڕێکخستن بەڵام زیاتر خۆدەرخستنی هەڤاڵان وایکرد کە چەند کەسـێک ئاشـکرا ببن و دەستگیر بکرێن. من ئەوسـاکە جگە لە ئەرکی حزبایەتی ئەرکی ماڵەوەشم لەسەر گران بوو.. چونکـە ئەوکات پێنج منالّم هەبوو بچووکەکەیان (هێشـوو) بوو لەگەڵ کۆتایـی هاتنی گفتوگۆ لە ١٩٨٥/٢/٨ لەدایک بوو کە پێنجەم کچم بوو. بارودۆخی ناخۆش ڕووی لە ڕێکخسـتنەکان کردبوو. هەموومان گومانمان لە ئاشکرابوون دەکرد. گومانمان لەوە دەکرد کە خەڵکانێک هەبن بەعس بۆخۆی کڕیبن. لە چەند مانگێکی کەم گرتنی کەسە دیارەکان دەستی پێ کرد و لە کۆتایی مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٥ مامۆستا مەغدید ئێوارەیەک هەواڵی پێ دام کە مامۆسـتا یوسـف دەرگەڵەیی گیراوە. من هەر ئەو ئێوارەیە لە ماڵ چوومە دەرەوە و ژیانم لێ تاڵ بوو. بەعس دەسـەڵاتێک نەبوو لێ ی نەترسـی. ئەگەر لە ژیانی خۆشـت نەترسـی ئەی ژیانی

ئەو خەڵکانەی کە ئێمە دەماننناســـین..؟ هەرچەندە گومانمان لە خۆمان بکردایە لە مامۆســـتا (یوســـف دەرگەڵەیی)مان نەدەکرد شەهید یوسف دەرگەڵەیی لە سەرووی ئەو گومانانە بوو. بەڵام من لەوە دەترسام ئێمەش لەگەڵ ئەو بەیەکەوە ئاشـــکرا بووبین. ترسم لەوەش هەبوو لە فەرمانگە دەستگیر بکرێم. بەڵام مۆڵەت وەرگرتنیش لە ڕۆژێکی ئاوا دەچێتە خانەی گومان. بەیانی هەواڵی کاکە زیادم دا کە ئەویش پێشتر پەیوەندی لەگەڵ مامۆستا یوسف هەبوو. دوو برادەرەکەی تریش هەواڵیان پێ گەیشتبوو. دوو شـــەو منداڵەکانم بە تەنیا لە شـــوقە بەجێهێشت و شەوی سێ یەم هاتمەوە لایان. هەرچەندە زۆر بە ترسەوە وابزانم نەخۆم نە هاوسەرەکەم خەومان لێ نەکەوت. دەنگی هەر ســـەیارەیەک نزیک دەبووەوە یەکسەر تاومان دەدایە پەنجەرەکەو ســـەیری دەرەوەمان دەکرد ئاخۆ مەفرەزەی ئەمن نی یە..ســـاتەکان زۆر بە گرانی تێدەپەڕین. بۆ بەیانی دیســـان بە ســـەرنج دان و کۆمەڵێک چاوچاوێنی لەگەڵ گۆڕەپانی پارێزگا و پرسگەو دەوروبـــەری نـــەوەک (ئەمن) چاوەڕێم بن چوومـــە ژوورەوە بۆ دەوام.. ســـعات نۆی بەیانی لە لایەن (کاکـــە زیاد عومەر) تەلەفۆنێکی دڵتەزێنم بۆ هات کە پێ ی وتم (مامۆســـتا یوســـف دەرگەڵەیی) شـــەهید کراوە داوام لێ ی کرد بێتە نزیک بارەگای پارێزگا و بۆ ئەوەی بچین هەواڵەکە لە شـــوێنێک پشت ڕاســـت بکەینەوە یان بۆمان ساغ بێتەوە کە درۆیە. شـــوێنی وەستانی پاس بوو بەرانبەر دەرگای مەرقەدی سوڵتان موزەفەر بە کاکە زیادم گوت بێتە ئەوێ..بە ئەسپایی لە ژوورەکەم هاتمە دەرەوە و هاتمە شـــوێنەکە کە کاکە زیاد هات یەکســـەر تەکســـیەکمان گرت و چووینە گەڕەکی ڕووناکی کە ماڵی مامۆستا یوسف لەوێ بوو. لە دووری ماڵەکەیان تەکســـیەکەمان بەڕێ کرد. بە ئەســـپایی لە ماڵەکەیان نزیک بووینەوە. گوێمان لە شین و ڕۆی حەوشەکەیان بوو. ئەوساکە بە تەواوی تێ گەیشتین ئەو کەڵە پیاوە ئەو قارەمانە ئەو کادرە بەتوانایە لە کورد و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و لە هەڤاڵەکانی و خانەوادەکەی ڕۆیشت

و ماڵ ئاوایی لێ کردین..

مامۆستا یوسف جگە لەوەی لە دوای چوونە دەرەوەی کاک کۆسرەت لەگەڵ شەهید (حەیدەر جوکل) سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی هەولێریان دەکرد. سەرۆکی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان/ شاخ بوو. ئەرکێکی زۆری لە ئەستۆ بوو. لەو ساتەی کە دەستگیر دەکرێ بە گژ جەلادەکان و قامچی و کێبڵ و کارەبا و هەڵواسین دا دەچێتەوەو نکۆڵی لەو هەموو زانیاریانە دەکات کە لەسەری کۆکرابووە وە.

لەبەر ئەوەی بەڵگەکان زۆر بوونە ئەویش بەرپرسیاریەتی گەورەی هەبووە. بۆیە ئەشکەنجەکەیان زۆر بە توندی لەگەڵ بەکارهێناوە و هەر لە ژێر ئازار گیان لەدەست دەدا. یەکێک لەو کەسانەی لە تیمی ناشتنی تەرمەکە بووە لە گۆڕستانی (مەعمەل قیر) مامۆستا یوسف دەناسێ و پێ لە گیانی خۆی دەنێ و هەواڵیماڵەوەیان دەدا کە مامۆستا یوسفی ناشتووە.. شەهید بوونی مامۆستا یوسف و دوایەش گرتن و شەهید کردنی (حەیدەر جوکل) بە دەیان پرسیاری لە مێشکم دروست کرد.. ئەوەی ئێمە بیستبوومان ڕێکخستن لە خوارەوە ئاشکرا دەبێ نەک لە سەرەوە بە تایبەتی کەسی یەکەم. بەڵام بەداخەوە لە ماوەی کەمتر لە ساڵێک سێ کەسی یەکەمی ناو شار ئاشکرابوون و شەهید بوون. شەهید یوسف دەرگەڵەیی و شەهید حەیدەر جوکڵ و شەهید محەمەد قادر. ئەگەر دەستی خراپەکاری و خیانەت لە سەرووی ئەوانە نەبێ بۆ تەنیا کەسی یەکەم دەستگیر دەکرێ..؟ ئەمە پرسیارێکەو لە خۆمم دەکرد. بۆیە دوای شەهید بوونی ئەو کادرە بەڕێزە بۆ ماوەیەک هەڤاڵانی پۆلەکەمان یەکترمان دەدی و چاوەڕێ ی پەیوەندی تازەمان دەکرد. بەڵام دەستگیر کردنی (حەیدەر جوکڵ) وای کرد ڕێکخستنەکان نەچنەوە پاڵ یەک و بە پەرتەوازەیی مانەوە. من زۆر بە گومان بووم لە پەیوەندی کردنەوە. گومانم لە هەموو شتێ دەکرد..(مامۆستا مەغدید) یش بۆچوونی وەک من بوو. لە دوای ئەو ..وو هەڤاڵەی ناوم هێنان (محەمەد قادر) دەست

نیشـــان دەکرێ بۆ بەرپرسی ڕێکخستنەکانی ناو شاری هەولێر، بەڵام بەر لەوەی بەوە ڕابگا کە ڕێکخستنەکان و شانە و پۆلە پەرتەوازەکان لە یەک گرێ بداتەوە. لە لایەن ڕژێم ئەو بەخۆی و هەڤاڵە نزیکەکانی دەســـتگیر دەکرێن..

من و کاکە زیاد قەناعەتمان وابوو کە پۆلەکەمان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە مەڵبەندی ((٤)) بکا بە پێ ی ئەوەی کە کاک کۆســـرەت لێپرسراوی مەڵبەندە و (کاکە زیاد) یش برادەرایەتی نزیکی لەگەڵ کاک کۆســـرەت هەیە.. بەڵام کاکە زیاد سەفەرەکەی دواخست. دوایە زانیم هەوڵێکی داوە لەگەڵ ڕێکخراوە نوێ یەکەی هەولێر کە شەهید محەمەد قادر بە نیاز بوو سەرپەرشـــتی بکا پەیوەندی بکا. بەڵام گرتنی شـــەهید (محەمەد قادر) بووە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو هەوڵەی.. لە دوای ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٥ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە هەولێر تووشی شکستی یەک لە دوای یەک هات و گورزی کوشـــندەی لێ وەشێندرا و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ ئەو گورزە گەیشتە پۆپەو ڕێکخراوی هەولێر بە تەواوی ئاشکرا بوو بووە هۆی گرتن و ڕاوەدوونانی بە دەیان تێکۆشـــەر و کادری ناو شارو بە تەواوی ڕێکخستن تووشی لاوازی و پەرتەوازەیی بوو.. بە درێژایی تەمەنی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە هەولێر گورزی وا گەورەی لێ نەدراوە کە بەعسی یەکان شانازییان بەو ســـەرکەوتنە دەکرد و لە چەندین بۆنەی خۆیان باســـیان کردو ئەفسەرە دڕندەکانیان چەندین پاداشتیان وەرگرت و پلەیان پێ زیاد کرا.. بە دەیان گەنجی بێ گوناە گوللە باران کران و چەندین کادری ڕێکخســـتن چوونە ژێر پەتی سێدارەو چەندین مناڵ هەتیو و چەندین ژن بێوەژن بوونەوە..

## * مانگێک لە دڵەڕاوکێ..

لە دوای ناوەڕاستی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٦ هەواڵم پێ گەیشت کە (موحسین ئیبراهیم حەسەن) و چەند کەسێکی تر ئاشکرا بوونە و لە لایەن ئەمن دەستگیر کراون.. (شێرزاد عوسمان) ئەو ڕۆژەی ئەمن دێتە سەر ماڵەکەیان ئەو لە گوندی (سۆربەش) دەبێ و هەر لەوێ هەواڵی بۆ دەنێرن کە نەگەڕێتەوە ناو شار و ناوبراو هەر لەوێ پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگە دەکا. ئیتر دوای گرتنی ئەو برادەرە کە پێشتر ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە من هەبوو دوایەش (شێرزاد عوسمان) لەگەڵ من لە یەک کەرت بوو. کە چوونەتە سەر ماڵی ئەو هەڵبەتە دێنە گیانی منیش.. ترس و دڵەڕاوکێ باڵی بەسەرداکێشام. زۆر بیرم دەکردەوە ئایا لەخۆمەوە کارەکەم جێ بێڵم و منیش پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگە بکەم و خۆم لەو ترس و دڵەڕاوکێ یە دەرباز بکەم.. بەڵام من خاوەنی پێنج منداڵی وورد بووم کە هەر پێنج منداڵ کچ بوون و لە من زیاتر کەسی تریان نەبوو. باشە من ماوەی زیاتر لە ((٩)) مانگ دەبێ ئەوانەم نەدیوە و هەواڵیان نازانم و چ پەیوەندی یەکی ئەوتۆمان نەماوە. زۆر بیرم کردەوە بە ڕاستم نەزانی بێ ئەوەی بزانم ناوم هەیە یان نا بۆی دەرچم و لەوانەشە ڕێکخستن ئەوەم لێ قەبووڵ نەکا بەبێ هیچ پاساوێکی ئەوتۆ پۆلەکە جێ بهێڵم و پەرتەوازەیان بکەم. لە لایەکی تریش ژیانی ماڵ و منداڵیش تێک بچێ و لە دەمی حەزیا جێ یان بهێڵم.. هەرچەندە زۆر بە ئازار دەژیام و ساتەکانم لەناو گێژاوەی فکر و لێکدانەوەی بەردەوام دەگوزەراند. شەوانە خۆم و دایکی منداڵەکانم وەک ئێشک گر بەدیار پەنجەرەکەوە بووین، ئەویش داوای لێ کردم بە جێ یان بهێڵم و خەمی ئەوانم نەبێ، بەڵام من هەر دەمگوت من پەیوەندیم لەگەڵ ئەوانە نی یە. هەر بە ڕاستیش لەو کۆمەڵە خەڵکەی کە گیرابوون من تەنیا (موحسین ئیبراهیم حەسەن) م دەناسی کە پێشتریش پەیوەندیم لەگەڵی هەبووە. ئەگینا ئەوانی تر کە

یەکێکیان (ئازاد ســـەعید) ی کوڕی مامی دایکی منداڵەکانم بوو بە هیچ شێوەیەک پەیوەندی ڕێکخستنم لەگەڵیان نەبووە.بەڵام هاتنە سەر ماڵی (حاکم شـــێرزاد عوسمان) گومانی زۆری لا دروست کردم. بە پێ ی ئەو زانیاریانەی دوایە لە دەمی خۆیانم بیســـت گرتنەکە بەو شێوەیە بووە:-

لە سەرەتاوە مامۆســـتا (بایز مەولود نانەکەلی) دەگیرێ و دوایە لە ڕێگای ((خالید))ی برای کە ئەندامی ئەنجوومەنی یاســـا دانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمـــی بوو بەهۆی چەند بەرپرســـێکی تر دوای شـــەوێک یان چەند شـــەوێک کە لە بیرم نەماوە ئـــازاد دەکرێ. مامۆســـتا بایز بەر لەوەی بگەڕێتـــەوە ماڵەوە دەچێ هەواڵ دەداتە چەند برادەرێک لەوانە: محەمەد قادر - موحســـین ئیبراهیم- سامی شوانی- مامۆستا سلێمان کە ئەوانە ناویـــان لە ئەمن هەیە و خۆیـــان دەرباز بکەن باشـــە..بۆ ڕۆژی دوایی محەمەد قادر کە فەرمانبەر بووە لە بگۆڕی نەخۆشخانەی کۆماری مۆڵەت وەردەگرێ و بە نهێنی خـــۆی دەگەیەنێتە ناوەندی کۆمەڵە.لەوێ چاوی بە کاک نەوشـــێروان دەکەوێ و پێ ی دەڵـــێ کە ناویان لە ئەمن هەیە، بەڵام کاک نەوشـــێروان قســـەکەی بە گرنگ وەرناگـــرێ و پێ ی دەڵێ ئەو قســـانە تەنیا گومانە.پێویست ناکا لە کارەکەی سارد بێتەوە.. بەو شێوەیە (محەمەد قادر) دەگەڕێتەوە ناو شار و دوای گەڕانەوەی شەوێک خۆی دەشـــارێتەوە و ناچێتەوە ماڵەوە و ناچێتەوە سەر کارەکەی.دوایە کە زانی کەس نەهاتۆتە ماڵیان و کەس لە فەرمانگە پرسیاری نەکردووە پێ ی وایە دونیا شـــامی شەریفە.ئیتر دەچێتەوە سەر کارەکەی خۆی و دەوام دەکاتەوە تا ئەو کاتەی قۆڵبەستی دەکەن و بۆ ئەمن دەیبەن.هەر دوای ئەویش - ســـامی مەحمود شوانی - مامۆستا سلێمان و موحسین ئیبراهیـــم دەگیرێن و لە ماوەی حەفتەیەک ئازاد ســـەعید هێلەوەیی - سەردار محەمەد ڕەجەب و عماد لە گەڕەکی دەواجن دەستگیر دەکرێن و دوایەش غەفور دەروێش و سەمەد بێتواتەیی و جەمیل مەجید سادق مەلا قەرەیی و نەسرەدین مامە کەریم و مامۆستا خدر دەگیرێن دوای ئەوانەش

دیـــاره له ئه‌نجامی لێکۆڵینه‌وه سـامی مه‌حمود ده‌ڵـــێ ئێمه ده‌مانزانی ده‌ســـتگیر ده‌کرێین لێ ی ده‌پرســـن چۆنتان ده‌زانـــی..؟ پێ یان ده‌ڵێ ((ماموٚســتا بایز پێ ی وتین که ناومان لێره هه‌یه..)) ئیتر ئه‌و قسه‌یه جارێکی تر بووه هۆی ئه‌وه‌ی که ماموٚســـتا بایز مه‌ولود بگیرێته‌وه،دوای گیرانی ماموٚســـتا بایـــز ئه‌و جاره جه‌مـــال مه‌ولود بلباس و ده‌رســـیم دیبه‌گه‌یی له لایه‌ن مه‌نزوومه‌ی ئیستخبارات ده‌ستگیر ده‌کرێن و ڕه‌وانه‌ی ئه‌منیان ده‌که‌ن گوایه ئه‌وانیش په‌یوه‌ندیان به ماموٚســـتا بایز هه‌بووه..

له‌ناو ئه‌من براده‌ران هه‌ر کاتێک ڕه‌خنه‌یان له ماموٚستا بایز بگرتایه که ئه‌و بۆته هۆی ئاشکرابوونی ڕێکخراو.لێ یان ڕاست ده‌بووه‌وه‌و ده‌یگوت:- (ئـــه‌رێ فلان من نه‌هاتمه لات و پێـــم نه‌وتی ناوت هه‌یه خۆت ده‌ربازکه ئـــه‌دی تۆ نه‌هاتمه لای تۆش وام نه‌وت بـــۆ خۆتان ده‌رباز نه‌کرد..به‌ڵام ئه‌وان بۆ ئه‌و قسه‌یه وه‌ڵامێکیان نه‌بوو..ئێستا له‌و براده‌رانه نه ماموٚستا بایز و نه محه‌مه‌د قادر و نه ماموٚســـتا ســـلێمان ماون..من ناتوانم له‌وه زیاتر بچمـــه ناو ورده‌کاری یه‌کان چونکه ئه‌و دوانزه که‌ســـه په‌یوه‌ندی یه‌کیان به من و به گرتنی من نه‌بووه .ئه‌وه‌نده‌ی که باسم کرد له ده‌می خۆیانه‌وه گوێم لێ بووه..شـــاهیدی ئه‌وه‌م که له‌پێش من چیان ده‌وت.. (ماموٚستا سلێمان) به‌هۆی ئه‌شکه‌نجه‌دان گیان له ده‌ست ده‌دا.ئه‌و کاتی که من گیرام ئه‌و شـــه‌هید بووبوو. به‌و شـــێوه‌یه ڕێکخـــراوی کۆمه‌ڵه‌ی ڕه‌نجـــده‌ران لـــه هه‌ولێر به‌ر لـــه‌وه‌ی خۆی بگرێته‌وه شکســـتی خوارد. شـــه‌هید محه‌مه‌د قادر ئه‌و ڕاســـپێردراو بوو ببێته به‌رپرســـی ڕێکخراوی هه‌ولێر به‌ڵام به‌ر له ته‌واو کردنی کاره‌کانی به‌و شـــێوه‌یه ده‌ســـتگیرکراو کادره بنه‌ڕه‌تـــی یه‌کانی ئه‌و ڕێکخراوه به‌و شـــێوه‌یه ده‌ســـتگیر کران..

له کاتی گرتنی هه‌ر براده‌رێکی ڕێکخستن ده ڕۆژی یه‌که‌م ترسی ئه‌وه هه‌بـــوو هاوڕێ یانی تری به‌دوادا بگیرێن.لـــه دوای ئه‌وه‌ی ئه‌و ماوه‌یه‌ش تـــه‌واو بوو نزیکه‌ی مانگێک زیاتر به‌ســـه‌ر گرتنی ئه‌وانه تێپه‌ڕی. من له ده‌وام کردنه‌که‌م ئاسایی ده‌وامم ده‌کرد. کوڕێک له پرسگه‌ی پارێزگا هه‌بوو

جێگای باوەڕ بوو مفەوەزی پۆلیس بوو خەڵکی شاری کەرکوک بوو،لەسەر پشکنینی ئەو کەسانە بوو کە دەهاتنە ژوورەوە. پێشتر ئاگادارم کردبووە وە ئەگەر مەفرەزەیەکی ئەمن یان چەند کەسێکی ئەمن هاتنە ژوورەوە ئەو تەلەفۆنی ژوورەکەم دەزانێ و ئاگادارم بکاتەوە.. ئەو کاتی زیاتر لە دوو مانگ بوو لە هۆبەی (خۆیەتی کرێکاران) دەوامم دەکرد کە پێشتر لە (هۆبەی نهێنی) دەوامم دەکرد.دوای ئەوەی کابرایەکی عەرەبی کەرکوک کە لەبەر تەزویر و دزی لە کەرکوک بۆ هەولێر دوورخرابووە وە. بەڵام لەبەر ئەوەی عەرەب بوو ڕەفیق حزبی بوو یەکسەر لای ئێمە لە (هۆبەی نهێنی) جێگیریان کرد و دوایەش لە شوێنی کاک (هادی ساڵح) کردیانە بەرپرسی ئەو هۆبەیە.. یەکەم کاری ئەوە بوو منی لە (هۆبەی نهێنی) لاداو چوومە (خۆیەتی کرێکاران) ئەوساکە (ئیبراهیم زەنگەنە) پارێزگاری هەولێر بوو.ناوبراو خەڵکی ناحیەی (باوەنوور)ی گەرمیان بوو کە سەر بە قەزای ((کەلار))ە ماوەیەک بوو لە هەولێر فەرمانبەر بوو زۆرجار بە (ئەبو نادیە) عەرەبەکان ناویان دەبرد..ئیبراهیم زەنگەنە تا بڵێ ی دڵسۆزی حزبی بەعس بوو تا بڵێ ی دوژمنی نەتەوەکەی خۆی بوو..تەنانەت ئامادە نەبوو لەگەڵ ئێمە بە کوردیش قسە بکا.. پیاوێکی قین لە دڵی هەناو ڕەش بوو. لەبەر ئەوەی وەک ڕێوی لە کونەکەی خۆی هەڵگەڕابووەوە، بۆیە کردیان بە پارێزگار.. لە سەردەمی ئەو خوێن مژە خائینە بە دەیان گەنجی ئەو شارە دێرینە گوللە باران کران..لەوەتەی هەولێر هەیە پارێزگاری لەوە پیسستری بەخۆوە نەدیوە..

بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ١٩٨٦/٣/١٩ کە تازە چووبووینە ناو فەرمانگەو لە ژوورەکانی خۆمان دانیشتبووین، هەواڵێک بڵاو بووەوە کە گوایە تەقەیان لە پارێزگار کردووەو خۆی و سایەقەکەی (ج. ع. ب) بریندارن. حاجی عوسمان کە فەرمانبەری هۆبەی کشتوکاڵ بوو لەناو پارێزگا هاتە ژوورەوەو پەنجەی هەڵشەقاند و وتی:- (وەڵا ئەوڕۆ خۆشترین ڕۆژمە کە لەو سەگبابەیان دایە..) ئیتر

ئەوەی تۆزێک هەستی کوردایەتی هەبوا زۆری پێ خۆش بوو کە لەو تاوانبارە دراوە.. دوای یەک دوو سەعات هەواڵەکەمان وا پێ گەیشت کە (ئیبراهیم زەنگەنە) تەنیا دەستێکی زامدارەو هیچی لێ نەهاتووەو ئەوانەی تەقەیان لێ کردووە دەرباز بوونە..زۆر پێمان ناخۆش بوو کە ئەو کابرایە هیچی لێ نەهاتووە. لە لایەکیش ئەوەمان پێ خۆش بوو کە ئەوانەی تەقەیان لێ کردووە دەرباز بوونە. کەمێک مابوو ببێتە سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ لە کاتێک (ئەحلام) ئەو کچە بوو کەپێشتر چەند ساڵێک لە هۆبەی نهێنی بەیەکەوە بووین، هاتبووە لام وەک سەردان و وەفاداری من ناردم چایەکی بۆ بێ. نێوان ژوورەکەی من و ژووری لێپرسراوی خۆیەتی کە ئەو کات (سەید داود) بوو تەنیا بە فایبەر گیرا بوو. گوێم لێ بوو زەنگی تەلەفۆنەکەی لێ ی دا.دوایە گوێم لێ بوو بانگی فەراشەکەی کرد گوتی بە (سەعدی) بڵێ لە هۆبەی نهێنی کاریان پێ یە..ئەو ماوەیەی من لە (هۆبەی نهێنی) نەمابووم ڕۆژانە (حوسێن) بە دوای دا دەناردم بۆ ڕاوێژ و دۆزینەوەی هەندێ بەرایی یەکان کە ئەوان شارەزایی یان لێ ی نەبوو دەچووم کارەکەم بۆ ڕاست دەکردنەوە.. بەڵام ئەوجارە تەلەفۆن بۆ خۆم نەکرا وەک جاران تەلەفۆن بۆ بەڕێوەبەرەکە کرا..(ئەحلام) یش وەک من گوێ ی لە قسەکان بوو بۆیە هەڵسایەوە و گوتی÷ (قەی ناکە جارێکی تر دێمەوە چایەکە دەخۆم،ئێستا کاریان پێتە..) ئەو چووە دەرەوە منیش ویستم لە دوو ئەو بچمە دەرەوە و کاک (قادر) کە بەردەستی هۆبەکەمان بوو پێش خۆم ڕەوانەی هۆبەی نهێنی بکەم تا بزانێ کێ لەوێ یە..نازانم چۆن بوو ئەو جارە تەلەفۆنەکە و ڕەوانەکردنەکە بە دوام بە ئاسایی نەدەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی هەستی شەشەمم هەواڵێکی پێ دابم..

من بۆ دەرگا هاتم کە بانگی کاک (قادر) بکەم لە دەرگا تووشی (حوسێن) و دوو کەسی تر بووم. حوسێن پەنجەی بۆ درێژ کردم وتی÷ (هذا سعدی) ئیتر هەردووکیان بە ئەسپایی هاتنە تەکم و وتیان بچینە

خواره‌وه بۆ مه‌ســـه‌له‌ی سه‌یاره‌كه‌..من وتم ÷ سه‌یاره‌ی چی..؟ هه‌ڵبه‌ته‌ به‌ زمانی عه‌ره‌بی قســـه‌مان ده‌كرد.یه‌كێكیان وتی÷ ئه‌ولا و ئه‌ولا مه‌كه‌و له‌گه‌ڵمان وه‌ره‌ خواره‌وه‌. ســـه‌یرێكی ئه‌ولا و ئه‌ولام كرد، ده‌ســـتیان بۆ ده‌مانچه‌ برد هه‌ڕه‌شه‌یان كرد كه‌ ده‌مانچه‌كانیان سواره‌ ئه‌گه‌ر جووڵه‌یه‌ك بكه‌م یه‌كسه‌ر لێم ده‌ده‌ن.. به‌و شێوه‌یه‌ چۆن گورگ گوێ ی مه‌ڕ ده‌گرێ و مه‌ڕه‌كـــه‌ خۆی له‌گه‌ڵ گورگه‌كه‌ له‌ مێگه‌ل دوور ده‌كه‌وێته‌وه‌ به‌ره‌و مه‌رگ منیـــش له‌گه‌ڵیان چوومـــه‌ خواره‌وه‌..كه‌ گه‌یشـــتینه‌ لای (حه‌مه‌ ڕه‌ش) سوپاســـیان كرد من سه‌یرێكی حه‌مه‌ ڕه‌شم كرد وه‌ك ئه‌وه‌ی پێ ی بڵێم (بۆ وات به‌سه‌ر هێنام ئه‌ی چیم پێ وتی..؟) له‌ گه‌راجه‌كه‌ سه‌یاره‌یه‌كی (GL) له‌ حه‌وشه‌كه‌ وه‌ستابوو دوو نه‌فه‌ری تری تیابوو به‌ زۆر منیان فڕێ دایه‌ دواوه‌ی ســـه‌یاره‌كه‌و له‌ولا و له‌ولام دانیشتن و ده‌ستیان گرتم. ســـه‌یاره‌كه‌ به‌ تیژی له‌ گه‌راجی پارێزگا ده‌رچوو.هه‌ر له‌ فلكه‌ی یه‌كه‌می لای پارێزگا چاویان شه‌ته‌ك دام.به‌ڵام به‌ گوێره‌ی ڕه‌وتی سه‌یاره‌كه‌ زانیم چووینه‌ ناو (مدیریه‌ امن اربیل) ئه‌و شـــوێنه‌ی له‌ كۆتایی شه‌ســـته‌كان بۆ خوێندنی ســـه‌رچاوه‌ی زانیاری چووبووینه‌ ئـــه‌وێ كه‌ په‌رتووكخانه‌ی گشتی بوو ئه‌و ده‌م.! چه‌ند سه‌یره‌!!! له‌ وڵاتی ئێمه‌ په‌رتوكخانه‌ ده‌بێته‌ باره‌گای ده‌زگایه‌كی داپلوســـێن بۆ ئه‌شـــكه‌نجه‌ و ســـوكایه‌تی كردن به‌ مـــرۆڤ.! زۆر ســـه‌یر بوو له‌ نێـــوان دوو خوله‌ك و لـــه‌ ده‌رگای پارێزگا تـــا ناو (ئه‌من) به‌ ده‌یان خه‌یاڵ و شـــتی ســـه‌یرم هاتـــه‌ پێش چاو.. ئیتر زانیـــم كه‌وتوومه‌ته‌ داوه‌وه‌و ده‌ربازبوونم مه‌حاڵه‌. چونكه‌ ئه‌وه‌ی بۆ ســـه‌ردان بچووبایه‌ ئه‌و شـــوێنه‌ دوای چه‌ند مانگێك ئه‌وسا ده‌گه‌ڕایه‌وه‌.

### * هاواری ژووره‌ تاریكه‌كان:

له‌وه‌تـــه‌ی مرۆڤ ده‌ســـه‌ڵاتی په‌یداكردووه‌ و لـــه‌ قۆناغی تاك چۆته‌ قۆناغی خێزانداری و خاوه‌نداری یه‌تی. چه‌وســـاندنه‌وه‌ ســـه‌ری هه‌ڵداوه‌ ئه‌شـــكه‌نجه‌ به‌ هه‌مـــوو ڕه‌هه‌نده‌كانی یه‌وه‌ بۆته‌ چه‌كێكی هه‌میشـــه‌یی

له دەســـت ((بەهێز)) دابووەو (بێ هێزەکان) یش بوونەتە کەرەســـەی بەردەم ئــەو چەوســـاندنەوەیە.. بەپێ ی قۆناغەکانی مێژوو شـــێوەی ئەشــــکەنجەش گۆڕان و گەشـــەکردنی بەخۆیەوە بینیـــوە. یەکێک لەو گۆڕانکاریانە لەشــێوەی ئاشـــکرای سەردەمی کۆن ئێســـتا چۆتە قالبی نهێنـــی و لـــە دالآن و ژووری تاریک و تەنگەبەرو تونێلی دروســـت کراو بۆ ئەو مەبەســـتە ئەشکەنجەدان ئەنجام دەدرێ.. ئەگەر سەردەمی کۆن بە شـــێوەیەکی ســـاکارو توند مرۆڤ ئەشـــکەنجە دەدرا بەڵام ئێستاکە بـــە تاکتیکی نـــوێ و لە قالبێکی تازە ئەشـــکەنجە ڕۆڵی خۆی دەبینێ.

ئیمپراتۆریەتە یەک لەدوای یەکەکان وەک بابلی و سۆمەری و ڕۆمانی و ساســـانی و ئەمەوی و عەباسی یەکان هەریەکەو شـــوێنی تایبەتی یان هەبووە بۆ ئەشـــکەنجەی ســـزادراوان و بەپێ ی یاسای تایبەتی خۆیان. یۆنانی یەکان گۆڕەپانێکی تایبەتی یان هەبووە بۆ شەڕە کۆیلەو کۆیلەکان دەبوا لـــە نێوان خۆیان بە دەســـتی خۆیان یەکتر بکوژن،وەک شـــەڕە کەڵەشـــێری ئێســـتا و پاشا و گەورەکان لە شـــوێنە بەرزەکان سەیریان بکەن..(بوەیهی)یـــەکان زۆر خانەیـــان هەبـــووە بۆ ســـزادانی ئەوانەی دەیانویســـت ســـزای بدەن بۆ ئەو مەبەســـتەش کۆمەڵێ فیلی مەشـــق پێ کراویان هەبووە بۆ شـــێلانی لاشـــەی تاوانباران و پرژانی کاســـەی سەریان..گەلێ جار فەرمانبەری پایە بەرزیش تا پلەی سەرۆکی دیوان و هەندێ جار خەلیفەی بێ دەســـەڵاتیش دەکەوتە بەر سزا و ئەشکەنجەو مێشک و کاسەی سەری لەگەڵ گڵی زۆرخانەکە تێکەڵاو دەبوو..

ئەمڕۆکە لە چەرخی بیســـت و بیســـت و یەک دا لە چەرخی ئەپۆلۆو کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت و ڕۆبۆت دا ڕژێمە دکتاتۆری یەکان و حزبە ڕەفتار فاشـــی یەکان تاکتیکی نوێ یان خزاندۆتە ناو شـــێوەی ئەشکەنجەدان و دوور لە یاســـای مرۆڤایەتی و مافەکانی تاک، تاقم و دەســـتەی تایبەتی یان لە چوارچێوەی (موخابەرات و هەواڵگری و ئاسایش) دروست کردووە بە بیانووی پاراســـتنی ئاسایشی نەتەوەیی یان نیشتمانی. هەندێک جار

پاراستنی ئاسایشی حزبێک تەنانەت پاراستنی سەرکردەیەک. .نازی یەکانی ئەڵمانیا چەندین گروپی تایبەتی تۆقاندنیان هەبوو،هەریەکەی لەژێر ناوێک و بۆ مەبەستێک کە تایبەت بوون بە ئەشکەنجەدان و تۆقاندن و تەنانەت بە کۆمەڵ کوشتنیش. .وەک تاقمی (غستاپۆ) بە سەرۆکایەتی (جەنەڕاڵ هیملەر)و (تیمی پاسەوانی ڕەش SS)و (دەستەی- D -) بە سەرۆکایەتی (ئۆتۆ ئۆهلیندرۆف) .ئەو دەســـتەو تاقمانە دەستەی سەرکوتکەرو ئازار دەرەو ئەشـــکەنجە دەری بەرهەڵســـتکاران بوون تا گەیشـــتە ڕێژەی بە جینۆساید کردنیان .کە زۆربەیان خەڵکی سڤیلی وڵاتە داگیرکراوەکان بوون.

لەو کاتەی حزبی بەعس لەساڵی ١٩٦٨ بۆ دووەم جار دەسەڵاتی لە عێراق گرتە دەست .جگە لە ڕەشە کوژی و جینۆساید و ترس و تۆقاندن و بەکارهێنانی تازەترین هۆکاری ئەشـــکەنجەدان لە ژوورە تاریکەکان هیچ خێـــری تری بۆ نەتەوەکانی عێراق نەبوو. ڕژێمی بەعس چەندین دەزگای داپڵۆسێنەری دروست کردبوو- موخابەڕات — ئیستخبارات — مەنزوومەی شیمالی- ئەمنی عامە و ئەمنی پارێزگاکان .دەبوا ژوورەکانیان بەو خەڵکانە پڕ بکەنەوە کە بەرنامەی حزبی بەعسیان پێ هەزم نەدەکرا. بە نوێترین و هاوچەرخترین شێوە ئەشکەنجەیان دەدان .لە عێراقدا کوردو عەرەبی شیعە مەزهەب پشکی شـــێریان لە پڕکردنەوەی ئەو ژوورانە بەرکەوت.. ڕژێمی بەعس بەشـــێک بوو لەو ڕژێمە دکتاتۆریە سەرکوت کەرانەی جیهان،بگرە بە دڕەندەترین ڕژێمـــی هاوچەرخ دەژمێردرا،خاوەنـــی کۆمەڵێ دەزگای داپڵۆسێن بوو.هەر لە ڕێگای ئەوانیشەوە دەیان کاری جینۆسایدی ئەنجام دەدا. لەبەر ئەوەی ڕژێمی بەعس بەشـــێک بووە لە سیستەمە دیکتاتۆری یـــەکان و تۆتیالیتاریەکانی جیهان بۆیە بە نموونە هێناومەتەوە کە خۆم یەکێکم لـــە قوربانیانی ژوورە تاریکەکانی ئەو ڕژێمـــە. کە دەبێتە وێنە کێشـــان بۆ ڕژێمی هاوشێوەی ئەو لە ناوچەکە و جیهان .بەتایبەتی ڕژێمە ئیستمدادی یەکانی ڕۆژهەڵات... هەر لە ڕێگای ڕایەڵەو کەناڵی جیاجیاوە دەزگای ســـەرکوتکەری دەوڵەتێک زانیاری لەویتر وەردەگرت .ئەفسەری

ئەمن و ئیســـتخباراتی عێراق لە چەند شـــوێنی دونیا خولی تایبەتی یان بۆ کرابووە وە مەشـــقیان لەسەر شێوەی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان پێ کرابوو.. بۆیە شـــارەزایی یەکی باشیان لەو بوارە هەبوو.جگە لەوەی لە ماوەی ٣٥ ســـاڵی دەسەڵاتیان بووبوونە پســـپۆڕی داپڵۆسین و چەندین دیراساتی تایبەتی یان نووسیوەتەوە و ئەفسەرەکانیان پێ گۆش داوە.. لە ڕاپەڕینی ســـاڵی ١٩٩١ نامیلکەیەکی ئەمنی عامەم بەدەســـت کەوت بەناوی ((الاستنطاق — مبادیء عامة)) واتە بەقسە هێنان — پرەنسیپە گشتی یەکان. مەبەست لەوەیە چۆن تاوانبار وا لێ بکەن دان پیا بنێ.. دیارە ئەو بڵاوکراوەیە زۆر نهێنی و تایبەت بووە بە دایەرەی ئەمن چونکە لەســـەر نامیلکەکە نوسرابوو ((لا یجوز تداوله خارج الا جهزه الامنیه)). لـــە خوارەوە باســـی ڕێبازەکانی گرتن و ئەشـــکەنجەدانی بەعس دەکەم کە هاوشـــانن لەگەڵ گرتن و ئەشـــکەنجەدانی خـــۆم و لەگەڵیان ژیاوم.

### ١- سەر لێ شێواندن و کت و پڕی:-

جەلادەکان لە دوای ئەوەی کە ناو و ناونیشـــانی کەســـی مەبەستیان وەردەگرت شـــێوەی گرتنەکەی وەک لە سەرەوە منیان گرت زۆر بە کت و پڕ و لەناکاو بوو.بەگوێرەی گرتنی کەســـانی ناو ڕێکخستنەکە ئەوا یان بەیانیان بەر لە ڕۆژهەڵات ماڵەوەیان ئابڵووقە دەدا و لەناو پێخەف دەگیرا، یان ئێواران ماوەیەک دوای بانگی ئێواران وەک دەڵێن ((ماڵ نوستنان)) بە هەمان شێوە ئابڵوقەی ماڵەکەی دەدراو لە ژوورەوە دەگیرا.یان لەسەر مێزی فەرمانگە ئەگەر فەرمانبەر بووا یان شوێنێکی دیاری کراو چاودێری دەکرا وەک ((چایخانە))، ((دوکان))، ((گەراج))،و ((ئوتێل)) و (یانە). هەوڵیان دەدا تا بۆیان بکرابایە لەناکاو کارەکەیان ئەنجام دەدا لەبەر دوو هۆ:-

یەکـــەم:- بـــۆ ئـــەوەی لەبەرچـــاوی جەمـــاوەر بـــە زەقـــی ئەو کارە ئەنجـــام نـــەدەن و ڕووی ڕەشـــی تۆقانـــدن نیشـــان نـــەدەن.

دووەم:- بـــۆ ئەوەی گرتنی کەســـی مەبەســـت نەبێتە دەنگ و زوو

بڵاونەبێتەوە نــەوەک هاوڕێکانی ئاگادار ببنەوە و خۆیان دەرباز بکەن..
بــەر لە هەموو شــتێ چاوی بە پەڕۆک شــەتەک دەدرا و نەیدەزانی بۆ کامە شــوێن و کام قەســابخانە دەبردرێ.دیارە ئەوەشیان مەبەستی تایبەتی خۆی هەبووە .بۆ ئەوەی گیراو ســەری لێ بشــێوێ و تووشــی پەشــۆکان ببێ.ئەمە لە لایەک و لە لایەکی تربۆ ســەلامەتی ئەو پیاوانە بوو کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردن.. لە ڕاســتی دا چاو بەســتانەوە کارێکی دەروونی خراپ دەکاتە ســەر گیراوەکەو حەقیقەتی لێ ون دەکا .لەوانەیە ئەو هەڕەشــەیە و گوڕەشەیەی کە لێ ی دەکرێ ئەگەر چاوی کــراوە بێ ئەوەندە کاریگــەری نابێ.تەنانەت کە دەســتی گیراوەکەیان دەگرت و ڕێنمایی یان دەکرد بە چاوی شەتەک دراوی، لە ئەنجامی زۆری ســووڕانەوەو پێچ و پەنا پێکردن.وا هەســت دەکا حەوت قات دەچێتە ژێــر زەوی و تووشــی دالآنی هەزار فولکە دەبێ. چەند جارێک بەســەر قالدرمەیەکی ســێ چوار پایەیان دەخست.دەیانهێنایە خوارەوە تەنیا بۆ سەرلێ شێوان هەر پێ یان دەگوت ( اصعد درج انزل درج – واتە سەرکەوە قالدرمەیــە — دابــەزە قالدرمەیە). زۆر جار بــۆ گاڵتە پێ کردن پێ ی دەگوترا (ســەرکەوە قالدرمەیە) گیراوەکە لە ئاستی ئاسایی زیاتر قاچی بــەرز دەکردەوەو بە توندی لە زەوی دەکوتــا دەوا و دەو ڕەتی دەبردو ئەوانیش قاقا پێ دەکەنین.. ئەو هەوڵانە بۆ سەرلێشــێواندنی گیراوەکە بوو.. بەرلەوەی دەرفەتی بیرکردنەوەی بدەن،یان تەپە سوڕی گرتنەکەی لەسەر بڕەوێتەوە زۆر بە کتوپڕی کۆمەڵێ پرسیاریان ئاراستە دەکرد. بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامەکان بکەن. هەموو پرسیارەکانیش بە دەنگی بەرز لێ ی دەکرا. وەڵامی بە پەلەشیان دەوێ تا نەیەڵن بیرە پەرش و بڵاوەکەی کۆکاتەوە یان هەندێ پرۆڤەی ســەرەتایی بەرگری بکا.. دوایە یەکســەر هەڕەشە دەست پێ دەکرد و توندو تیژی لە قسەکانیان بەدیار دەکەوت.
کە منیان لە ژوورێک ڕاگرت ئەو کابرایەی هەر بە پێوە قسەی لەگەڵ کردم یەکســەر پرسیارە یەک لەدوای یەکەکانی ئاڕاستە کردم ( (دەزانی

بۆ تۆمان هێناوەتە ئێرە..؟ تۆ ئەندامی یەکێتی نیشتمانی – تۆ ئەندامی کۆنفراسی..)) کۆمەڵێ زانیاری یان پێ وتم کە هەندێکیان ڕاست بوون و هەندێکیـــان ڕاســـت نەبوون.هەر لە چرکەی یەکەم کە هێشـــتا بە پێوە وەستا بووین ناوی چەند هەڤاڵێکیان لێ پرسیم (نوری عومەر – مەغدید مستەفا – شاخەوان مەولود) من تەنیا ئەوانەم لەبیر ماوە من نەمدەزانی شـــاخەوان کێ بوو بەڵام دووەکەی تر ئـــەو دوو هەڤاڵەی خۆمان بوون کە پێشـــتر باســـم کردن. من زانیم زانیاریم لەســـەر کۆکراوەتەوە بەڵام زانیاری یـــەکان هەمووی ورد نین. بەتایبەتی ناوی (مەغدید هەمزە) کە بە (مەغدید مســـتەفا) ناویان دەهێنا.کە نکۆڵیم لە قســـەکان کرد پێی وتم:- (تۆ ســـەعدی عەلی محەمەد ئەمین نی..؟ مەوالیدت ئەوەندەیەو فەرمانبەری و ناوی دایکت ئەوەیە..) پێم وتن ئەو قســـانەتان ڕاســـتە. وتیـــان (کەواتە چۆنمان زانی..؟) باش بوو بـــە بیرم هاتەوە کە منیان گەیاندە بەر دەرگا دەفتەری ڕاژەی ســـەربازی و ناسنامەکەی فەرمانگەم لە گیرفان بوو.یەکســـەر وتم (ئەوە پێناســـەی منتـــان لایە) وتیان (نا ســـەیرمان نەکردووە..) کە گوتم ئێوە بە هەڵـــە منتان گرتووە لەوانەیە مەبەســـتان یەکێکی تر بێ..زللەیەکم لەبنا گوێ ی درا ئێســـتاش باوەڕ ناکـــەم ئەوە زللەی دەســـت بێ وەک ئەوەی ((شـــوڵک)) بســـرەوێتە بنـــا گوێت. یەکســـەر کابرایەکە بەوانی تری گوت ((بیبەن ئێســـتا پێ ی نیشـــان دەدەین)). ئـــەو کابرایە دوایە زانیم ناوی (ملازم غەســـان) ە، خەڵکی شـــاری موســـڵ بوو یان خەڵکی قەزای ((شـــەرگات)) بوو.

## ٢- چەواشە کردن:

بـــۆ ئەوەی گیراو هەموو ڕاســـتەقینەی لێ بشـــاردرێتەوە گەلێ جار پەنایان دەبردە بەر درۆ و فشـــار تەمســـیلی ســـەیر تـــا گیراوەکە پێ چەواشە بکەن و کارێکی دەروونی خراپی بکاتە سەر و ترس لە دەروونی دروســـت بێ و زوو بەرەوپیری دان پیانان بچێ.وەک ئەوەی کە دەیبەنە

ژوورەوە لاشـــەیەکی نیوە مردووی پێ نیشـــان بدەن کـــە لەبەر ئازار لە هۆش خۆی چـــووە. دوور نی یە نەفەرێکی خۆیان ئەو ڕۆڵە ببینێ..یان لـــە شـــوێنێکی ڕابگرن گوێ ی لە هاوار هاوار و لێـــدان بێ..کەمنیان لە دەرگاکە بردە ژوورەوە یەکســـەر گوێم لە هاوار هاوارێکی تاســـاو بووکە بەڕاســـتی هاواری پیاو زۆر کار دەکاتە سەر پیاوی تر..دەنگی لێدانیش دەهات.مـــلازم غەســـان کە ئەو کات لەبەر دەمم وەســـتابوو بە یەکێکی گـــوت ((دانی پیا نەنـــا..؟)) ئەویش وەڵامی دایـــەوە÷ ((بەڵێ بەڵام کەمێکی ماوە هەمووی نەگوتووە..)) یەکســـەر گوتی÷ ((پێستی لەبەر داماڵن..)) بـــەڵام لە کت وپڕ دەنگەکە نەما بۆیـــە پێم وابوو ڕیکۆردەر بوو تەنها بۆ چەواشـــە کردنی من لێدرابوو.دەیان ڕێگای تریان هەبوو بۆ چەواشـــە کردن و دروســـت کردنی ترسێکی گەورە لە یەکەم هەنگاو نان بۆ ژوورەکان. زۆر شـــتی ناڕاســـتیان بە گیراوەکـــە دەگوت.وەک ئەوەی نـــاوی برادەرێکی بڵێن کە گیراوە و دانی بە هەموو شـــتێک ناوە.یان لە ئەنجامی قسە سەرەتایی یەکان هەندێ وشەیان لێ بدزیبا دوایە هەمان و شـــەیان بە ڕووی دابدابایەوە گوایە زانیاری یەو پێشتر لە ڕێگای تایبەتی خۆیانـــەوە زانیویانە.لەبەر ئەوەی گیراوەکە لە بارێکی دەروونی خراپ دا دەبێ هەســـت ناکا کە پێش چەند چرکەیەک خۆی ئەو قسەیەی گوتووە

### ٣ -بەڵێنی بە درۆ:-

لەدوای ئەوەی کە خۆیان دەگەیشـــتنە ئـــەو قەناعەتە کە گیراوەکە سەری لێ شێواوە و کەمێ چەواشە بووە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم کۆمەڵێ بەڵێنـــی بـــە درۆیان پـــێ دەدا وەک ئەوەی پێ یـــان دەگوت ((ئەگەر هاوکاریمـــان بکەی پێـــش ئەوەی خەڵک بە گرتنەکـــەت بزانن بەڕێزەوە دەتبەینەوە شـــوێنەکەی خۆت بەمەرجێ هەموو شـــتە ڕاســـتی یەکان ئاشکراکەی..)) هەندێک جار بەهۆی هەندێ زانیاری سەرەتایی کە لەلایەن سەرچاوەی زانیاری خۆیانەوە بەدەستیان گەیشتبوو گیراوەکە دەبەنە ناو

ئەو قەناعەتە کە زۆر بە سووکی دان بە ڕاستی یەکان بنێ و بخەڵەتێ..
بەداخەوە هەندێ لە قارەمانانی شـــار و شـــاخ کە ئازا و چاو نەترس بوونە ترسنۆک نەبوونە بەڵام بەهۆی ساویلکەیی خەڵەتاون و گیانی خۆیان لەدەست داوە و هەندێ جاریش خەڵکی تریشیان تووش کردووە..ئەفسەرە جەلادەکان دەیانزانی چ کاتێ هەڵبژێرن بۆ ئەوەی بەڵێنی بە درۆ بخەنە بەردەم گیراوەکە،بەتایبەتی ئەو کاتەی کە خاڵی لاوازی گیراوەکەیان لەوە دەدۆزی یەوە کە کەســێکی ساکارو ساویلکەیە.بەڵام ماوەی ئەو قسانەو ئەو بەڵێنانـــە تەمەنی کورت بوو.لە چەنـــد خولەکێک تێپەڕی نەدەکرد ئەگەر بیانزانیایە ئەو گیراوە ئاســان نی یە باوەڕ بە قســەکانیان بکا..
کـــە بڕیاریاندا دەســـت بـــە ئەشـــکەنجەدانم بکەن تەنیـــا لە نێوان ئـــەو شـــوێنەی کـــە لـــێ ی ڕاوەســـتابووم و زللەکم بەرکـــەوت تا ژێر ئاســـنی هەڵواســـین چەند چرکەیەک ئەو بەڵێنە بـــە درۆیەیان پێ دام.
دیـــارە ئەو کات هەســـتیان بە پەشـــۆکاوی من کردووە بۆیـــە بە پەلە قســـەکانیان کرد کە زانیان من ئەو کەســـە نیم کە ئەوان دەیانویســـت.
ئیتر لەدوای ئەو جارە قەد ڕۆژێک ئەو بەڵێنەیان بۆ دووبارە نەکردمەوە.

٤- **ئـــەشـــکەنجە** :- چاوم بەسترابووەوە و نەمدەزانی ئەو شوێنەی منیـــان بردە ئەوێ ژوور بوو هۆڵ بوو داڵان بـــوو هەیوان بوو،ئەوەندەم هەست کرد ژێرەکەم سارد و تەڕ و بۆن میز و پیسایی لێ دێ..بێ ئەوەی دەرفەتـــی هیچم پێ بدەن لەو خولەکەی لە دەرگای پارێزگا دەرچووم تا هەڵواســـینم دە خولەکی نەبرد..بە ئازارترین ئەشـــکەنجە هەڵواسینە لە دواوە.دەســـتەکانیان لە دواوە بە حەبلێک شەتەک دام لە تەک ستونێکی ئاســـن بوو،ئیتر حەبلەکەیان ڕاکێشا تا دەستم لە دواوە بەرز بووە وە و لاشـــەکەم لەگەڵی بەرز بووە وە..وام هەست دەکرد سنگم لە ناوەڕاستی بۆتە دوو لەت و هەر جارێک قاچەکانم لە ستوونەکە گیر دەکرد بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆی سەر قۆڵەکانم کەمێک کەم بێتەوە ئەوان بە کێبڵ لە قاچیان

دەدام و قاچم لە ســتوونەکە دەبووە وە، دیســان هەستم دەکرد ئێستا یان سنگم لە ناوەڕاســت دوو لەت دەبێ یان هەردوو قۆڵم لە ئانشکەوە دەپچڕێ .من چاوەڕێ ی ئــەو دوو حاڵەتەم دەکرد .بە هیوای ئەوە بووم پێش ئــەوەی قۆڵم لە ژێــرەوە هەڵتەکێ گیانم دەرچــێ.. بەڵام گیانم دەرنەچوو، تا هێزم مابوو هەر هاوارم کرد .کە لاشەکەم شل بوو هێنامیانە خوارەوە. من هەســتم نەکرد لە هۆش خۆم چووبووم،بەڵام وام نیشــان دا کــە لە هۆش خۆم چوومە .یان لە ڕاســتی دا لە هۆش خۆم چووبووم بەڵام من هەســتم نەکردووە .دەزانم لەو کاتەی لەســەر زەوی یە تەڕەکە کەوتبووم دۆلکەیەک ئاوی ســاردی یان بەسەروچاوم داکرد و دەستم بە کۆخە کۆخ کرد .دیســانەوە پرسیارەکان دووبارە بوونەوە ((پەیوەندیت بــە یەکێتی چی یە..؟ فــڵان و فلان کێن..؟)) دیســانەوە وەڵامەکەی پێشــووم دووبارە دەکردەوە: ((ئێوە بە هەڵە منتان گرتووە..)) دیسان ئەفســەرەکە هاواری دەکرد ((هەڵیواسن..)) بەرلەوەی هەڵم بواسنەوە چاکەت و کراســەکەمیان لەبەر داماڵیم،ئەوسا بە هەمان شێوەی پێشوو هەڵیانواسیمەوە. یەکێک هات و قایشی پانتۆڵەکەی کردمەوەو پانتۆڵ و شــۆرتەکەی لەبەر داکەنیم.. ئەویان ناخۆشترین سوکایەتی بوو کە پێم کرا.. لە کاتێک من هاوار هاوارم بوو لەبەر ژانی دەستم و سنگم. هەستم بە پســانی دەمارەکانی شــان و پیلم دەکرد ئەوان گاڵتەیان بە شێوەی لاشەم و درێژ و لاوازی دەکرد..ناوە ناوە دەیانگوت ((گواد شلون جسم عندە..)) واتە گەوادەی چۆن جەســتەیەکی هەیە .من کەســێکی درێژ و لاواز بووم هەر بۆ گاڵتەو ســوکایەتی ئەو قســانەیان دەکرد. پێم وایە زیندانی سیاســی هەرچی بۆ بکرێ هەر کەمە..ئاخر دایکم بە دەیان جار قنگی ڕووتی شــۆردیمە و بلوولی بۆ داناوم. ئەگەر ئێســتا پێم بڵێ کە لاشــەکەمی لەبەردەمی بۆ ڕووت بکەمەوە دڵنیام بۆی ڕووت ناکەمەوە. کەچی ئەو دڕندانە ئاوا لاشــەی ئێمەیان دەکــردە دومیەو گاڵتەیان پێ دەکرد .دیســانەوە بە هیوای ئەوە بووم لە هۆش خۆم بچم و هەست بەو

ئـــازاره نەکەم و ئیتر بـــۆ هەتا هەتایە بێدار نەبمەوە،بەڵام ئەوەشـــیان نەبوو. کە هەســـتیان کرد هێزم نەماوەو بەرەو بوورانەوە دەچم دیســـان دایانگرتمەوە .من لەســـەر تەنیشـــت کەوتبووم. گوێم لـــێ بوو یەکێکیان دەیگوت: (هۆشـــی ماوە..) بە دەیان جار بانگیان دەکرد ((ســـەعدی. ســـەعدی)) بەڵام گوێم لێ بـــوو وەڵامم نەدەدایەوە، یـــان توانای وەڵام دانەوەم نەبووە.. دیسان دۆلکەیەک ئاو بە سەروچاوم داکرا و دەستم بە کۆخە کۆخ کرد.. دیســـان پرسیارەکانیان لێ دووبارەو سێبارە کردمەوە. منیش هەمان وەڵامم هەبوو..پێ یان وتم: کە جلەکانم لەبەر بکەم،دەستم لەلا و لەولا گێڕا ئەوان جلەکانیان فڕێ دایە ســـەروگوێلاکم.تەنیا پانتۆڕ و چاکەتـــم پێ لەبـــەر کرا،نەمتوانی کراســـەکەم لەبەر بکـــەم.. نازانم ئەوەندە ئەشـــکەنجەیە چەندی خایاند، هەستم دەکرد جەستەم بۆتە دوو لەت،دەســـتەکانم لەجیاتی ئەوەی بۆ پێشەوە بێن بۆ دواوە دەچوون بێ ئەوەی من دەسەڵاتم بەســـەریاندا هەبێ. دەستیان گرتم و منیان ڕاست کردەوە، چەند شەقاوێک دووریان خســـتمەوە،دیاربوو کورسی یەک بوو لەسەر کورسی یەکەیان دانام،بەڵام خولەکێک لەسەر کورسی یەکە خۆم پێ نەگیـــرا و کەوتمە خوارەوە.گوێم لێ بـــوو یەکێکی دەنگ گەورەیان نزیـــک کردەوە هەر هـــاواری دەکرد (بەخوا من هیچم نـــی یە..) زۆری نەخایاند ئەویش بە دەردەکەی من چوو،هاواری دەگەیشـــتە کەشکەڵانی فەلەک.ناوە ناوە یەکێک بەســـەری هاواری دەکرد ((حویز قوســـە بیکە باشـــترە..)) بە کوردی یەکی شـــڕ ئەو قســـەیەی دەکرد..بەڵام تا ئەو دەمە بە کوردی پەیڤێکی لەگەڵ من بەکارنەهێنا..گوێم لە ســـیرە سیڕی حەبل و ســـتوونەکە بوو، وامدەزانی ئەو کابرایە بە پانکە هەڵواســـراوەو پانکەکە دەســـووڕێ..لە کاتێک هاواری کـــرد÷ (ئەی بابە پیلم دەرهات کوڕە بە قورعان پیلم دەرهات..) زانیم هەمان هەڵواسینەکەی منە بەڵام چاوم بەســـترابووە وە و لە زەوی کەوتبووم.کە ئازارێکی زۆری ((حەوێز عەلـــی جوکڵ)) یان دا. دیســـانەوە یەکێک هاتە ســـەرم دوو جار بانگی

کرد: ((سـەعدی — سـەعدی — چیت وت..؟)) منیش بە هیچ نازانم وەڵامم دایەوە. قۆڵیان گرتم و منیان بردەوە شوێنەکەی جاران کە چەند هەنگاوێک لەوێ دوور بوو.لەسـەر پشت درێژیان کردم و هەردوو قاچیان بە حەبل شـەتەک دام و دەستیان بە لێدانی ژێر پێم کرد.. هەر کێبلێک لەژێر قاچم دەدرا لەجیاتی قاچم ناو کەللەی سەرم دەیزریکاند..قاچەکانم پەنمان و پەنجە گەورەی قاچی چەپم هەڵتەکا..یەکێک وتی: (بەسـە قاچی سڕ بووە..) ئیتر ڕاستیان کردمەوە پاڵیان نام کە لەسەر قاچەکانم بڕۆم،بەڵام نەمتوانی وامزانی لەسـەر زەوی یەکی دەرزی چنراو دەڕۆم.. دوو جار ئەوجۆرە ئەشکەنجەیان لەسەر دووبارە کردمەوە،من و (حەوێز عەلـی جوکڵ) بەنۆبە دەخراینە ژێر ئەو ئازارانە..دوایە کە خۆیان ماندوو بوون منیان لە سـتوونێکی تر بەستەوە.نازانم چ کاتێک بوو بەڵام گوێم لێ بوو پاسـەوانێک لە یەکێکی تری دەپرسی سەعات چەندە پێ ی وت سەعات شەشە واتە من ڕۆژی یەکەم پێنج سەعات لەژێر ئازار ماومەتەوە..

یەکێکی تر لەگەڵ من لە سـتوونەکە بەسترابووە وە نازانم چ کاتێکی ئێوارە بوو،بەردەوام هاواری دەکرد..کەمێک پەڕۆکەکەی سەروچاوم لادا سەیری قاچی خۆم کرد کە پەنما بوون ئەوەندە گەورە بووبوون نەمزانی ئەو دوو قاچە قاچی خۆمن، لە هەموو ڕاستێک خوێن لێ ی بەربوو بوو. پەنجەی گەورەم پێ دەچوو لەژێرەوە شـکابێ نینۆکەکەی هەڵتەکابوو..

سـەیرم کرد کوڕەکەی لەگەڵم بەسـترابووە وە ئەویش قاچی وەکو قاچی منی لێ هاتبوو ..ئەو کوڕە دوایە زانیم ناوی (سـەرهەنگ عەبدوڵا نەجار)ە و ئامۆزای (شـاخەوان عەبـاس) ە بەداخەوە لە ئەمنی (بلدە) ئازاریـان دابوو ئەو ئێوارەیە بۆ لای ئێمەیان هێنابوو لێدانەکە زۆر کاری لە هەنـاوی کردبوو قاچەکانی زەوی نەدەگـرت و هەردوو قاچی لەگەڵ لێدان مردبوو..جگە لەوەی هۆشـی لەدەسـت دابوو بـەردەوام هاواری دەکرد (سـیدی.. می.. می.. سـم.. سـم) دوایەش بە کوردی هاواری دەکـرد (ئاو.. ئاو) لە هەشـتەمین ڕۆژ سـواری سـەیارەیەکیان کردو

بردیان بـــەڵام قاچەکانی نەبوو دوو کەس بەرزیان کردەوە و خِســـتیانە ناو ســـەیارەکە. دوایە زانیمان لە نەخۆشخانەی سەربازی شەهیدبووە..
ئەو شوێنەی من لێ ی بەسترابوومەوە زەوی یەکەی هەمووی میز بوو. من دەستم کەلەبچەی لێدرابوو ئەوسا بە حەبل بە ستوونەکە قایم کرابوو. لەسەرهەر لایەک پاڵ دەکەوتم لەبەر ساردی لایەکەم سڕدەبوو و دەتەزی،من نازانم ئەو شەوە چەند درێژ بوو، بەڵام دەزانم بەقەد تەمەنی نووح دەبوو.. لە لایەک خەریک بوو لە سەرمان ڕەق ببمەوە لە لایەک قوڕگم بۆ قومە ئاوێ شێت بوو بوو. جگە لەوەی هیچ شوێنێکی لاشەم نەبوو هاوار هاواری نەبێ.

## ٥ - بچووک کردنەوە و سووکایەتی پێ کردن:-

هەرکـــە گیراوەکە پێ ی دەخســـتە ژووری لێکۆڵینەوە هەوڵیان دەدا لە کەســـایەتی بدەن و لە نرخی کەم بکەنەوە وو ســـوکایەتی پێ بکەن. بۆ ئەوەی بەڕاستی هەستی بوروژێ و قێز لەو ڕۆژەش بکاتەوە کە تیایدا لەدایک بووە.. هەر لە یەکەم ســـاتەوە گیراوەکە دەبووە بەندەو ئەوانیش (اســـیاد). بەزۆر وایان لێ دەکرد بە بچووکترین کەسیان بلێی (سیدی) واتە گەورەم، چاویش بەسترابووە وە جا ئەو (سیدی) یە ئەفسەر بێ یان پۆلیسی ئەمن بێ یان چایچی و پاک کەرەوەی ناو فەرمانگەی ئەمن بێ. گرنگ ئەوەیە ئەوان گـــەورەو گیراوەکەش بەندە بوو ئەگەر لە دەرەوەی بەندیخانەش هەر تەنیا پێش چەند خولەکێک وەزیر بێ.. لە بڵاوکراوەکەی کە پێشتر ئاماژەم پێ ی دا ناوی (الاستنطاق) بەدیار دەکەوێ مەبەستەکە ئەوەیە کە گیراو هەست بکا کەسایەتی ئەو زۆر لە کەسایەتی لێکۆڵەرەوە نـــزم ترە. تەنانەت لەکاتی پرســـیارکردنیش دەبێ ئەمنەکە شـــوێنی لە گیراوەکە بەرزتر بێ،بۆیە گیراوەکە یان بەردەوام لەســـەر زەوی دادەناو ئەوانیش بەپێوە بوون یان لەســـەر مێز و کورسی.. جگە لەمە لە هەموو بـــارەکان دەنگی لێکۆڵـــەرەوە لە دەنگی گیراوەکە دەبـــێ بەرزتر بێ..
هەر بۆ سووکایەتی و شـــکاندنی کەسایەتی گیراوەکە تەنیا بەجوێن

قسەیان لەگەڵدا دەکرد .ئەو جوێنانە زۆر لە ئازاری جەستە سەخت و دژوارتر بوون. بەتایبەتی ئەگەر بیانزانیایە لە خێزانێکی ڕەوشت بەرز و پارێزراوی داب و نەریتە جوێنەکانیان ئاراستەی ناموسی و ئابڕووی دەکرد .هەر بۆ ئەوەی تێ بشکێ و بێزی لەخۆی بێتەوە و ورە بەربدا پەتی سێدارەی پێ خۆشتر بێ لەو سووکایەتی پێ کردنە.. ڕووت کردنەوەی جەستە و گاڵتە پێ کردنی یەکێک لە جۆرەکانی سووکایەتی پێ کردن بوو،لەبەر ئەو هۆیانە لەکاتی لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان دا جلیان لەبەر گیراوەکە دادەکەند:-

ا- سووکایەتی پێکردنی کەرامەتی گیراوەکە..بەتایبەتی ئەو کەسانەی زۆر شەرم لە بەدیارکەوتنی شوێنە هەستیارەکانیان دەکرد. تا هەست بکات ئاژەڵێکی بێ چارەنەو کەوتوونەتە بەردەم ئەو دڕندانە.

ب- چونکە لەکاتی لێدان بەڕووتی ئازاری زیاترە. یان لە ساتە ساردەکان سەرما لە ئەمنەکان بێ ویژدان تر ئەشکەنجەی دەدا..

ج- بۆ ئەوەی ئەگەر کەم و کوڕیەک لەلاشەی هەبێ بیکەنە خاڵی لاوازی و لە ڕێگای ئەم کەم و کوڕیە یاری بە مێشکی بکەن،

جگە لەو سووکایەتی پێ کردنانە لەکاتی بەرگە نەگرتنی گیراوێک یان ڕووخانی، گەورەترین سووکایەتی یان بەوە پێ دەکرد کە جوێن بە ڕێبازەکەی بدا، یان هانیان دەدا لە برادەرە گیراوەکەی خۆی بدا. ئەمەیان لووتکەی سووکایەتی پێ کردنیان بوو.چونکە ئەو گیراوە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان دەربازیش بوو ئەوا تا لە ژیان ماوە بە شەرمەزاری دەژی.

## ٦- گەڕان بەدوای خاڵی لاواز دا:-

لەنێوان خولەکی یەکەمی گیراوەکە تا کۆتایی لێکۆڵینەوە بەردەوام بە دوای خاڵی لاوازی گیراوەکە دا دەگەڕان، ئاخۆ چ شتێ کاری تێ دەکا و دەڕووخێ.. لە کامە لایەن دەتوانن تونێڵ لە چیای بەرگری هەڵکەنن.. تا لەو توونێڵەوە بچنە ژوورەوە .ئایا لەو ئەشکەنجە زۆر دەترسێ..؟ یان لایەنی ئابڕوو زۆر کاری تێ دەکا. یان شوێنێکی لاشەی لاوازە و

بەرگــە ناگریَ. گەلیَ جار وا بووە شــویَنیَکی گیراوەکە زامار بووە زیاتر ئەشکەنجەیان لەو خاڵە چڕ کردۆتەوە. هەندیَک جار نەخەوتنیان دەکردە گەورەترین هۆکار بۆ پاڵەپەستۆ خستنە سەری. چونکە کەم نووستن یان نەنووستن بۆ ماوەیەکی دریَژ کاردەکاتە سەر بیرکردنەوەو بیَ هیَزی و وەرس بوون و نەیدەتوانی بیرە ئاڵۆزەکەی بە ئاســانی کۆ بکاتەوە.. گیراوەکە ئەگەر ســادەو ســاویلکە بووا ئەوا خاڵــی لاوازی زوو بەدیار دەکەوت..

## ٧- ئامۆژگاری بەدرۆ:-

لەنیَوان ســاتەکانی لیَکۆڵیەنــەوە دا بۆ چەند جاریَــک ئامۆژگاری گیراوەکەیان دەکرد، خۆیان بە مرۆڤیَکی خاوەن بەزەیی نیشان دەدا وەک بلَیّن ( (ئیَوە بۆ وا دەکەن،خۆ ئیَمە پیَسان خۆش نی یە ئاوا ئازارتان بدەین و خۆشمان ئازار بخۆین.. ئیَوە هەر عیَراقین و برای ئیَمەن. بەلاَم خەڵەتاون و ئەو بەکریَگیراوانە لە خشتەیان بردوون.. حکوومەتی شۆڕش و سەرۆکی فەرماندە ســنگی فراوانەو لە تاوانەکانتان دەبــووریَ بەمەرجیَ بەڵیَنی وەفاداری بدەن.. چۆن دەبیَ ئیَوەی ڕۆشنبیر بەوانەبخەڵەتیَن.. دەفەرموون ئیَوە تووشی ئەو بەلاَیە بوون ئەوان لە شویَنی خۆیان با بە هاناتان بیَن..))

مەبەستیان لەو ئامۆژگاری یە ساختەیە بۆ ئەوە بوو دوو نیشانە بپیَکن:-

یەکەم:- خۆیان لە بەرانبەر گیراوەکە دا وا نیشان بدەن کە بەڕاستی ئەوان باشن و خەتای بەرهەڵستکارانە،ئەگەرنا هەر کەس لە ماڵی خۆی.. تا تۆزیَک خۆی لە قەوارەی مرۆڤ بدۆزیَتەوە. لەپاش ئەو ئامۆژگاری یە دوای ئەوەی هەستیان دەکرد گیراوەکە هیَوربۆتەوە لە کت و پڕ لیَ ی هەڵدەستانە ســەر پیَ و دەبوونەوە گورگەکەی جــاران. بەمە یاریان بە خاوبوونەوەو دووبارە گرژ کردنەوەی میَشــکیان دەکرد،کاریَکی دەروونی نائاسایی لە گیانی گیراوەکە دەکرا بۆ ئەوەی تووشی هەڵەیەکی بکەن لە قسەکانی دا.

دووەم:- ئــەو ئامۆژگاری یەش لەلایەکی تــر بۆ ئەوە بوو تا زمانی هەڵەیەک بکا و شتیَکی نائاسایی لە دەمی دەرچیَ لە کاتی خاوبوونەوەی

هەســـتی ناوەوەی کە لەوانەیە گیراو بــۆ خەڵەتاندنی ئەوان یان بۆ خۆ دوورخستنەوە لە ئەشکەنجە هەندێک لە قسەکانی ئەفسەری لێکۆڵینەوە پەسند بکا . من خۆم تووشی حاڵەتێکی لەو بابەتە بووم و زیانی پێ گەیاندم . .

دوای ئەوەی شەوێکی پڕ لە ئازاری سەرمای ناو میز و بۆنی ناخۆشم بـــەڕێ کرد . . دوای ئەوەی پێم وابوو ئەو ســـاتانە ســـاتەکانی دۆزەخن . پاســـەوانەکان لە نیوەشـــەو دا هەر جارێک یەکێکیـــان دەهاتە ژوورەود شەقێکی لێمان دەدا، ئەو کوڕەی کە لە نزیکمەوە بەسترابووە وە ئەویش هـــەر لەتاو ئازاری جەســـتەی هاوار هاواری بوو،شـــەق لێدانەکە لە کت و پڕ دەبوو چونکە چاو و دەســـتمان شـــەتەک درابوو، مەبەســـت لەو لێدانـــە بۆ ئەوە بوو نەخەوین و تا بەیانـــی بێداربین. هەرچەندە خەوتن بە هیچ شـــێوەیەک لەناو میـــز و تەڕاتی ناگونجێ . بـــۆ بەیانی جارێکی تر منیان بردەوە لای ئەفســـەرە جەلادەکە کە ناووی (غســـان) بوو،لە ســـەرەتاوە بە قسەی نەرم قســـەی کرد چەند ناوێکی پێ گوتم÷ وەک ناوی (عارف ڕوشـــدی) — (ئەنوەر عەبدوڵا)- (شـــاخەوان مەولود) — (نوری عومەر) — (مەغدید مســـتەفا) لە ڕاســـتی دا من ناوی یەکەمم و سێیەمم نەدەناســـی ئەو هەر بە نەرمی و لەسەرخۆ قسەی لەگەڵ کردم بەڵام یەکێکی تری لەگەڵدابوو لەسەرم وەستابوو ئەو بەردەوام بەسەرمدا هـــاواری دەکرد، واتە یەکێکیـــان نەرم و یەکێکیان توند .لە قســـەیەکدا هەڵەیەکـــم کرد کاتێ گوتی (تۆ دەڵێی مەغدید و نوری ناناســـم کەچی ئەوان هەردوکیان دوێنێ ئێوارە گوتیان ســـەعدی بەرپرســـمانە .) من ئەو هەڵەیـــەم کردو گوتم (کوا ئەوان نەگیـــراون . .)) ئیتر ئەو هەڵەی زمانە لێم بووە شـــانەی زەنگە سوورە و هاواریان کرد ÷ ((سەگ کوڕی سەگ ئەوە دوو ڕۆژە لێت دەدەین دەڵێ ی نایانناســـم کەچی ئێســـتاش دەڵێ ی نەگیراون . .)) ئیتر بردمیانە شـــوێنێکی تر بە دوو کەس بوو یان سێ کـــەس بـــوو تا توانیان لێیان دام و من بەولاو بـــەولای دیوار دەکەوتم و هەڵدەســـتامەوە، بـــەڵام لێدانەکە هەرچەندە بە کێبڵ بـــوو زۆر بە ئازار

بوو بەڵام هێشــتا نەدەگیشــتە ئازاری ڕۆژی یەکەم. کێشــەم ئەوە بوو توانای ئەوەم نەما لەســـەر قاچەکانم بوەستم جگە لەوەی لەگەڵ لێدانی کێبڵەکان هێڵنجم دەهاتێ بەڵام هیچ لە گەدەم نەبوو بۆ ڕشانەوە بشێ..

دوای ئـــەوەی کـــە بێتاقەتیان کردم بن هەنگڵیـــان گرتم و بردمیانە شــوێنێکی تــر کە چەند هەنگاوێــک لەوێ دوور بوو..گوێـم لە دەنگی (نووری عومەر) بــوو نەمزانی ئەوە ژوورە یان داڵانــە یان دەرەوەیە.. (غســان) بە مەبەستی خەڵەتاندن بە نووری گوت ((ئەو سەعدیە ناوی تــۆی هێناوە ئەگەر نا ئێمە تۆمان لە کوێ دەناســی..)) هەڵبەتە ئەوە بەشــێک بوو لە خەڵەتاندنی ئەمنەکان، تا هاوڕێکەی گیراو وا تێبگەیەنن کە دانــی پێ ناوە.کاک نووری کە چاوم بەســـترابووەوەو ئەوم نەدەدی تەنیا گوێم لە قســـەکانی دەبوو.لە ژووری ئازاریش نەمدی.لام سەیر بوو هەندێ قســـەی کرد کــە دەکرا و دەتوانرا نەیــکا..دوای لێکۆڵینەوە کە بەیەکەوە لە ژوورێک بووین گوتی:- ((من ناچار بووم هەندێ قسە بکەم چونکە وێنەی من و مەدامەکەم کە لە کاتی لە ئەورووپا بووین لە کەناری دەریا بۆ مەلە چووبووین گرتبوومان دەســـتیان کەوتبوو،هەڕەشەیان لێ دەکـــردم کە ئەو وێنەیە بڵاو دەکەنەوە)) دیارە ئەوســـاکە بڵاوکردنەوەی وێنـــەی لەو شــێوەیە نەنــگ بــوو بــۆ خانەوادەیەکـــی ڕۆژهەڵاتی..

بەداخـــەوە دیـــارە هەر هەمـــان ڕۆژ مامۆســـتا مەغدیـــد و نووری عومـــەر گیرابـــوون و لێکۆڵینەوەیـــان لەگـــەڵ کرابوو..چونکـــە منیان گێڕایـــەوە ژووری ئازاری شـــەوی یەکەم لـــە دوورەوە یەکێکیان بانگی کـــرد ((مەغدید ســـەعدی دەڵێ دانم بە هەموو شـــتێ نـــاوە..)) ئەو کات بە گوێـــرەی هاوەڕەکە دیاربوو مامۆســـتا مەغدید هەڵواســـرابوو. چونکـــە گوێم لێ بوو دەنگـــی ئەوبوو ئەگینا چاوم بەســـترابووە وە،بە دەنگێکی تاســـاو پڕ لە ناڵە دووجار ســـێ جار دەیگـــوت ((دامگرن)).

ئەوەی کە زۆر کاری تێ کردم هەواڵی گرتنی ئەو کابرایە بوو،چونکە پێم وابوو ئەگەر مامۆســـتا مەغدید لە دەرەوە بمابوایە لەوانەیە هەوڵێکی

زۆری بـۆ دەدام و مـن ئەوەندە تێـک نەدەچووم.بەڕاسـتی کە زانیم گیراوە،نایشارمەوە وام زانی ماڵی دونیام بەسەر وێران بووە.. دڵنیابووم لەوەی کە قسـەکەی ئەمنەکان درۆیە چۆن بە بەرچاوی خۆم درۆیان بە زمانی من هەڵبەسـتا ئەوانیش نەیانگووتوە ((سەعدی بەرپرسمانە..)) گەیشـتمە ئەو ڕاسـتی یەی تازە بەربوونمان مەحاڵـە و هەندێ درۆش لەوانەیە زیانمان زیاتر پێ بگەیەنێ.بۆیە ئەوجارە لێیانڕ دووبارە کردمەوە کە ئێسـتاش سوورم لەسەر ئەوەی کە ئەو دووانە ناناسم پێم وتن بەڵێ ئەو دووانە دەناسـم. یەکێکیان ناسـیاو و خزممە ئەوی تریان برادەرمە بەڵام نەمزانیوە ڕێکخستن بن.

مامۆسـتا مەغدیـدو نووری عومەر لـە لێکۆڵینەوە بـوون هەندێک قسـەی کاک نووریم گوێ لێ بوو بەڵام هیچ قسـەی مامۆستا مەغدیدم گوێ لێ نەبوو. بۆ شـەو و ئێوارەکە لە ژوورە پیسـەکە بووین مامۆستا مەغدیدیـان هێنایە لای من.. ژوورەکە درێژ بوو بەشـی پشـتەوەی لە شوێنی هەڵواسـینەکە جیاکرابووەوە.چەند دۆڵابێکی ئاسن ڕیز کرابوو، ئێمەیان بردە پشـت دۆڵابە ئاسـنەکان بە چاو و دەسـتی بەستراوە لە شـوێنە پیسـەکەیان دانانین. هەر هەمان ئێوارە یـان ئێوارەی دواتربوو چوار کەسـی تریان لە خەڵکی مەسـیف هێنایە لای ئێمە و لەگەڵ ئێمە لەپشت دۆڵابەکەیان دانان.شەو پاسەوانێک لەسەرمان بوو یەک یەک ناوی دەپرسـین. کە هاتە سەر یەکێکیان وتی: ((ناوت چی یە..؟)) یەکسەر گوتی ((نەبەز)) من خورپەیەک لە دڵم هات وام زانی ئەوە (نەبەز تایەر) ی لەمەڕ خۆمانە،بەڵام کەس ناوی ئەوی نەپرسـیوە..دوایە شەو درەنگ زانیم ئەوە خەڵکی مەسـیفە و نەبەزەکەی ئێمە نی یە.. چوار کەسەکە بریتی بوون لە (نیهاد یوسـف شـەریف) کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە و سەرۆکی بەشی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی لقی پیرمام بوو. (نەبەز شێخ جەواد) کە ئێستا فەرمانبەری یاسایی یە لە وەزارەتی داد (عەبدول موتەلیب) یادی بەخێر لە شەڕی کوێت نەگەڕایەوە. (تایەر مەلا محەمەد)

ئێستا فەرمانبەرە لە فەرمانگەی خۆپاراستن لە مین لە شاری سلێمانی. ئەو شـــەوە لە شـــەوەکانی تر درێژتر و ناخۆشتر و چاوەڕێ ی پێشهاتی پـــڕ لە ئازاری ترمان دەکرد. ڕۆژی نەورۆز کەس لای بەلای نەکردینەوە..

بـــۆ ڕۆژی دوای نەورۆز چەند جارێک منیـــان هێنا و بردە دەرەوەی ژوورەکە و هەوڵدانیان بۆ ئەوەی شـــتێک دەربارەی ڕێکخستن بڵێم.بەڵام مـــن نەک لە ترســـی گیانی خۆم بەڵام لەبەر گیانی ئـــەو هاوڕێیانەم کە لـــە دەرەوە بوون پێـــم باش بوو لەژێر ئازار بمرم کـــە پێم وتن: ((من ســـاڵی ١٩٨٤ هاوســـۆز بوومە لەگەڵ یەکێتی و جاروبـــار ئەدەبیاتم لە (یوســـف دەرگەڵەیی) وەرگرتووە کە پێشـــتر وەک نووســـەر ناسیومە منیش وەک نووسەرێک سەیرم کردووە.بەڵام دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ لەگـــەڵ میری چیتر ئەدەبیاتی ئەوانم نەخوێندۆتەوە.قەتیش ڕێکخســـتن نەبوومـــە..)) ئەوجارە شـــتێکی تریان بۆ دۆزیمەوە کە من نەخشـــەی لێدانی ((ئیبراهیم زەنگەنەی پارێزگار)) م داڕشتووە. بە کێبڵ ئازارێکی زۆریـــان دام و لێدانـــی پارێزگار بووە بابەتی ســـەرەکی تاوانبار کردنم. بەڵام ئەو جارە هەڵیان نەواســـیم و کارەباشـــیان لێ نەدام چونکە زۆر لـــە بـــرادەران کارەبایان لێ درا مـــن ئەو جۆرە ئەشـــکەنجەیەم نەدی.

### ٨- تۆقاندن

بۆ زیاتر گوشار و پاڵەپەستۆ خستنە سەر گیراوەکە بەتایبەتی ئەگەر بە ئەشکەنجەی ئاسایی نەگەیشتنە ئەنجامێک. هەڵدەستن بە تۆقاندنی، وەک ئەوەی چەکی لێ سوار بکەن و لەسەر سەری دابنێن و بڵێن ئێستا دەتکوژین، یان لە شـــوێنێکی ڕابگرن داوای وەســـیەتی لێ بکەن چونکە پاش چەند چرکەیەک لە سێدارەی دەدەن و قسەی وای لەگەڵ دەکەن کە بەڕاستی گیراوەکە بگاتە ئەو ڕاستی یەی ئەگەر قسە نەکا گیانی لەسەر چەند چرکەیەک ماوە..

مـــن وام زانـــی ئیتر ئەوە ســـێ یەم ڕۆژە و کەم کـــەم لێکۆڵینەوەم

لەگەڵدا کەم دەبێتەوە لە قســەکانیان وا پێ دەچوو قەناعەتیان هاتبێ. بەڵام ئێوارە وابزانم نزیکی بانگی شێوان بوو یەکێ هاتە ژوورەوەو هاواری کــرد (کێ ســەعدیە.؟) منیش وەڵامــم دایەوە. ئیتر بــە زمانە توندە هەڕەشــە ئامێزەکەیان هاواری کرد (گوم..گوم.) بە ئەســپایی هەڵسام وقۆڵی گرتم، لە ڕێگا ســاتمەم لە کوڕەکە کرد کە پێشــتر لە ستوونەکە بە یەکەوە بەســترابووینەوە. ئامۆزای شەهید شــاخەوان بوو. ئەمنەکە مستێکی لێدام ووتی (اعمی) واتە کوێرەیە!!! نازانم بۆ چ مەبەستێک بوو ئەو پەڕۆکەی کە چاومی پێ بەســترابووەوە کەمێک تەنکی کرد، ئیتربە هەمان دەردی جاران (سەرکەوە قالدرمەیە – دابەزە قالدرمەیە) تا منی گەیاندە ژوورێک، هەســتم کرد ژوورەکە گەرم بوو .پێیان گوتم کە دانیشم من لە سەر زەویەکە دانیشتم، دیاربوو یەکێک لەپشت مێزێک دانیشتبوو چاوم کەمێک لە ژێر پەڕۆکەکە دەیدی. دوایە ئاماژەی بۆ کورســیەکەی بەردەم مێزەکە کرد، منیان لەســەر کورسیەکە دانا . چاویان کردمەوە، کاغەزێک لەسەر مێزەکە دانرابوو، وەک ئەوە دانرابوو کە بیخوێنمەوە!!! لە پڕ ئەفســەرەکە لەسەر مێزەکە هەڵســایەوەو چوە دەرەوە، بەزمان پێی نەوتــم کە ئەو ڕاپۆرتە بخوێنمەوە بەڵام ئەوەی من تێی گەیشــتم ســیناریۆیەکە بۆ ئەوە بوو... منیش بە ترس و لەرزەوەچاوێکم لە سەر دەرگاو چاوێکم لەســەر ڕاپۆرتەکە بوو. بە پەلە ســەیرێکی ڕاپۆرتەکەم کرد،زانیم بە عەرەبیەکی شــڕو ســەرو گولاک شــکاو نووسراوە .ناوی چەند کەســێکی تیا بوو، وەک (شــاخەوان مولود – عارف رشدی-د- خلیل – مغدید مســتەفا-نوری عمر- انور عبدالله- محســن ابو شوارب وناوی مــن). دیارە مغدید مســتەفا مەبەســت (مامۆســتا مغدید همزە ) بووە، ناوی باپیری مستەفایە،محســن ابو شــوارب مەبەست (محسن ابراهیم حســن)ە.. ئەوەندەی پێم خوێندرایەوەو پێی ڕاگەیشــتم باسی بردنی زەمبیلەیەک (کە وشەی زەمبیلە لەناو کەوانە بەکوردی نوسرابوو) دەرمانی دەکرد کە بۆ ناو (مخربین) لە ڕێگای د- خلیل و انور عبداللەلە

کاتی شـــەری بناری ســـەفین ڕەوانە کراوە!!! وا پێدەچوو نوسەرەکەی لەجیاتی زەمبیلە وشـــەیەکی عەرەبی باشـــی نەدۆزیبێتەوە بۆیە ئاوای نوســـیبوو .نـــاوی عارف رشـــدی و د- خلیل و شـــاخەوان مولودم نە بیســـتبوو، نەمدەناســـین، ئەو انور عبداللەیەی کە نوسرابوو دانیشتووی ئازادی، ڕاســـتەوخۆ بیرم بۆ ئەو برادەرەم چو کە پێشتر باسم کردوە لە ســـاڵی ١٩٧٥ ویســـتمان ڕێکخراوێک دابنێین و لە سەرتاشخانە لە ساڵی ١٩٧٤ بوینە هاوڕێ .کە ناوی (انور عبدالله علی چاو ســـۆر ) بوو. دوای ماوەیەکی زۆر کە شـــەهید (حیـــدر عبدالله احمد ) هاتـــە ئەو هۆڵەی بەیەکەوە کۆمەڵێک خەلک بەســـترابوونەوەو باســـی خۆی کرد کە ناوی براکەشـــی دراوە بە ناوی (انور) ئەوســـاکە زانیم ئەو (انور عبدالله) یەی لەڕاپۆرتەکە ناوی هاتوە مەبەســـت (انور عبدالله احمد گەردی) بووە!!!

شـــەهید (حیدر) لەڕۆژی ١٩٨٦/٦/٢٨ گوللەباران کرا. تائەو ڕۆژەی بـــۆ گوللەبـــاران بردیان لە گەڵ ئێمـــە لە ژورێک بوو .مـــن ئەنوەرم لە ڕێـــگای (م — علـــی دەروێش عمـــر ) و نەبەز تاهیر ئەحمـــەد داود لە ســـاڵی ١٩٨٤ ناســـی .ئەویش ئەو کاتە بوو کە لەگەڵ ئەو دوە چوینە ماڵیان لە ئازادی بە بۆنەی بریندار بوونی لە شـــەڕی ســـماقوولی .بەڵام تاگیرانم هاتوچۆمان کەم بوو .مامۆستا ئەنوەر عبدالله پیاوێکی خۆراگرو کوڕێکی دڵسۆز بوو، ماڵەکەی لە ساڵە کانی هەشتاکان وەک بارەگایەکی کوردایەتی بوو ئێستا لە هەولێر مامۆستایەو برادەرێکی نزیکمـــــــــە .

پێش ئەوی بتوانم ڕاپۆرتەکە بەتەواوی بخوێنمەوە، ئەفسەرەکە هاتە ژوورەوە و یەکســـەر ووتی (سەعدی چ دەڵێی...؟) منیش ووتم (تۆ بۆ بە من باوەڕناکەی) ســـوێندم خوارد کە هیچ نازانم. بە ئەسپایی و وەک زمانی بەزەیی ووتی (من پێت باوەڕ دەکەم، بەڵام چی بکەم، هەواڵەکان هەموو وا دەڵێن کە تۆ نەخشـــەی لێدانی پارێزگارت داڕشـــتووە... من پێـــت باوەڕ بکـــەم یان نەکەم ســـوودی نی یە... ئەوە تـــازە بۆ ئەوە چووم فەرمانمان بۆ هاتووە کە تۆ نەخشەکەت داڕشتووە ئەگەر هەردانی

پێدانەنێی ئەوا دەبێ هەر ئەمشەو لە سێدارەت بدەین.. جا تۆش خاوەن ماڵ و منداڵی و دەزانم کەسێکی نەزان نی تا گیانی خۆت بۆ ئەولا و ئەولا بـــە فیرۆ بدەی. وا چاکە دان بە مەســـەلەکە بنێی و خۆت دەربازکەی، زۆر زۆر دەدرێیتـــە دادگاو یەک دوو ســـاڵ بەند کردنت بۆ دەبڕێتەوە...

بـــەلاّم من کـــە نکۆڵیم لەو مەســـەلەیە کـــرد کەبۆمـــن گۆبەندێکی تـــازە بوو لـــە لێکۆڵینەوەکـــەم داو هەم بەڕاســـتیش هیـــچ زانیاریەکم دەربـــارەی لێدانی پارێزگار نەبـــوو. ئەوجارە بڕەک بـــە توندی گووتی (مـــن دواجار پێـــت دەڵێم و بـــۆ بەرژەوەندی تۆ ڕێگاکـــەت بۆ کورت دەکەمـــەوە مەڵێ نەخشـــەکە مـــن کێشـــاومە تەنیا ئەوەنـــدە بڵێ کە تـــۆ دەتزانی ئـــەو ڕۆژەو لە کاتی دیـــاری کراو لە پارێـــزگار دەدرێ..)

من دیسانەوە نکۆڵیم لە پێشنیازەکەی کرد ئیتر هەر ئەوەندەی گووت ( (گوناهی هەتیو بوونی منداڵەکانت لە ئەستۆی خۆت)) بانگی ئەوانی تری کردو چاویان بەستامەوە، پێی ووتن (با کەمێک بە ڕچاوی خۆی ببینێ).

بـــە لێدان تا بەردەرگای ژوورێکی بچووکیان بردم. ژوورەکە گڵۆپێکی زەردی کـــزی لێ بـــوو. یەکێک لە ژوورەوە کەوتبوو چەند شـــوێنێک لە جەستەی پلاســـتەری پێوە بوو. من نەمزانی ئەو تەرمە تەرمی مردوێکە یان زیندووە هیچ هەستی نەبوو چاویان تونتر کردم کە هیچ شتێک نەبینم لـــەو چرکەیە کە بەڕاســـتی چەند خولەکەیەکی بـــەر لەمردن نەمزانی و نەمتوانـــی ڕاســـتی ئەو تەرمە بزانم هـــەر ئەوەندە دەزانم کە لە ســـەر تەرمەکـــەم پازدا جووڵەی نەبـــوو . منیان لە تـــەک دیوارێک ڕاگرت و وایەرێکی سپی ئەستور وەک وایەری ئاریەلی تەلەفزیۆن بوو یان شتێکی لـــەو بابەتە بوو لە ملی ئالاّندم. ئەفســـەرەکە نازانم لـــە دیوی دەرەوە بوو یان بەڕاســـتی لەوێ نەبوو ئەو جەلادەی لەتەکم وەســـتا بوو تا بە وەکالەتـــی عیزرائیل گیانم بکێشـــێ و وایەرەکەی لە ملـــم ئالاّندبوو بۆ خنکاندنم، دەستی بە ئامۆژگاری کردنم کرد ( (کاکە پیاوی باش بە، تۆ زگت بە ماڵ و منداڵت ناســـوتێ ئاخر دەزانی ئێستا ئێمە دەتخنکێنین و

تەرمەکەشـــت نادەینـــەوە کـــەس و کارت و هەتا دە ســـاڵی تر هەر لە گۆڕەکەت دەگەڕێن. تۆ گیانی خۆت خۆش ناوێ...؟ برا تۆ هۆش بینەوە ســـەر خۆت و قســـەیەک بکە و خۆت دەربازکە.بەڕاســـتی من زۆر پێم ناخۆشە پاش یەک چارەگی تر تۆ مردبی..)) لە ڕاستی دا من لەو ساتە کۆمەڵێ خەیاڵی دەرەوەو مناڵ و خزم و کەس و کارم بۆ هات کە چۆن دوای من وێل و ســـەرگەردان دەبن. ئەوەشم دەزانی ئەگەر بە درۆش بم گوتبـــا دەمزانی ئەو ڕۆژە لە کاتی دیـــاری کراو لە پارێزگار دەدرێ ئیتر بەوە وازیان نەدەهێناو هەزاران پرســـیاری تر بـــە دوایدا دەهات چۆنت دەزانی...؟ کێ پێ ی ووتی...؟ ئەوانە کێ بوون...؟ ئیتر چاڵ بۆ خۆم هەڵدەکەنـــم لەلایەکی تریش مرۆڤ لەو ڕۆژەی لە دایک دەبێ ئەگەر چی بە ویستی خۆی لە دایک نەبووە، بەڵام لەو ڕۆژەوە ململانێ بۆ مانەوەی دەکا و جیابوونەوەی گیان و جەستەی پێ قەبول ناکرێ.. بە لرخە لرخ ئەوەندەم وەڵام دایەوە کە ئەگەر شـــتێک نەزانـــم چۆن بڵێم دەمزانی..

دوای ئەو وەڵامەی من، دیارە غسان هەر لەبەر دەرگا بووە بە دەنگی بەرز هاواری کرد ((ســـەعدی...! وەسیەت بکە چیت هەیە پێش مردنت بیڵـــێ تا بە کـــەس و کارت بگەیەنین..)) منیش وەڵامم دایەوە کە هیچم نیـــە.. ئیتر بە کابرای گوت جێ بەجێ ی بکە.. جەلادەکە داوای لێکردم شەهادەت بهێنم و من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە وایەرەکەی لە ملم توند کرد کەمێـــک خنکە خنکم پێ کـــەوت و قوڕگم لە ژوورەوە ژانی کرد، هێواش هێواش توندی دەکرد هەر دەیگۆت (چیت ووت..؟) هەڵبەتە ئەو هەموو گفتوگۆیانە هەمووی بـــە عەرەبی بوون، بەڵام من وام بە باش زانی هەر تەرجومەکەی بنوســـمەوە و پێویستە بە عەرەبی یەکەی ناکا. بەڵام من قوڕگم گیراو خەریک بوو هەناسەم بە تەواوی ببڕێ، وەڵامم پێ نەدرایەوە. یەکسەر گوێم لە دەنگی (غەسان) بوو گووتی ((ڕاوەست ڕاوەست ئێستا میوان هەیە زۆر قەرەباڵغە تەرمەکەمان پێ ناچێتە دەرەوە. سعات یانزە لە ســـێدارەی دەدەین..)). ئیتـــر وایەرەکەی لە ملم کـــردەوەو پێ یان

ووتم ئەو ماوەیەش تا سـعات یانزە مۆڵەتت دەدەینێ ئەگەر پەشـیمان بوویتەوەو ڕاسـتیت گووت باشە، ئەگەر نا تاسعات یانزە تەمەنت ماوە. منیـان هێنایەوە پشـت دۆڵابەکان و وەک پارچـە پەڕۆکێک فڕێیاندامە سـەر زەویەکە. بەڵام نە سـەعات یانزە و نە بەیانـی و نە دوو بەیانی بانگیان نەکردمەوە. پێم وابوو بۆ بەیانی بوو چوار هەرزەکارەکەی بەستە پیازەیان خەڵەتاندبوو بـۆ قوربانی ئامادەیان کردبوو بۆیەبەو بیانووەی ئەو چـوار هەرزەکارە لـە پارێزگاریان دادە بۆیە وازیـان لە من هێنا.

لەو شوێنە پیسە ئەوەی زۆر بە دەستیەوە پەریشان بووین مەسەلەی میـز کردن بوو کە هەر لەو شـوێنە میزمان دەکـردو میزەکە دەهاتەوە ژێرمان و بەردەوام قوڕگمان ووشـک بوو بـەردەوام تێنومان بوو.ئەگەر زۆر هاوارمان بکردایە مەسـینەیەک لەو مەسـینانەی لە ئاودەسـتەکان بـوون ئاویان بۆ دێنایـن و ملمان پێوە دەنا هەمووومـان دەخواردەوەو دیسـان میزمان دەهات. سـەرما شـەوانە زۆر بێ ڕەحمانە گیانی ئازار دەداین چونکە لەلایەک گیانمان زامدار بوو لە لایەکی تر جلەکانمان لەبەر میز تەڕ بوو لەلایەکیش هێشـتا سـەرما بوو ئێمەش جلێکی ئەوتۆمان لەبـەر نەمابوو...ناوە ناوە یاسـاولێک دەهاتە ناومـان و بە ئارەزووی خـۆی شـەقی تێهەڵدەداین چۆن منالْ لە سـەر ڕێگای خۆی شـتێکی دەکەوێتە پێش و هەر بۆ یاری شەقێکی تێ هەڵدەدا ئەوانیش ئاوابوون.

لە شـەوی یەکەم کە بە ستوونەکە بەسترابوومەوە درەنگی شەو دوو پاسەوان لە ژوورەکەمان بوون دەهاتن و دەچوون، یەکێکیان لە چوون و لە هاتن لە پشتەوە پێلەقەیەکی لێ دەدام، چەند جارێک وای کرد ئەوی تریان پێی ووت تۆ بۆ لەو کابرایە دەدەی...؟ کەس تەکلیفی کردی لێی دەدەی..؟ گووتـی نا پێی گووتـەوە ((ئەی تۆ چ قینت لەو کابرایەیە. بۆ لێـی دەدەی..؟)) پێی گووت ((انت ما تعـرف هذا مزارع کلب ابن الکلب)) بۆیە ئەو ڕسـتەیەم بە عەرەبی نوسیوەتەوە چونکە تا ئێستاش نەمزانی مەبەسـتی لە (مزارع) چی یە.. یان پێشـتر ئەو کابرایە منی

ناســـیوه، چونکه واپێ دەچوو منی ناســـیبێ !!!ئەوی تر لێ ی دووباره کردەوەکه مافی ئەوەی نیه لێم بدا . ئیتر لەناو دەزگا داپلۆسێنەرەکانیش خەلکانێـــک هەبـــوون کـــە ویژدانیان تۆســـقالێکی بە بـــەرەوە مابێ .!

## ٩ – توخمی نـــاکاو

له مـــاوەی کاتەکانی لێکۆلێنـــەوەدا هەولیان دەدا بـــە هەر نرخێک بـــی گیراوەکـــە زمانـــی زەللەیـــەک بکاوقســـەیەکی لێ بقۆزنـــەوە... بـــۆ ئەو مەبەســـتە رێگای تایبەتیان بۆ پرســـیار کـــردن هەبوو وەک :

ا – کۆمەلێـــک پرســـیاری سادەوئاســـاییان لـــە گیراوەکـــە دەکرد کەوەلامدانەوەی ئاســـانەو وەلامی دروســـتیش هیچ زیـــان بە گیراوەکە ناگەیەنێ .له ناوەڕاســـتی پرســـیارەکان کتو پڕو لـــە ناکاو لەکاتێک کە مێشکی گیراوەکە لەســـەر وەلامی ڕاست ڕاهاتووە پرسیارێکی قوڕسیان لێ دەکـــرد کە پەیوەندی بـــە درکاندنی نهێنی هەبـــو، بۆئەوەی گیراو هەر لە ســـەر وەلامی ڕاســـت بەر دەوام بێ. بارێکی نـــاکاوو چاوەڕوان نە کراوی بۆ دروســـت ببێ و توشـــی زمان خلیسکانی بکا... بۆ نموونە وەک بلـــێ (تەمەنـــت چەنـــدە؟ لەمێژە ژنـــت هێناوە؟ لـــە قوتابخانە چەنـــدت خوێندوە؟ لـــە کامە وانە زیـــرەک بووی؟ نـــاوی بەڕێوەبەری قوتابحانەکـــەت چی بوو؟ ناوی لێپرســـراوی شـــانە کـــەت چی بوو؟)

ب – کۆمەلێ پرســـیار بەلێشاو ئاڕاستەی دەکرا بێ ئەوەی دەرفەتی هەبێ کە هەندێ وەلامی گونجاو بۆخۆی دروست بکا: پرسیارە بە پەلەکان بـــۆ ئەوە بوون گیراو دەرفەتی ئەوەی نەبێ وشـــە پـــەرش و بلاوەکان کـــۆ کاتەوە،بە پێچەوانە ئەو وەلامەی دێتە ســـەر زمانی کە گەلێ وەلام لەوانەیە ســـەرە داوی نهێنی درکاندن بێ و هەر ئەمەی لە دەم دەرچێ. یـــان لەوانەیە وەلامێکی ڕاســـت بداتەوە لە بەر پەلـــە کردن درکی پێ نەباو ئەفسەری لێکۆلینەوە وەلامەکە بکاتە چەکێکی کوشندە لە دژی...

ج – ئیقاعی پرسبارەکان بە گوێرەی نەخشەیەکی دیاریکراو دەگۆڕا..

بۆ چەند خولەکێک لێکۆلەرەوە زۆر لەســـەر خۆ قسەی لەگەڵ گیراوەکە دەکردو زۆر نەرمی نیشـــان دەدا .لەناکاو دەنگی بەرز دەکردەوەو هاواری بەسەر گیراوەکەدا دەکردو توندو تیژی لە قسەکانی بەدیار دەکەوت .ئەو دوو (بار)ە جیاوازە بۆ شـــپرزە بوون و سەرلێ شێواندنی گیراوەکە بوو. زۆرجـــار وادەبوو دووکەس بە یەکـــەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ یەک گیراو ئەنجام دەدا یەکێکیان توندو تیژو ئەوی تریان هێررو لە ســـەرخۆ. گیراو لـــە نێوان ئـــەو دوو حالەتە جیایە دوور لە دەســـەڵاتی خۆی بەلای ئەو پرسیارانەدا دەشکایەوە کە لێکۆلەرەوە هێورەکە لێی دەکرد.. ئەگەر زۆر ماندوو بوبێ و ئازاری زۆری پێ گەیشتبێ، بەرەو ڕوخان چوبێ ئەوا توشی هەڵە دەبێ و وەڵامی ڕاستی لێ دەدزرێ . گیراو کاتێ لەسەر خۆ پرسیاری لێ دەکرێ لە ســـەر خۆش وەڵام دەداتەوە،واهەست دەکا سەر کەوتوەو قەناعەنی بە لێکۆڵەرەوە هێناوە. بەڵام لە کتوپڕ بەســـەری دا دەقیرێنن باوەڕی بە وەڵامەکانی خۆشـــی نامینێ واهەست دەکا ئەوانە هەموو شتێ دەزانن. دەزانن ئەو وەڵامانە درۆیە. ئیتر توشی ئاڵۆزی و ڕاڕایی دەکەن.

د — لەبەر ئـــەوەی گیراوەکە لە ئەنجامـــی زۆر لێکۆڵینەوەو ئازاری جەســـتەو شـــەتەک بوونی و بێ توانایی لە بیرکردنەوە، لاوازی بەرگری کردنی پێوە دیار دەبێ، . ئەفســـەری لێکۆڵەرەوە هەر بۆئەوەی تووشـــی توخمـــی ناکاوی بکا بۆ چەند جارێک و لـــە چەند کاتی جیا جیادا یەک جۆرە پرسیاری ئاڕاستە دەکا. ئەوساکە وەڵامەکان بەراورد دەکا. خۆئەگەر جیوازی لە وەڵامەکان بەدی بکا ئەوا گیراو زیاتر دەخرایە ژێر لێکۆڵینەوەی قورس. چونکە دەیزانی شتێک لە ئارادا هەیەو تاوانبار دەیەوێ لە وەڵامی ڕاســـت ڕا بکا... زۆرجار دووبارە بوونەوەی پرسیارێک بۆ چەند جارێک بۆ ئەوە بوو تا لەیەکێک لە وەڵامەکان هەلەیەک بکاو ڕاســـتی بدرکێنێ، بۆ نموونە: پرســـیاریان دەکرد چ پەیوەندیت بە (ک) هەیە؟ لە وەڵامی یەکەمدا دەیگوت (نایناسم) ئەوپرسیارەچەندجارو لە چەند کاتێکی جیا لێیـــان دەکردەوە. ئەگەر لە یەکێک لەجـــارە کان وەڵامەکە بگۆڕایە ئەوا

گیراو خۆی توشـــی کۆمەڵێ پرسیاری تر دە کرد. وەک ئەوەی لە جاری پێنجەم لێ ی پرســـیار بکردایە چ پەیوەندیت بە (ک) هەیە؟ لە کاتێک دا راســـتەو خۆ بیری بۆ ئەوە نەچێ کە پێشتر گوتوویەتی (ک) ناناسم یەکســـەر بڵێ (لە خوێندن بەیەکەوە بووین ) دیارە بەو وەڵامەی خۆی دەخســـتە ناو تەڵەی پرسیارەکان و لێکۆڵەرەوە لە جیاوازی وەڵامەکانی پێشترو ئەو وەڵامە، سەرە داوێکی بۆ دەدۆزرایەوە. ئیتر دەیزانی گیراوەکە درۆ دەکاودرۆیەکانی بەرەو ئاشـــکرابوون دەچن... دەیان پرسیاری تری ئاڕاســـتە دەکا: چ ســـاڵێک بەیەکەوە بوونە؟ ماڵـــی لە کوێیە؟ لە کوێ یەکترتان دەدی؟ هاتوچۆی ماڵیان دەکەی؟ باسی چیتان دەکرد؟ لەناکاو پرسیارێکی بە مەبەستیان لێ دەکرد :لە کەیەوە پەیوەندیت پێوە کردووە؟

لەبارێکی تردا هەمان پرســـیار بۆچەندجارێک بە شـــێوەی جیا جیاو گوزارشتی جیا ئاڕاستەی گیراوەکە دەکرا وەک ئەوەی وابزانێ ئەو پرسیارانە جیان کە لێی دەکرێن .لەوانەیە لە یەکێک لە شێوازەکان هەڵەیەک بکاولە دەســـتی دەرچێ!!! وەک ئەوەی شێوازی پرسیارەکە وا ئاڕاستەی بکری :پەیوەندیت بە (ک) چیە؟ تۆ (ک) دەناسی؟ (ک) خزمتە یان برادەرتە ؟ کەی دواجار بە یەکەوە بوون ؟ (ک) گیراوە یان نا؟ ماڵی لە کوێیە؟ .لەوانەیە گیراو بە بێ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر وەڵامەکاندا مابێ لە پرسیاری (ک — گیـــراوە یان نا) بڵێ (نەخێر نەگیراوە ) کەچی لەوەڵامەکانی تر وتوویەتی نایناسم. ئێ کەنایناسێ چوزانێ گیراوە یان نەگیراوە .! کە خۆم توشی جۆرێک لەو حالەتەولەو هەڵەیە بووم.. وەک لە پێشەوە باسم کردوە.



من ئەوشێوە ئەشکەنجانەی کەدیم چەندجۆرێک بوون کەلەبیرم مابێ لەوانە:

- هەڵواســـینی لـــە دواوە :دەســـتت لە پشـــتەوە دەبەســـترا دوایە بـــەو دوو دەســـتە هەڵیان دەواســـی. پێـــم وایە ناخۆشـــترین جۆر لە ئەشـــکەنجە ئەو هەڵواسینەیە تا لاشەت شـــل دەبێ و نووزەت نامێنێ.
- لێدانی ژێر قاچ تا جووڵەی قاچت نامێنێ و لە هاوار هاوار دەکەوی.
- لێدانی بە کێبل و ســـۆندە لە هەموو جەســـتەت تا دەبووریێتەوە.

- جگــه لەمە برادەرانی تر لێدانی تەزووی کارەبایان دیوە، بەڵام من ئەو جۆرە ئەشکەنجەم نەدیوە.

ئەوانە جۆرە ســەرەکی یەکانی ئەشکەنجەی ناو ئەمنی هەولێر بوون جۆری ئەشــکەنجەی تریش زۆر هەبوون لەوانەیە هەندێکم لەبیر نەمابێ کــه برادەرانی تر دیویانە بــەڵام من ئەوەندەم لە بەر چاو و لەبیر ماوە.

ئێمە حەوت شــەو و حەوت ڕۆژ لە ژووری ئەشکەنجەدان ماینەوە لە ناوو میز و پیسایی. بۆ ڕۆژی هەشتەم یان نۆیەم بوو شەو پزیشکێک هات ســەیری حالی ئێمەی کرد کە چووبووە دەرەوە دیارە بە ئەفسەرەکانی گووتوە ئەوانە ئەگەر دوو ڕۆژی تر بەو لاشــه پیسە و لەو شوێنە پیسە بمێننــەوە هەموویان دەمرن. هەڵبەتە ئێمە ئەو دکتۆرەمان نەناســی و کە هات نەشــمانزانی پزیشکە. بۆیە بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە ئێمەیان هێنایە دەرەوە، حەمامێکی بچووکی لێبوو هەندێک سابوون و تاییتیان لێدانابوو فەرمانیان کرد کە خۆمان بشۆین.. ئەو برادەرەی ڕۆژی یەکەم لە پەلوپۆ کەوتبــوو ئەویش دوو کەس هەڵیان گرت و شوشــتیان من کەلەبچەکەی دەســتم لەبەر ئــەوەی خوێن چووبووە نــاو شــوێنی کلیلەکە ژەنگی هەڵهێنابوو،لێمان یاخی بــوو نەدەبووەوە. (ابو عباس) ێک هەبوو یەک لــە جەلادەکان بوو هێندەی هەوڵی دا کەلەبچەکەی دەســتم نەکرایەوە. زۆر بە نامەردی گووتی ((ســەعدی ئێستا مشار دێنین هەردوو دەستت دەبڕینــەوە لە بەر ئەوەی کەلەبچەکــە لەلامان زۆر لە تۆ بە نرخترە..)) هەر بەڕاســتی یەکێک بەخۆی و مشــارێک لە سەر ســەرم ئامادە بوو. (ئەبو عەباس) پێ ی ووت (دەی دەستی ببڕەوە) کابرا زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، بەڵام کەلەبچەکەیان بڕیەوەو دەســتیان نەبڕیمەوە.چەند جارێک (ئەبو عەباس) بە زمانەکەی خۆی ووتی (والله روحك ما تســوی های الكلبچه) واتە گیانت ئەو کەلەبچەیە ناهێنێ.(ابو عباس) وەک ئێمە کوردی دەزانــی. بە نانو نمەکی ئەو هەولێرە حەیــاتە گەورە بووبوو، ماڵیان لە خانوە قوڕەکانی بەرانبەر غاباتی کووران بوو. لە ســەردەمی ڕژێم بووە پۆلیسی ئەمن و منیشی دەناسی و خەلکێکی تری لە زیندانیان دەناسی.

کە خۆمان شوشــت ئاوەکــە ئەوەندە گەرم بــوو، ئەوەندەمان پێ

خۆش بـــوو حەزمان دەکرد لە گەرماوەکە نەیەینە دەرەوە .بەڵام بە زۆر ئێمەیان هێنایە دەرەوە .لە کاتی خۆشوشتن زانیمان قۆڵ و بازوومان لە ئەنجامی هەڵواســین چی بەسەر هاتووە . نەماندەتوانی بەپێی ئارەزووی خۆمـــان جوولەیان پــێ بکەین،جگە لە زورانەوەی پاشـــماوەی کێبل و قامچی کەهێشـــتا برینەکان قەتماغە بوون!!! چاویان بەستاینەوە، لەژێر دیوارێک ریزیان کردین، تادوای نیوەڕۆ لەو شـــوێنە ماینەوە . وابزانم ئەو ڕۆژە ١٩٨٦/٣/ بوو یان ڕۆژی دواتر بوو... دوای عەســـر ســـەیارەیەکی فریاکەوتنی ســـەربازی هات و دوو کەس ئامۆزاکەی شەهید شاخەوانیان لە سەیارەکە بارکردو ئیتر نەماندۆزی یەوە.. بۆ ئێوارە ئێمەیان هێنایەوە ژووری ئەشـــکەنجە و پشـــت دۆڵابەکان. بەڵام ژوورەکە بۆنی دیتۆڵی لێ دەهات و پاک کرابووە وە . بەڵام ئەو شەوە ساردترین شەو بوو لەو ژوورە .

**١٠- شەڕی دەروونی:-**

ئەو خاڵانەی کە لە پێشـــەوە باســـم کردوون هەر هەموویان بەشێکی گـــەورەن لە شـــەڕی دەروونی.بەڵام هەندێ خاڵ هـــەن دەمەوێ چڕیان بکەمەوە کە نەخراونەتە ناو بابەتەکانی پێشـــەوە.. ئەو خاڵانە بەردەوام وەک ئازارێکـــی دەروونی و ڕۆژانە لە ژیانی شۆڕشـــگێڕە بەندکراوەکانی ژوورە تاریکەکانی ئەمن و ئیســـتخبارات و موخابەرات و شـــوێنەکانی تر دایـــەو بە چەکێکی کوشـــندەی لە قەڵەم دەدەن.زۆر کەس وا هەســـت دەکات کـــە ئەشـــکەنجە تەنیـــا مـــاوەی لێکۆڵینەوەیـــە و بەس.نازانێ مانەوەی گیراو لە پشـــت دەرگا ئاســـنەکان.هەر هەمووی ئەشـــکەنجەی ڕۆحی و جەســـتەیی یەو هەر ســـاتێکی ســـاڵێکەو مەگەر هـــەر ئارام و ورەی شۆڕشـــگێڕانە وەک تیغ ئەو ســـات و شـــەوە درێژانـــە ببڕێ...

شەڕی دەروونی بۆ مەبەستی ڕووخاندنی کەسایەتی و دامرکاندنەوەی هەڵچوونی شۆڕشـــگێڕانە و ورە بەردان و لە ژیان بێزار بوون بوو.هەر لە چرکەی یەکەمی گیراندا جوێن و قسەی قێزەون هەستیان زامار دەکرد.. داماڵینـــی جل لەبەری و جوێن دان بە شـــتە پیرۆزەکانـــی کە باوەڕی پێ ی هەیە و دوایە شـــێوەکانی پرســـیار و لێکۆڵینەوە، بەشـــێکن لە

شەڕی دەروونی...تێنویەتی و قەدەغە کردنی پێویستی یەکانی ئاسایی، زۆربەیان بۆ ئازاری دەروونە بەر لەوەی بۆ ئازاری جەستەیی بێ. حەز دەکەم بۆ نموونە چەند خاڵێک باس بکەم لەوانەیە ئەو برادەرانەی گیراون وەک فیلمی سینەما بێتە بەرچاویان وەک:-

- لە کاتێک دا بە پارچە پەڕۆکێک چاوت نابینا دەکەن و دەبیتە (ئەبول عەلا ئولمەعەری) و لە ژووری ئەشکەنجەدان بەستراویتەوە،لەناکاو زللەیەک یان شەقێکیان دەسڕەواندێی بێ ئەوەی ئاگات لە هیچ بێ. یان پرسیارێکت ئاراستە دەکرا،یان لە کت و پڕ یەکێک لەسەرت دەوەستا و بەبێ هۆ بەسەری دەقیژاندی (تۆ فلانی..؟.. هەڵسە) دوایە بێ ئەوەی کاری پێت هەبێ لە شوێنی خۆی دایدەنایەوە.

- لەناکاو بەسەرتدا دەیانقیژاند بێ ئەوەی کارێکیان پێت هەبێ یان لەناکاو بە دەنگی بەرز ناوت دێنن بێ ئەوەی کاریان پێت بێ..

- کە لە ڕێگا بۆ کاری سەرئاو دەیانبردی بە چاوی بەستراوە ناچاریان دەکردی ڕابکەی کە زۆربەی جارەکان تووشی بەربوونەوە دەبووی یان هەر کەسێک تووشت ببا حەزی دەکرد زللەیەک یان شەقێکت لێ بدا. جا ئەمنی ئاسایی بێ یان موڕاسیل یان چایچی یان باخچەوان بووا.. هەموانیش ڕێگە پێدراو بوون بۆ ئەو شەق و زللەیە.. پێم وایە وا حاڵیان کردبوون کە بە پێ ی شەرعی ئیسلام بۆ هەر شەقێک دە خێریان بۆ دەنووسرێ بۆیە کێ بڕکێ یان دەکرد بۆ ئەوی بە لێدانی ئێمە خێری زیاتریان بۆ بنووسرێ و بەهەشتەکە مسۆگەر بکەن..

- کە لە ژووری (انفرادی) یان ژوورەکانی تر دەبووی هەر کەسێک پەنجەرە بچووکەکەی سەر دەرگاکەی بکردبایەوە تفێکی ئاراستە دەکردی. ئەویش بە مەبەستی (ئیعتیقار) .پێم وایە خێری ئەو تفە لە خێری لێدانەکە کەمتر نەبوو، ئەویش بە دەخێر بۆیان دەژمێردرا!!!

- هەر بە مەبەستی شەڕی دەروونی زۆربەی جارەکان لەکاتی ژەمی خواردن یەکێکیان دەبرد دەستیان بە ئەشکەنجەدانی دەکرد .لە شوێنێک کە دەنگی هاوارە تاساوەکەی بگاتە هەموو بەندکراوەکان.. یان لە کاتی ژەم یەکێکیان بانگ دەکرد بێ ئەوەی برادەرەکانی

بزانـــن چارەنووســـی بەرەو کـــوێ چوو.. بەمـــە بارێکی نائاســـایی لە دەروونیـــان دروســـت دەبـــوو خواردنەکەیان لێ دەبـــووە ژەهری مار..

- کاتـــێ کە دەرگایـــان دەکردەوە،بەتایبەتی لـــەو کاتانەی کە کاتی خەوتن بوو، ئەوەندە بە توندی دەرگاکانیان ڕادەهەژاند بەبەر پێلەقەیان دەدا،وەک ئـــەوە بـــوو نارنجۆکێـــک لـــە بیابانێکی ئـــارام بتەقێتەوە.

- کۆکردنـــەوەی بەندکراوێکی زۆر لـــە ژوورێکی تەنگەبەر کە جێگای خەوتنیان نەبێ و بۆنی ئاودەستی ژوورەکە ئەگەر هەیبێ و پیسی و بۆنی لاشەو ئەو جلە شڕ و شیتاڵەی لەبەریان بوو زۆر بوونی ئەسپێ وەک دەڵێن لە سوپای سلێمانی مەلیک ژمارەیان زیاتر بوو. شەڕێکی پیسی دەروونی بوو.بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە لەماڵەوە بە ناز و نعمەت پەروەردە کرابوون.

- پچڕانی بەندکراو لە جیهانی دەرەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کاری دەکردە سەر گۆڕانی سایکلۆژیەتی بە شێوەیەکی نێگەتیڤ و سروشت و بۆچوونو مێشـــک فراوانی وەک جاران نە دەما. تەنانەت هەندێ بەندکراو لە بارێکی دەرونی ئەوەندە خراپ دەژیان، بە بچوکترین شـــت مێشکیان دەورووژا . بەندکراو هەبوە بەبچوکترین شـــت لە برادەرەکەی خۆی سوور بۆتـــەوە .جگە لەوەی بە بێ بەش بوونی بەندکراو لە پێداویســـتیەکانی ڕۆژانەی کە دەقی پێوە گرتبو یان ئالودەی بووبوو وەک چایەو جگەرەو شـــیرینی و سویری و ترشی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ،حەزو ئارەزوەکانی وەک حـــەزو ئـــارەزوی منالی لـــێ دەهاتەوە.. ئەگەر دانـــی بەخۆی دا نەگرتابایە لەوانە بوو بۆ جگەرەیەک،چایەک،لەتە تورێک هاوار بکا .ئەمەو دەیان بارو دۆخی تر کە بۆ مەبەســـتی شەڕی دەرونی دەرەخسێ کە بە پێویستی نازانم هەموان باس بکەم .ئەوەی گرنگە ئەوەیە هەندێک شەڕی دەرونی لە دوای دادگایـــی کردنمان لە (ئەبوغرێب) هەر بەردەوام بوو..

## * بەرزەخی دووەم :

بەیانـــی ڕۆژی ١٩٨٦/٣/٢٧ ئەوانەی لـــە ژوری ئازار بووین کەچوار کەسەکەی پیرمام و مامۆستا مەغدیدو من و حەویز عەلی جوکل بووین. دەریـــان هێناین ئێمەیـــان بردە ژورێکی گـــەورەو یەکەیەکەیان بە دیوار بەستاینەوە .کە بۆڕیەکی یەک ئینجی بوو سەرێکی کەلەبچەکە لەدەستمان و سەرەکەی تری لەو بۆڕیە قایم دەکرا.بۆڕیەکە بە بڵندی (٣٠) سانتیمەتر لە زەوی بەرز بوو،لە سێ لای ژورەکە دەسوڕایەوە. بەرزیەکەی لە زەوی بەو ئەندازەیە بوو کەدە ســتمان لەکاتی بەســتانەوە نەگاتە سەر زەوی و پشـــوو بدا!!! دیاربوو ژورەکە قەرەباڵغیەکی زۆری تیابوو، بەڵام چاوم بەســترابووەوە کەســـم لێ دیار نەبوو. کە دەنگـــەکان دەهاتن زیاتر لە دەنگی مناڵانە دەچوو.لە ســـەرەتاوە لە شـــتێک حالی نەبووم بەڵام بۆ نیوەڕۆ کەبۆ نانخواردن چاویان کردینەوە دیتم کۆمەڵێ گەنج لە تەمەنی ١٥ — ١٧ ساڵی وەک ئێمە بەستراونەتەنەوە کە لێمان پرسین ئێوە چین ؟ وتیان ئێمە هەمومان خەلکی گەڕەکی بەســـتەپیازەین و بەزۆر کراوین بە دکتۆر، چوار کەسمان لێ جیا کراوەتەوە.. ئەو نەوجەوانانە ژمارەیان ٢٩ کەس بوون کە گیرابوون.

بەپێـــی ئەو زانیاریانەی دوایە بە دەســـتمان کەوت، ڕژێم ئەو ڕۆژەی (ئیبراهیـــم زەنگەنەی پارێزگاری هەولێر) تەقەی لێ دەکرێ هەڵمەتێکی گرتن و ڕاونانی دەست پێ کردوە جگە لە ئێمە (٢٩) مناڵ و هەرزەکاری گەڕەکی بەســـتەپیازەی گرتوە، بە بیانوی ئەوەی ئەوانەی تەقەیان لەو تاوانبارە کردوە تەمەنیان گەنج بووە!!! هەر لەژێر ئەشکەنجەو خەڵەتاندن چوار کەسیان ناچار دەکەن دان بەوە دا بنێن کە ئەوان بوونە تەقەیان لە ئیبراهیم زەنگەنە کردوە .سەیرەکە لەوەدابوو یەکێکیان لە کاتی لێدانی ئەو تاوانبارە لای خۆیان بەهۆکارێکی تر گیرابوو !!!ئەوانەش بریتی بوون لە (مەغدید ئەســـعەد ســـعید- یاسین تەها خۆشـــناو — کاکۆ تەها خۆشـــناو — لوقمـــان عەزیز ). کەچـــی ئەوانەی تەقەیـــان لە زەنگەنە

کردبوو سێ پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوون کە بریتی بوون لە (سەردار سەعید سۆفی — بەختیار جەمیل کاوانی _ ئەیوب) کە یەکەمیان شەهید بووەو دوەکەی تر ماون.

ئیتر ڕژێم بۆچاو شکاندن و بۆ ئەوەی وا لە خەڵک بگەیەنن کە دەزگای ئەمن بەتوانایەو هەموو شتێکی پێ دەکرێ و کەس لە ناو تۆڕی زانیاریەکانی بەدەر نیە. دەستی درێژکراو دەبڕێ. ئەو چوار منالە دەباو لەو شوێنەی کە زەنگەنە تەقەی لێکراوە لەبەر چاوی خەلک (کە هەندێک لە تەماشاکەرانی ئەو تراجیدیایە سەرۆک جاشە خۆفرۆشەکان بوون کەسوکاری ئەو چوار منالە بەناحەق شەهیدکراوە بە هەزار ناری عەلی و واسیتە ناتوانن بگەنە پرسگە کانیشیان ) گوللە بارانیان دەکەن.وتارێکی درێژیش پێش گوللە بارانکرنیان ئاڕاستەی خەلکەکەو بەکرێگیراوو بێویژدانەکان دەکەن کە بۆ سەیر کردنی ئەو دیمەنە بانگ کرابوون: کەیەک لە دیمەنەکانی دیرۆکی دوورو درێژی مللەتەکەمان بوو!!! پێیان ڕادەگەیەنن کە ئەو چوارکەسە تەقەیان لەپارێزگار کردووە و ئێستاش بە سزای عادیلانەی بەعسی قائیدیان دەگەیەنن. تەماشاکەرانیش چەپڵەیان بۆ لێ دەدەن.هەر بە گوللەبارانکردنیان نەوەستان.! خانوو ماڵیان لەگەڵ زەوی تەخت کراو دایک و باوکیان خرانە زیندان... ئەوە یەک لە ڕەوشتە دیارەکانی بەعس بوو کە بەردەوام سیاسەتی چەواشەکارانەی پەیرەو دەکرد.هەر کاتێک چالاکیەکی هێزی پێشمەرگە ئەنجام بدرابایە و ئەویش دەستەپاچەو هیچی بۆ نەکرابایە، دەهات تۆڵەی لە خەلکی سڤیل و بێ دەسەلات دەکردەوە. ئەو چوار هەرزەکارەی گوللەباران کران دوایەش ماڵەکانیان تەخت کران، لە دوورو نزیکەوە پەیوەندیان بە لێدانی ئەو تاوانبارە خوێنرێژە نەبوو... تەنانەت دوانیان یان زیاتر نە چەکیان دیبوو نەدەیانزانی تەقە بکەن!!!

ئەوساکە زانیم ئەو ئێوارەیەی کە بڕیار بوو سعات یانزە لە سێدارەم بدەن بۆ نەهاتنەوە دوام و داوای دانپیانانم لێ بکەن کە من پەیوەندیم بە لێدانی پارێزگارەوە هەیە،چونکە ئەوان گەیشتبوونە ئامانجی خۆیان و

ئەو چوار بەرخۆڵەیان کردە قـــــــوربانی...

هــەر دەربـــارەی تاوانەکانی حزبـــی بەعس لـــەو زورەی ئەنجام دا. شـــەوێکیان هێزی پێشـــمەرگە دێنە گەڕەکی بـــاداوەو گەڕەکی زەراعەو شەڕێکی گەورە ئەنجام دەدرێ. دیسانەوە رژێم لەجیاتی تۆڵەسەندنەوەی کوژراوەکانیـــان کە بەشـــێکیان ئەمن بوون لـــە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر،ژمارەیـــان (٨) کەس بوون. بۆ بەیانی یان دوو بەیانی بوو،باش لە یادم نەماوە هەشـــت گەنجیان لـــە زورەکەی ئێمە بردە دەرەوە، ئێمە لە ســـەرەتاوە وامان زانی ئازاد کراون، ئەوانیش بە پێکەنینەوە دەچونە دەرەوە و دوعا بوونیان لە ئێمـــــە دەخواســـت!!! کە یەکێکیان لەگەڵ ئەشـــکەنجە ڕانی شـــکابوو.ئیتر لای ئێمەو لای خۆشیان بە هیوای ئازاد بوون ڕۆیشـــتن... بەڵام دوایە بەپێی ئـــەو هەواڵە دڵتەزێنەی لە دەرەوە بەدەستمان گەیشت هەر هەشت بەرخۆڵەکە لە گەڕەکی باداوە لە شوێنی شـــەڕەکە لە بری هەشـــت کوژراوەکەی خۆیان ئەوانە گوللەباران کراون نـــەک ئازاد کراون، وەک ئێمە تێی گەیشـــتبووین. بۆ ڕۆژی دوایی چەند کەســـێکیان بردە دەرەوە بەڵام ئەوانیان ئازاد کردبوو. بەو شێوەیە ڕژێم چەند کەســـی لەو گەڕەکە شەهید کرد بۆ چەواشـــە کاری و داپۆشینی تاوانەکانی ئەوەندەشـــی ئازاد کرد. ئەو هەشت شـــەهیدەی گوللەباران کران ئەوانە بوون : (عەلی مەحمود خۆشـــناو – سابیر عەبدولڕەحمان – هیـــوا فەتـــاح – ئیبراهیم، تەمەنی ١٢ ســـاڵ بوو – وشـــیار فەتاح – حەیـــدەر، قاچـــی لە ڕانیەوە شـــکابوو – داود ســـلیمان – مغدید)

***

کاتێ کە ئێمەیان بۆ ئاودەســـت دەبرد پێنـــج پێنج دەیانبردین هەر بەجوێـــن و لێدان دەیان بردین و دەیـــان هێنایەنەوە. دەبوا لە ماوەیەکی زۆر کەم تۆ ئاودەســـــەکە چۆڵ بکەی، هێنانو بردنیشمان هەر بەڕاکردن بوو. دیارە دەســـت پاک کردنەوەو دەســـت شوشـــتن نەبوو، زۆریشمان بەهۆی کەمی خواردن و بەستانەوەی بەردەوامان توشی گیران بووبووین

بۆیــە نەماندەتوانی لەو ماوە کەمە پێویســتی خۆمان جێ بەجێ بکەین جگە لەوەی ئەگەر دابنیشــتابووینایە ئەویش بە ئازارەوە، ئەوا دەستمان پیــس دەبوو، هەر بەو دەســتەش نانمان دەخــوارد!!! هەندێک بەهۆی گیران و قەبزی ســابونی تایتیان قوت دەدا ئەگەر دەســتیان بکەوتایە.

ڕۆژێک دەرگا کرایەوە پانزە کەسەکەی ڕێکخراوی هەولێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانیان هێنایە لای ئێمـــــە. لەبەر ئەوەی ئەوان مانگێک زیاتر بوو گیرابوون وەک ( یارانی ئەشکەوت) یان لێ هاتبوو. ڕیش درێژو ڕەنگ زەردو جل دڕاو بوون، کە هەندێکیان لەگەڵ دانیشتن گونیان بەدیار کەوت!!! کە چاویان بە من و مامۆستا مەغدید کەوت پێیان سەیر بوو کە ئێمە گیراوین، چونکە زۆریان ئێمەیان دەناسی و پێیان وتین ئێوە ناوتان نەهاتوە ناوەکان کە پێشــتر ئاماژەم پێیان داوە کە ژمارەیان پانزە کەس بوون..

دەربارەی شەهید (حەیدەر عەبدولا ئەحمەد ) کە پێشتر ناوم هێناوە برای مامۆستا ئەنوەر، کە دەچن بۆماڵیان، مامۆستا ئەنوەر لەماڵەوە نابێ و (حەیدەر) لە ماڵ دەبێ و دەســتگیر دەکرێ. دیارە لە دوولاوە ئەوانە ناویــان دراوە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو ناو هاتنی (ئەنوەرو حەیدەر) لە دەمی کەســێک بە ناوی (کەمال) حەیدەر تووشــی داوی خۆی دەبێ.. حەیدەر گەنجێکی ڕێک و پێک و بێ گوناه بوو.ئەو ماوەیەی لەگەڵ ئێمە بوو بەردەوام بۆ لێکۆڵینەوە دەیانبرد .ژێر پێی ڕەش هەڵگەڕابوو. وابزانم توشی گانگرین هاتبوو.هەموو جارێ کە دەیانبرد دەیزانی بۆ لێدانە. ڕۆژێکیا ن بەگریان هاتەوە، وامان زانی ئەو جارە ئەشکەنجەکەی زۆر لە جاران زیاتر بوە، بەڵام کە هێور بووەوە پێمان وت: ئەمڕۆکە خێرە وا بەکوڵ دەگری؟ وتــی: (ئەنوەری برام گیراوە ئەمڕۆکە هێنایانــە بەردەمی من و کەمال عەیشــێ.. ماڵمان کاول بوو هەر ئەو برایەم هەبوو شتێکمان بۆ بکا...) ئیتر هەر بەردەوام بوو لە گریان. ئاماژەی بۆمن کردو وتی (کاک سەعدی دەزانێ ئەنوەری برام چ پیاوێکە). حەیدەر لە ڕەمەزان کە نانیان بۆ دێنایین ئەو نانەی بۆ پارشــێو و فتار کردن هەڵدەگــرت چونکە بەڕۆژو دەبوو.

بەداخەوە لە بەرە بەیانــی ١٩٨٦/٦/٢٨ بردیانو نەماندیتەوە.. ئەو

خانەوادەیە هەرچەندە شارســـتان بوون و لە ماڵەوەش زۆربەی جارەکان بە تورکمانی قســـەیان دەکرد، بەڵام ئەوەندە کورد پەروەر و دڵسۆزبوون بەشێوەیەک لەســـەردەمانێک ماڵەکەیان لە ئازادی بووبووە بارەگایەکی یەکێتـــی. جگەلە گیرانی ئەنوەرو لە ســـێدارەدانی حەیـــدەر دایکیان و برایەکیان بەناوی ئەســـعەد ئەوانیش بۆ ماوەی ســـالێک زیندانی کران.

یەکێک لەلای دەســـتە چەپم بەســـترابووەوە، بە چرپە تێی گەیاندم کە من دەناســـیێ.! وتـــی:- من عەبدولفەتاحم لەگەڵ کاک قاســـم بووم پێشـــتر تۆم دەناســـی. دیارە من ئەو برادەرەم نەناسیوە چونکە تەنیا ناوە نهێنیەکان لای من بوون. کە لێم پرســـی چۆن ئاشـــکرا بووە ؟تێی گەیاندم کە لە کاتی لێکۆڵنەوە لەگەڵ کاک قاســـم ناوی ئەویش هاتوە!! ئەورۆژە زانیم کاک قاســـم شـــێروانی گیراوە. دیـــارە کاک نوری عومەر لە یەکێک لە قســـەکانی ناوی کاک قاســـمی هێناوە، ئەویش دەســـتگیر دەکرێ، بەڵام لای ئێمە نەبوون لە ژورێکی تر بوون. کە بۆ پڕکردنەوەی (صحیفەاعمـــال) چووین لە ڕێگا لـــە دەرەوەی ژورەکەی ئێمە یەکێکیان لەگەڵ من برد،لەڕێگا ئەو زیندانیە کەدەستمان بەیەکەوە گرتبوو دەستی بـــە توندی کوشـــیم. نەمزانی کێ بوو چونکە نـــە دەمتوانی بیبینم و نە دەمتوانی قسەی لەگەڵ بکەم.. دوایە کە لەگەڵ کاک قاسم گەیشتینەوە یەک لە دوای چەند مانگێک وتی (من تۆم ناسیەوە بۆ یە دەستم گوشی بەلام تۆ منت نەناسی ).

عەبدولفەتاح زۆر لەگەڵمان نەمایەوە چونکە پشـــتێکی باشـــی هەبوو زوو ئازاد کرا.! ئازادکردنەکەی لای من و کاک قاســـم زۆر لێکدانەوەی بۆ کرا. بەڵام ڕۆژگارێکی زۆری بەســـەردا تێپەڕیوە بۆیە باس کردنی تازە بەتازە پێویست نیـــــــە!!!

ئەوانەی گەرەکی بەستەپیازە کە لەژورەکە لە گەڵمان مانەوە ئەوانە بوون :

١- تەحسین موستەفا ئیبراهیم،ناسراو بە تەحسین ئەلفێ،لە سێدارە درا

٢- ســـامان عوســـمان خدر — ٣- حەکیم میرزا قەســـاب خەیلانی

٤ — قارەمان قادر مەحمود خەیلانی — ٥ — ئازاد موستەفا حەمەدەمین

خۆشناو– ٦ – جەودەت نەجات عەزیز– ٧ – زایەر عەبدولرەحمان مەعروف خەیلانی–٨–نەوزۆز ئیسماعیل خەیات ڕەواندوزی–٩– رەسول بەکررەسول.

حەفتەیەک دوای ئێمە ئەوانەش درانە دادگاو بەحوکمی (مؤبد) حوکم دران جگە لە ناوی یەکەم کە بە لە سێدارەدان حوکم درا.. ئێوارەیەیەک کوڕێکــی باریکەیان هێناو لە تەک من بەســـتایانەوە. لە هەردوو قامکی شــۆێنی هەڵواســـین و لێدانی پێوە دیار بوو. کوڕەکە خەڵکی گەڕەکی لەتیفاوەی شـــاری هەولێر بوو کە یەک دوو ساڵ بوو ئەو گەڕەکە لەسەر رێگای مەخموور لە دەرەوەی سنووری شارەوانی دروست کرابوو. خەلکی کەم دەرامەت خانویان لێ دروســـت کربوو.ئـــەو گەنجە خۆیو دووبرای و یەکێکی تر لە کاتی هەولدان بۆ فڕاندنی سەیارەیەک دەستگیر دەکرێن،لە کاتی لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ کە سەر بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانن و لە لەتیفاوە پێشـــتر هەولی کوشـــتنی موختاری ئەو گەڕەکەیان داوەکە نـــاوی (عومەر) بـــوو بە ســـەختی برینداریان کردبوو. مـــن (عومەر)م دەناسی چونکە کە تیپی شانۆی کرمانج لە بنکەی لاوانی کووران کرایەوە من سەرپەرشـــتی ئەو تیپەم دەکرد (موحەمەد) کـــوڕی لای من ئەکتەر بوو کە ئێســـتا مامۆستایە لە ســـنوری قەزای دەشتی هەولێر. بەو پێیە برادەرایەتیمـــان لەگـــەڵ باوکی پەیدا کردبوو. پێم ســـەیربوو کە ئەوانە تەقەیان لێی کردوە چونکە لەلایەک نەمزانیبوو بۆتە موختار کە ئەوساکە موختـــارەکان دەزگا ئەمنیەکانی بەعس هەڵی دەبژاردن نەشـــم زانیبوو خراپەیەکی کردبێ کەچی لە هەمان سەردەم کۆمەڵێ موختاری چاوساغی ئەمن هەبوون ئێستاشـــی پێوەبێ و لەدوای ڕاپەڕینیش کەس پێی نەوتن لە پشـــت چاوتان دوو برۆیە... برایەکی ئەو کوڕە هەر لە ڕۆژی یەکەم و دوەم لەبەر کەمی تەمەنی ئازاد دەکرێ و برایەکی تریشی لەگەڵ ئێمەبوو لە ئەبوغرێب تا ١٩٨٨/٩/١٤ بە لێبوردنی گشتی ئازاد کرا. ئەو برادەرەی ئـــەو ئێوارەیە هێنایانە لای ئێمـــە ناوی (ســـابیر خدر) بوو برایەکەی تریشی ناوی باپیر بوو. شـــەهید سابیر لەگەڵ یەکێکی تر کە بەیەکەوە دەمانچەیەکیان پێ گیرابوو لە ســـاڵی ١٩٨٧ لەسێدارە دران و گەیشتنە

ڕۆژێکیان یەک لە ئەمنــەکان پێی ڕاگەیاندین کە ئەوڕوکە دەمانبەنە دەرەوە تا ئاودەســـتمان بۆ دروســـت بکەن. ئەوە بــۆ ئێمە هەواڵێکی دڵخۆشـــکەرانە بوو، چونکە لە ئازاری هێنان و بردن و لێدان دەربازمان دەبــوو!!! ڕۆژی یەکەم هەر (١٧) کەس بەیەکەوە بەســـترابینەوە، واتە هەردوو دەســـتمان بەسترایەوە، لەبەر هەتاو دایان ناین، بە ڕۆژەکە گەرم بوو، وەک بوورانەوەمان لێ هات. دووکەس یان زیاتر بوون لە گەنجەکان لە نێوان خۆیان قسەیان کرد، یەکێک ئاوی دانێ و بەبەر شەق و پێلەقەی دان. پرســـیاری لێ کردن کە باســـی چیان دەکـــرد : یەکێک لە ئەمنە پاسەوانەکان کە زمانی کوردی دەزانی وتی (ئەوە دەڵێن دەبێ چمان لێ بکـەن؟). چەندپاسەوانێکمان لە دەورو بەر بوو یەکێکیان وتی (بۆ نازانن چیان لێ دەکەین.؟ ئەوا چاوەڕێی کۆتایی هاتنی دەوام دەکەین، کە دەوام تـــەواو بوو هەموویان دەبەین لە مەیدانی ڕەمـــی گوللەبارانیان دەکەین). یەکێکی تر لێی پرســـی (ڕەزامەندی گوللەبارانکردنیان گەڕاوەتەوە...؟) ئەوی تر وەڵامـــی دایەوە ( ئەوڕۆ بەیانی ڕەزامەندیەکە گەڕاوەتەوە!!!). ئەو ئەمنە پاســـەوانانە ناوە ناوە ڕستەیەکیان دوبارە دەکردەوە لێرە بە عەرەبیەکەی وەک خۆی دەنوســـمەوە تا مەبەســـتەکە وەک خۆی بداتە دەست کە بەردەوام دەیان گوت (انتم شریفکم گواد!!!) دیارە مەبەستیان لە شـــەریفەکانمان ئەو ســـەرۆک جاش و مەفـــرەزە تایبەتیانە بوو کە بە شـــەرەف و نامووســـیانەوە لە خزمەتی ئـــەو ڕژێمـــــــــە بوون.

چاوو دەســـتمان بەسترابووەوە،قســـەکردنیش لەگـــەڵ یەک قەدەغە بوو، ئازاد ســـەعید خۆی پێ نەگیراولەگەڵ ئەوەی تەکی خۆی قســـەی کرد. یەکێک لە ئەمنەکان بۆی هاتو تا توانی مەخزەنێکی کلاشـــنکۆفی ســـرەواندێ، نازانم بەر کوێی کەوت چونکە چاومان بەســـترابووەوە.هەر هێندە گوێم لێ بوو هاواری لێ هەڵســـا.کە ئەو هاوارە گەورەترین ئازاری دەروونی بوو بۆ ئێمە. پاسەوانێک بۆ یەکێکی تر قسەی دەکرد دەیگوت (ئێســـتا ئەو ســـەگ باوکانە بدەنە دەست من بە یەک گوللە سێ سێیان

دەکـــوژم، بەدوای یەک ریزیان دەکەم). ئـــەوی تر وەلامی دایەوە و وتی ( ئەو ســـەگانە چینە هەتا گوللەیان لێ خەســـار بکەی!!! بارێگە بەمن بـــدەن و چەقۆیەکی تیـــژم بۆ بێنن من بەلێـــن دەدەم بە یەک چارەکە ســـعات هەموبانت بۆ سەر ببڕم...) بۆ ئەو گیراوانەی عەرەبیان نەدەزانی ئەوقســـانە فلووســـێکی قەلپی نەدەهێنا.بەلام ئـــەوەی عەرەبی دەزانی بـــۆ ئەو ناخۆش بوو. چونکە هەموو شـــتێک لەو رژێمـــە رەچاو دەکراو گوللە باران کردنی ئێمەش یان ســـەربڕینمان زۆر ئاسایی بوو.ئەو قسانە ئەگەر بۆ ترســـان و ئازاردانی دەروونی ئێمەش بووا بەلام گوزارشتی لە قیـــن و دڕندەیی تاکەکانی ناو ئەو دەزگا داپلۆســـێنەرانەو رژێمەکەیانی دەکرد. گوزارشـــتی لەشێوەی پەروەردەکردن و بەرنامەی حزبی بەعسی دەکـــرد کە سیاســـەتی ترس و تۆقـــان و لەناوبردنـــی نەیارەکانی بوو.

دانان و رێـــز کردنمان لەبەر ئەو هەتاوە زۆر ئازاری داین، هیچێکمان توانای ئەوەمان نەما تەنانەت بەدانیشـــتنەوەش ئـــارام بگرین، گیانمان هەمووی شـــل و خاو بووەوە بە شـــێوەیەک زۆربەمان وامان هەست کرد ئێستا هەناومان دێتە دەرە...

تا دوای عەســـر بەو شێوەیە ماینەوە،دوایە بۆ ژوورەکەیان هێناینەوە وەک جاران بەسترابنەوە. رۆژانە بەیانیان سعاتێک و نیوەڕۆیان سعاتێک و ئێواران سعاتێک دەستیان دەکردینەوە. سێ کەس هاتوچۆی ناو ئێمەیان دەکـــرد (ئەبو عەباس) خەلکی مەخمور بوو کوردی باش دەزانی چونکە مالیان سەردەمانێک لە هەولێر لە بەرانبەر غاباتی کووران بوو. (ئەبو ئەیاد) کابرایەکی شیعە مەزهەب بوو خەلکی خوارووی عێراق بوو. (ئەبو عەلی) ئەمەیان لە دوەکەی تر بەقینترو دل رەشتر بوو رۆژێک نەماندی قسەیەکی کەمێک نەرم بکا یان زەردەخەنەیەکی لەســـەر لێـــو بێ.. ئێمە دەبوایە بەو ســـعاتە هەموومان سەر ئاومان بکردابایەو نانیشمان بخواردابایە.بەو دواییـــە لەبەر بۆنی ناخۆش نەدەهاتنە ژورەوە لە دەرگا بچوکەکە کلیلی کەلەبچەیان فڕێ دەدایە ژوورەوە لای بەســـتراوەی یەکەم خۆمان دەستی خۆمان دەکردەوە!!! دوای یەک دەم ژمێردەهاتن و کلیلەکەیان دەبردەوە

دوای ئەوەی بەدەســـتی خۆمان کەلەبچەکانی مەچەکمان دادەخســـت!!!
ئەوانیش هەر لە دورەوە ســـەیری دەستیان دەکردین تا دڵنیا بن دەستی
خۆمان شەتەک داوە یان نا.

(حوێز عەلی جوکل) خەلکی گوندی قەشقەی سەر بەناحیەی قوشتەپە
بوو، نەخۆشی قۆلۆنو دوانزە گرێی هەبوو، بەهۆی ئەو نەخۆشیەی ماوەی
زیاتـــر لە پانزە رۆژ نەیتوانی لە ئاودەس پێویســـتی خۆی جێبەجێ بکا
تائێوارەیەک لەو کێشەیە دەربازی بوو،لەبەر ئەوەی دەستی بەسترابووەوە
ناچـــار بوو هەر لە شـــوێنەکەی خـــۆی لەناو کۆنـــە جەمەدانیەک بارە
گرانەکەی دانێ و پشوو بدا!!! ئەو شەوە بە شەوێکی مێژوییێ بۆی تۆمار
کرا. ئێمەش لەگەڵ ئەو پشـــومان دا چونکە لەبەر هاوار هاواری رۆژانەی
ئارامـمـــان نەبوو، بـــەردەوام داوای حەبی (تەگەمێـــت) ی دەکرد گوایە
تاقـــە چارەســـەری ئەوە، بەڵام کێ بۆی بێنـــێ ؟ خۆلەوێ مرۆڤ نەبوو
تامـرۆڤایەتی هەبێ.! جگە لە خۆی ئێمـــــەش خەونمان بەو حەبە دەبینی.!

دوای ماوەیەک سێ کەسی تریان بۆ لامان هێنا یەکێکیان (سەید هەمزەی
گۆمەشینی) و دوەمیان (کاوان رەشاد) یادی بەخێربەو دواییە بە کارەساتی
ئوتومبێل گیانی لە دەست دا، ئەوکات کە هێنایانە لای ئێمە تەمەنی مناڵ
بوو. ســـێیەمیان ناوی (وریا) بوو، لەبەر بچوکی لاشەی و کەمی تەمەنی
پێمان دەوت ( وریا بچکۆڵ). ئەو دووانە کاوان و وریا بەیەکەوە گیرابوون.

کاتەکان زۆر بە ناخۆشـــی بەڕێ دەکران. ئێمە لەژوورەوە وەک ئاژەڵ
بەســـترابوینەوە،لە کاتی خەوتن ســـەرمان بە بۆریـــەکان دەکرد. لەبەر
ئەوەی ئەو دەســـتەی بە بۆریەکە هەڵواسرابوو نەدەگەیشتە سەر زەوی
بۆیە زوو ســـڕ دەبـــوو لە خەوەکە رادەپەڕین ولەبەر ســـڕبوون و ئازاری
دەســـتمان دوای چارەکێک یان زیاتر بێدار دەبووینەوە دیســـان خەومان
لێ دەکەوتەوە ئا بەوشـــێوەیە.. شەوانە بۆ ئەوەی کاتە کان و خەمەکان
بەلاوە نێین بابەتی شەوانەمان بۆخۆمان دانابوو،ئەو بابەتە بریتی بوو لە
پرســـیارو وەڵام و هەندێ جار مەتەڵ و نوکتەشی تێ دەکەوت.پێشەکی
بابەتی شەوانەمان بە (شەروارە شەروارە های لەمن شەروارە) دەست پێ

دەکـــرد... دەچوینە ناو بابەتەکان. (محەمەد قادر )یادی بەخێر نوکتەو باســـی خۆشـــی هەبوو،زۆری پێ بوو،زۆربەی ئەو پرسیارانەی دەربارەی مێژو لەیەکترمان دەکرد ئەو وەڵامی راســـتی دەدایەوە .با ئەوەشـــم لەبیر نەچێ دو کەســـی ترمـــان لەلا بوو کە هەر لەوێ ئـــازاد کران یەکێکیان (خەسرۆ موستەفا) فەرمانبەری کشـــتوکاڵی مەخمور بوو. ئەوی تریان (کانەبی حەمەد ســـیان) فەرمانبەری گەشتو گوزار بوو لە پیرمام.ئەوانە بەهۆی ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان لەســـەر نەبوو هـــەر لەوێ ئازاد کران.

ئێمـــــە چوار مانگ و نیوی تەواو بەدیوارەوە بەسترابینەوە، دڵنیام ئەگـــەر ئاژەڵێکی تر بوایـــە لەجیاتی مرۆڤ چوار مانگ و نیو لەســـەر یەک بەدیوار ببەسترابایەوەو پەلێکی نەگەیشتابایەتە سەر زەوی، گیانی لەدەست دەدا.! بەڵام ئێمە بەرگەمان گرتو لەگەڵ ئازارو شەڕی دەرونی مل ملانێمان کرد.. ئێمە گەیشتبووینە بارێکی ئەوتۆ هەستمان بە هیچ بۆنێک نەدەکرد لە ژورەوە. بەڵام کە یەکێک لە دەرگا بچوکەکە سەیرێکی دەکردین لوتی خۆی بە توندی دەگرت، ئەوســـا دەیتوانی ســـەیرمان بکا.! ئەوانە سەیرکردنەکەیان وەک ئەوەبوو کەجۆرە ئاژەڵێکی نامۆ راوکرابێ و خەڵک بە سەرسوڕمانەوە بێن سەیری بکـــەن.! هەر بۆگاڵتە پێکردن و سەیران دەهاتنە لای پەنجەرە بچوکەکەی سەر دەرگاکە. بەڵام خوا لەمە هاوکارمان بوو خۆشبەختانە لەبەر بۆنی گەنی و ناخۆش نەیان دەتوانی زۆر بەدیار پەنجەرەکەوە بمێننەوەو لە ســـەیرکردنمان تێر بن.! یان پڕ بەدڵی پڕ لە قینیان سوکایەتیمان پێ بکـــەن.! بەڕاستی ناحەقیان نەبوو، چونکە بە ریشی درێژو پرچی پڕ لە ئەسپێ و جلی دڕاوی بەرمان و رەنگی زەردمان هەر لە مرۆڤی نیاندەرتاڵ و مرۆڤی ناو ئەشکەوتەکان دەچـــــــووین...





الجمهورية العراقية
وزارة الداخلية
مديرية الأمن العامة

مديرية أمن محافظة أربيل - [illegible] وشخصي

العدد/ ش٣/ ٧٦٧٦
التاريخ / / ١٩٨٦/٣

كتم

الى / الشعبة الجنائيـــــة

م/ قضية تحقيقيـــة

طياً القضية التحقيقية الخاصة بالمتهمين كل من قاسم زرار ومحمد علي حمد امين ونوري عمر احمد ومحمد حمزة مصطفى وعبد الفتاح عبد الرزاق والذين تم تدوين افاداتهم ابتدائياً من قبلنا وطيهـا مطالعتنا للسيد المدير راجيـن عرض الاطلاع واكمـال التحقيق معهم حسب المعتاد به .

خادم الأمن
م/ مدير أمن محافظة أربيـل

المرفقات -

١) قضية تحقيقية
٢) صورة مطالعـة

نسخة الى /

ضابط ش٢/ ٦٩ج / طياً صورة مطالعتنا للعلم والتأشير رجاءً.

## بەرزەخی سێیەم :

ئێمــە لەو ژوورەی کەباســم کرد تــا ١٩٨٦/٨/٢ ماینەوە . لە بەرە بەیانێکی ئەو رۆژە بە ســەیارەیەکی داخراو ئێمەیــان بۆ ئەمنە تازەکە لە پشت ئەنجومەنی یاســادانانی ئەوساکە گواستەوە . لەبەر ئەوەی زۆر گەرمابــوو، ژورەکان بچــوک و داخراو بوون، تا نیوەڕۆ چەند کەســێک بورانــەوە . لەوێ چاوم بە کاک جەمال مەولود کەوت کە شــەرواڵێک و کراسێکی لە بەردابوو، شەرواڵەکە کەمێک لەخوار ئەژنۆی بوو. بۆ ئێوارە دیســانەکە ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ ئەمنــە کۆنەکە، بەڵام ئەوجارەیان بۆ ژوورێکی بچوکتر کە تەنیا شــوێنی دانیشتن دەبووەوە، بۆ خەوتنیش بە نۆرە دەخەوتین.! دوای چەند رۆژێک (قاسم شێروانی) و (نوری عومەر)و (ســەرتیب یەحیــا) یــان هێنایــە لای ئێمــە گوایــە ئەوانــە هــاو دەعوایــان لای ئێمەیە .بــە یەکجــاری شــوێنەکەمان تەنــگ بــوو.

شەوێکیان لەژورەوە لە بەرانبەر دەرگا کلۆم دراوەکە من باسی شتێکی دەرەوەم دەکرد، شەهید محەمەد قادر لە تەنیشتم بوو. ئەوانی تر گوێیان راگرتبوو، یەکســەر دەنگی قوفڵی دەرگا هات.! کە ئەو دەنگە لەو ساتە وەختە یان نیشــانەی هێنانی کەسێکی نوێی دوای ساتەکانی ئەشکەنجە دان بوو، یان بردنی یەکێکمان بوو بۆ لێکۆڵینەوەی تازەو ئەشــکەنجەی تازە!!! یەکســەر دەرگایان کردەوە (رائید مەدحەت) کە ئەمنێکی کورد بوو رائید مەدحەد روی لەمن کردو گوتی (ئەوە چیت بۆ باس دەکردن؟) هەڵبەتــە پێش ئەوەی دەرگاکە بکەنەوە دیارە لە کونی دەرگا ســەیری ئێمەیان کردبوو.گوتم تەنیا بەسەرهاتی خۆم و ئەو شتانەم باس کرد،لە شــەهید محەمەد قادری پرســی: (چی بۆ دەگوتن..؟) گوتی: (بەخوا تەنیا باســی منالّی خۆی دەکرد..). ئاورێکی دایەوە مامۆستا مەغدیدی بینی.گوتی÷ (ئەتو ناوت چی یە...؟- ئەتو پێشتر جەلالی نەبووی..؟) دیاربوو مامۆستا مەغدیدی پێشتر دەناسی،یەک یەک لە هەمووانی پرسی

لەسەر چی گیراون ـهەموویان گوتیان لەسەر یەکێتی ـئەویش لەبەر خۆیەوە گوتــــی÷ (های لەبەر ئەو یەکێتی یەی..بڵێن جیاوازی، یەکێتی چی..؟) لە پاش کۆمەڵێک هەڕەشــە چووە دەرەوە. ئێمە تا ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/١٢ لەو ژوورە ماینەوە، لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە دیســـانەوە بۆ ئەمنە تازەکە گوازراینەوە ـلە ئەمنە تازەکە لە سەرەتاوە دەچوویتە ناو هۆڵێک لەو هۆڵە دەرگایەکی ئاسنی گەورە هەبوو دەچوویتە ناو هۆڵێکی تر لەناو هۆڵەکە چـــوار ژووری ٢،٥ ×٢،٥ هەبوو، لـــە لایەکی تر چەند ژوورێکی بچووکی (یـــەک نەفەری — انفرادی) هەبوون. لەناو هۆڵەکەش بۆڕی ئاو بە دیوار بەســـترابووەو کە ژوورەکان پڕ دەبوون خەڵکیان لەوێ دەبەســـتایەوە. یان ئەوانەی لەسەر سیاســـەت نەگیرابوون لەسەر شتی تر دەگیران لەو هۆڵە دەبەســـترانەوە. ژوورەکان دەرگای ئاســـن و قوفڵیان لەسەر بوو. پەنجەرەیەکی بچووک لە بەشی سەرەوەی دەرگاکە هەبوو، خواردنمان لەو پەنجەرە بچووکە بۆ دەهات. تەنیا بۆ شیو کە بە سەتڵ دەهات دەکرایەوە.

ژوورەکـــە زۆر بچووک بوو،دەبـــوا نیوەمان بخەوین و نیوەمان یان بە پێوە بوەســـتین یان بە چـــڕی لە پاڵ یەک دانیشـــین..دوو تیپ بووین تیپی یەکەم ئێوارە لە کاتی نووســـتنی ئاســـایی دەخەوتین تا سەعات دووی شـــەو دەبوا ئەوان هەڵســـنەوە و تیپەکەی تر بخەون تا بەیانی.. لـــە هۆڵەکەی بـــەردەم ژوورەکان پیاوێکی چاودێـــری لێبوو عەرەب بوو ئەویـــش هەر زیندانـــی بوو،لەبەر ئەوەی خزمەکانـــی زۆر لە ڕیزی ئەمن بـــوون کردبوویان بە چاودێـــرو بەکەیفی خۆی دەهاتـــو دەچوو، پێیان دەگـــوت ( ئەبو موحەمـــەد). کە لە پەنجەرە بچوکەکە قســـەی لەگەڵ کردیـــن من هەســـتم کرد ئەو پیـــاوەم دیوە، دوایە بەبیـــرم هاتەوە بەر لە چواردە ســـاڵ لـــە (امریە معســـکر ابی غریب) ئەو پیـــاوە (رئیس عرفاء) بوو، ســـەرۆکی ســـایەقەکان بوو، ناوی (فاخر) بوو. کەقســـەم لەگـــەڵ کرد وتـــی (بەڵێ هەوم) بۆ حاڵی خۆی دەســـتی بەگریان کرد.

چەند ژورێک لەو زنزانەیە هەبوو هەموی جمەی دەهات. ئێمە هیچمان

لەبـــەر دەم نەبوو، کەس لای بـــەلای نەدەکردینەوە، تەنیـــا بۆ نانەکە دەرگامـــان لێ دەکرایەوە. دەربـــارەی نان خواردنەکەمـــان نازانم بە چ شـــێوەیەک بوو هەندێ قاپمان دەست کەوتبوو هەر دوو کەس لە قاپێک نانمـــان دەخوارد. بەقوەتی پەنیر چەقۆمان دروســـت کردبوو.! بەقوتی ماســـتی ئەلبان کە پلاســـتیک بوو کەوچکمان دروســـت کردبوو.! لەوێ خواردنەکەمان باشتر بوو. هەرچەندە زۆربەی جارەکان بەشی نەدەکردین و تێرمان نەدەخوارد.! بەڵام زۆر بەرێکی خواردنەکەیان بۆ دێناین. بەیانیان یا ئەوەتە نیســـک بوو یان ماست یان پەنیری قوتو بوو. نیوەڕۆیان برنج کە هەندێ شلەی بەسەر دادەکرا. ئێوارانیش شلەمان بۆ دەهات، لەوانەیە ئەوجۆرە شلەو برنجە ئەگەر ئێستا بێ کەسمان پێمان نەخورێ، بەڵام بۆ ناو زیندانی ئەمن زۆر بوو. بە هیچ شـــێوەیەک گۆشت نەبوو. بە کورتی لەوشـــوێنە ناخۆشە ئەوەی کە زۆر جیاوازی لەگەڵ شتەکانی تری هەمان شـــوێن هەبـــوو خواردنەکەبوو،کە بە گوێرەی شـــوێنەکە زۆر باش بوو، بەڵام پیســـی ئارامی لێ هەڵگرتبووین، ئەســـپێ بە سەدان و هەزاران لە جلەکانماندا هەبوو، جاری وا هەبوو نینۆکەکانمان لەبەر خوێنی ئەســـپێ ســـور هەڵدەگەڕا ئەوەندەی ئەسپێی پێ بکوژین!!! کەچی ئەو ئەسپێیە ســـوپایەکی لەبن نەهاتوبوو هەرچەندە دەمانکوشت هەر ژمارەیان زیادی دەکرد!!! ئاودەسەکە لە ژورەوە بوو، بەڵام ئێمە لەگەڵ بۆنەکەی راهاتبووین قاپەکانمان و خۆشـــمان هەر لە بەلوعەی ئاودەســـەکە دەشوشت!!! زۆر جار لەکاتی قاپ شوشـــتن قاپێک یان کەوچکێک دەکەوتە ناو ئینجانەی ئاودەسەکە و هەڵمان دەگرتەوەو ئاومان پێدا دەکرد و لامان ئاسایی بوو.

ئـــەو ماوە دورو درێژە هەرچی یـــادگاری دەرەوە هەبوو بۆ یەکترمان باس کرد، هیچمان پێ نەماوە دەســـتمان کرد بە دروســـتکردنی تاولەو دۆمینە بە ناوکە ســـەمون.! (وریا) وەســـتایەکی چـــاک بوو لەو بوارە. بە پاکەتی تایت کۆنکانمان دروســـت کـــردو کاتەکانمان پێ بەڕێ کرد. جارجارە یەکێک بەهۆی ناسیاوی و پارە دیدەنیەکی چوار پێنج خولەکی

بـــۆ ئەنجام دەدرا کە دەگەڕایەوە شــتێکی پێ بوو. ئەگەر جگەرە کێش بــوا پاکەتێک دوانی پێبوو، جگەرە تامێکی جیاوازی هەبوو،خۆشـــترین شـــت بوو بۆ ئەوانەی لـــە دەرەوە جگەرەکێش بوون. کـــە ئەو پاکەتە دەهات دوای نان خـــواردن یەک تاکە جگەرە یان دوانیان پێدەکرد و بە هەمومـــان ئەو دو جگەرەیەمان دەکێشـــا. قوم قوم بەڕیزە، ئای کە ئەو قومە جگەرەیە تامی تایبەتی خۆی هەبوو. یادی بەخێر (عەبدولموتەلیب جەلال جبرائیل) کە نۆرەی دەهاتو قومی خۆی لە جگەرەکە دەدا ئەوەندە بە تونـــدی دوکەڵەکەی رادەکێشـــایە ناو ســـیبەکانی جگەرەکەی نیوە دەکـــردو هاوار هاوار پەیدا دەبوو کە رەحمێـــــــــک بەوانی تر بکا.!

****

من کە گیرام پێنج کچم هەبوو، گەورەکەیان (گوڵاڵە) تەمەنی هەشت ساڵان بوو، کە ئێســـتا مامۆستایە. بچوکەکەیان (هێشوو) تەمەنی یەک ســـاڵ و یەک مانگ بوو کە ئێســـتا ئەندازیارە. مەدام ســـێ مانگ دەبوو زگی تازەی دانابوو،. لە یەکێک لە دیدەنیەکانی (مامۆســـتا مەغدید) لە مانگـــی کانونی یەکەمی ١٩٨٦ کە لە ســـەرەتاوە نەمانزانی بۆ بانگیان کردوە، دوایە لە گەڕانەوەی کە پاکەتی سۆمەری پێبوو زانیمان دیدەنیە. برادەران دڵیان بە پاکەتە ســـۆمەرەکە زۆر خـــۆش بوو.! بەڵام من هەر چاوەڕێی دەمی مامۆســـتا مەغدیـــدم دەکرد بزانم هەواڵـــی ماڵەوەمانی شـــتێک نەزانیوە.؟زو بـــۆلای من هات، پێش ئەوەی من پرســـیاری لێ بکـــەم گوتی (مزگێنی کوڕێکتـــان بووە) لە ڕاســـتیدا لەلایەک زۆر دڵم خـــۆش بوو لـــە لایەکی تریـــش دڵم تەنگ بـــوو. ئێوارە بە مامۆســـتا مەغدیـــدم گوت (لام وایـــە من چۆن باوکی خۆم نەدیـــوە ئەو مناڵەش باوکی خۆی نابینێ!!!) زۆر بەو قســـەیە شلەژا،چاوی پڕ لە رۆندگ بوو، خـــۆی لێ تورە کردم وتی (هەتیم ئەو قســـە قۆڕانـــە چیە دەیکەی.!)

****

لەو ماوەیەی کە بەیەکەوە بووین ئەو چوارەمان (م – مەغدید – کاک

نوری عومەر — کاک قاسم — من ) سەرمان لە ئاشکرا بوونی خۆمان دەر نەدەکرد.! گەلێ جار یەکترمان تاوان باردەکرد، بەڵام هەر دەبێ کەسێک هەبێ ئەگەر هەرچواریشی ئاشکرا نەکردبێ دوانی ئاشکرا کردبێ. ئەوەی کە پێش ئێمە گیرابوو تەنیا (کاک موحسین ئیبراهیم حەسەن) بوو کە پەیوەندی لەگەڵ ئێمە هەبوو.ئێمەی دەناسی. بەپێی قسەی دوو برادەر لەو یانزە کەسەی بەیەکەوە گیرابوون هەر ئەو بووە ناوی ئێمەی هێناوە، بەڵام دەمانزانی ئەو دوو برادەرە خۆشیان لەو برادەرە نەدەهات.! بۆیە لەوەش بە گومان بووین، بەڵام هیچ سەرە داوێکمان بە دەستەوە نەبوو. ئەوانی تر کەسیان پەیوەندی رێکخستنیان لە گەڵ ئێمە نەبوو. راستە زۆربەیانمان دەناسی کەچی پەیوەندی کاری رێکخراوەییمان تەنیا لەگەڵ کاک (موحسین) هەبوو. ئەو گریمانەیە بەو شێوەیە مایەوە، لە دادگاش ئاشکرا نەبوو، چونکە کەس نەهاتە بەرانبەرمان..تا دوای راپەرین. رۆژێک کورێک کە ناوی (شێرزاد) بوو برادەرم بوو ئێستا لە دەرەوەی وڵاتەو ئامۆزای ئەو کورە بوو کە بەیەکەوە لە ژوری ئەشکەنجە بەسترابووینەوە، ناوی (سەرهەنگ عەبدوڵا نەجار) بوو. هەروەها ئامۆزای شەهید شاخەوان بوو. تووشی هاتم بێ پێشەکی پێی وتم (دۆسیەکەت لای منە، دۆسیەی گیرانت لە ئەمن،دەزانی کێ لەگەڵت خەت مائیل بووە...؟) پێم وت (نەخێر تا ئەمرکەش نەمزانیوە!). ناوی برادەرێکی هێنام کە قەت رۆژێک لەرۆژان خراپەم بۆی نەبووەو جێگای ئەوپەری باوەرم بوو!!! بەراستی بە قسەکەییم باوەر نەکرد.داوام لێی کرد کە دۆسیەکەم بۆ بێنێ، بەڵێنی دا بەیانی دۆسیەکەم بۆ بێنێ و ئیفادەکان کۆپی بکەم و بیدەمەوە. بۆیە رۆژی دوایی بۆی هێنام و ئیفادەکانی خۆمانم کۆپی کرد. بەراستی لام سەیر بوو.! قسەکەی راست بوو.. ئاخر لەبەر چی ئەو برادەرە وای کرد وە؟ چۆن ویژدانی ئاسودە بووە کە پێنج منداڵ هەتیو بکا کە ئەو بە برازای خۆی دادەنان.!

لەبیرمە ئەو ئێوارەیە شێوی کفتەمان هەبوو، من زۆرم حەز لە

کفتەیە بـــەڵام بۆم نەکرا تەنیا یـــەک پارو بەگەرومـــدا بچێتەخوارەوە.
لە زانیاری و ئیفادەکان و هامشـــی ئەفســـەری لێکۆڵـــەرەوە بەدیار دەکـــەوێ کە من بـــەر لە ((٩)) مانگ ناوم دراوەتـــە ئەمن بەڵام لەبەر ئـــەوەی پەیوەندیم پچڕاوە یان ویســـتوویەتیان زۆرینـــەی خەڵک تیایدا ئاشکرابێ ئێمەیان نەگرتووە..
ئەو برادەرە جگە لە من (نووری عومەر) و (موحســـین ئیبراهیم) و (ئەنوەر عەبدوڵا) و (مەغدید هەمزە) ی دەناسی.من یەکسەر راپۆرتەکەی ئێوارەکەیم بەبیرهاتەوە کە ئەفسەرەکە لەسەر مێزی لێکۆڵینەوە جێ ی هێشـــت و من خوێندمەوە وە و خەتەکەم هاتەوە بیر.-دیارە ئەفسەرەکە بە ئەنقەســـت ئەو راپۆرتەی لەســـەر مێزەکە بۆ بەجێ هێشـــتم تا من بیخوێنمەوە تا بزانم کێ ناوی داوم و ئیتر توانای بەرگری کردنم نەمێنێ و لە دەرەوەش ببینە دوژمنی یەکتر. ئەوەشـــم بەبیرهاتەوە کە ئێوارەیەک لەکاتی لێکۆڵینەوە وتـــی (پەیوەندیت لەگەڵ...چی یە) من هەر هێندە وتـــم برادەری کۆنمە.بەڵام ئەو هیچ زانیـــاری یەکی تری داوا لێ نەکردم دەربارەی ئەو برادەرە.
هەر لە پێشـــەکی هامشی ئەفســـەری لێکۆڵەرەوە کە بۆ بەڕێوەبەری بەرز کردۆتەوە دەڵێ: -

**السيد المدير – بواسطة السيد م السياسي**

**م. المعلومات** **العدد / ١٣٤٢١**

**التاريخ ١٩٨٦/٣/٢٥**

حســـب امركم بضرب التنظيمات المشبك عليها التي تعمل لصالح زمرة الاتحاد.

فقد تم ضرب الخط التنظيمي المشـــبك عليه بواســـطة متعاوننا (.... المعروف لدينا ب ((ابو ايمان)) كما يلي):-

**له بەشـــێکی ڕاپۆرتەکە دا کە نـــاوی خەتەکەمان و ناوی من هاتووە دەڵێ: -**

**(موضوع بحث هامشكم في ١٩٨٥/٦/١٦.) لە ئیفادەکانی (م.مەغدید هەمزە) و کاک (نوری عومەر) بە هەمان شێوە ناوی ئەو برادەرە هاتووە و دەڵێ: -**

**(حســـب معلومات مصدرنا ك) واتە ئەو ســـێ بـــرادەرەی بەیەکەوە گیرابووین لە ١٩٨٥/٦/١٦ ئاشکرا کراوین لە ١٩٨٦/٢/١٩ لێدانی پارێزگار بووە هۆی گرتنمان. کە بەپێی فەرمانی ئەمنی هەولێر و بۆ شـــاردنەوەی کەم و کوڕی یەکانیان بڕیاری داوە هەموو ئەو شـــانە ڕێکخستنانە بگرن کە سەرچاوەی خۆیان واتە بەکرێ گیراوی خۆیان کاری تێدادەکا.**

## • دادگای شۆڕش:-

دیاره مەبەستم له دادگای شۆڕش،دادگای شۆڕشی بەعسه که بڕیاری یاسای خوای بەدەستەوه بوو. تەمەنی بۆ مرۆڤ دیاری دەکرد.. تۆ که دەچوویته بەردەم (عواد البندر) سەرۆکی مەحکەمەی ئەوره دەبوا چاوت له بەزەیی ئەو بوا،ئایا ئێستا تەمەنت درێژ دەکاتەوه یان مردنت بۆ دیاری دەکا. چونکه شتێک نەبوو پێ ی بگوترێ بەزەیی یان بەرگری لەخۆکردن.. بەیانی ڕۆژی ١٩٨٧/٢/١ من سەتڵەکەم خاوێن دەکردەوه بەنیازی ئەوەی ئەو بەیانی یه نیسکمان بۆبێ..ناوەکانی (من و مامۆستا مەغدید و کاک نووری و کاک قاسم) یان بانگ کرد زانیمان بۆ سەر پردی سیڕاتەکەیه.دەرگایان لێ کردینەوەو چووینه ناو هۆڵەکه،دوای ئەوەی گەردەن ئازابوونمان لەگەڵ برادەرانی تر کرد چونکه نەماندەزانی جارێکی تر یەکتر دەبینینەوه یان ئەوه دوا ماڵئاوایی یه..

هەڵبەته حەفتەی پێشتر پانزه برادەرەکەی تریان بۆ دادگا بردبوو،هیچ هەواڵیانمان نەدەزانی.ئاخۆ دادگایی کراون یان نا،کێ بۆ پەتەکه چووه و کێ دەربازی بووه..؟ هەندێک له گەنجەکانی بەسته پیازه که له ژوورەوه دڵیان به ئێمه خۆش بوو، دەستیان به گریان کرد.هێشتا ئێمه دڵی ئەوانمان دەدایەوه.که له هۆڵەکه چاوەڕوانمان دەکرد (مامۆستا ئەنوەر عەبدوڵا) له ژوورێکی تر بوو گوێ ی له بانگ کردنی ناوەکەی من بووبوو، له پەنجەره بچووکەکەی دەرگای ژوورەکەی بانگی کردم. که چوومه لای کاک ئەنوەر خەریک بوو دڵم بداتەوه،چەند قسەیەکی بۆ دڵدانەوەی من کرد.منیش پێم وت:- (کاکه ئەوه ئەمری واقعه و دەبێ ڕوبەڕووی ببینەوه، ئاخۆ لەمه زیاتر چارمان هەیه..؟ بەتایبەتی که خۆشمان ئەو ڕێگایەمان هەڵبژاردبێ.!) دیاربوو زۆر دڵی بەو قسەیەی من خۆش بوو. هەواڵی (سەدرەدین ڕەزا حەسەن) که خەڵکی گوندەکەمان بوو لەکاک ئەنوەرم پرسی. پێی ڕاگەیاندم که حەفتەی

رابــردوو بۆ دادگایان بردووه من جارێک له هه‌مان ئه‌و په‌نجه‌ره بچوکه‌ی ئه‌و ده‌رگایه بۆ یه‌که‌مجارو دواجار قســـه‌م له‌گه‌ڵ شـــه‌هید (سه‌دره‌دین) کـــرد به‌داخه‌وه هه‌فته‌یه‌ک پێش من ســـزای ســـێداره‌دانی بۆ ده‌رچوو.

ئیتـــر به‌و به‌یانیه ئێمه‌یان به که‌له‌بچـــه‌وه که دوو دومان به یه‌که‌وه به‌ســـترابینه‌وه، ســـواری ســـه‌یاره‌یه‌کی لاند کرۆزیان کردین و به چاوی کـــراوه دوا ماڵئاواییمان له هه‌ولێر کـــرد و به‌ره‌و به‌غدا که‌وتینه ڕێ. که له‌ده‌ره‌وه ســـه‌یری روخســـاری یه‌کترمان کرد که‌ســـمان له مرۆڤی سه‌ر زه‌وی نه‌ده‌چوویـــن! هه‌رچوارمـــان ڕه‌نگمـــان زه‌رد زه‌رد بوو، وه‌ک ئه‌و پیاوه‌ی له‌دوای چه‌ندین ساڵ به نه‌خۆشی کوشنده له سه‌ره مه‌رگدا بێ.

ئه‌گه‌ر چی به‌ره‌و چاره‌نوسێکی نادیار هه‌نگاومان ده‌نا به‌ڵام له‌لایه‌ک پێمان خۆش بوو ئه‌نجامێک بۆ ئه‌و گرتنه‌مان هه‌بێ که نزیکه‌ی یانزه مانگ بوو به‌رێژه‌ی مرۆڤه‌کانی ده‌ره‌وه ئێمه مردبووین، یانزه مانگ بوو کزه بایه‌کمان به‌ر نه‌که‌وتبوو، یانزه مانگ بوو تیشکی رۆژمان لێ ون بوو،یانزه مانگ بوو ده‌شت و ده‌رو شه‌قام و کۆڵان و خانو و چۆله‌که‌و په‌پوله‌و شته‌کانی ترمان نه‌دیبوو، یانزه مانگ بوو چاومان مه‌له‌ی له پانتایی ئاســـمان نه‌کردبوو.

له‌و ژوره‌ی ئێمـــه‌ی تیا ئاخنرابوو له بنمیچه‌که‌یـــه‌وه په‌نجه‌ره‌یه‌کی بچوکی هه‌واکێشی تیابوو، ئێواران زۆرجاران به‌رانبه‌ر شوێنی هه‌واکێشه‌که ده‌وه‌ستام و له درزی هه‌واکێشه‌که سه‌یری ئه‌و چه‌ند سانتیمه ئاسمانه‌م ده‌کـــرد که لێم به‌دیار ده‌که‌وت.له‌و پایزه‌ی کـــه ئێمه له کونجی زیندان بوویـــن و لـــه‌و ژوره ته‌نگه‌به‌ره کـــۆ کرابووینه‌وه، به‌خیلیـــم به‌و چه‌ند ریشـــۆڵه‌یه ده‌برد که هه‌ندێ جار له پانتایی ته‌نیا پێنج سانتیمه‌تر پۆل پۆل ئاســـمانیان ته‌ی ده‌کرد و دیوارێک نه‌بوو، ده‌رگایه‌کی ئاسن نه‌بوو، ئه‌بـــو عه‌باســـێک و ئه‌بو ئه‌یادێک نه‌بوو، فڕینه‌که‌یـــان لێ قه‌ده‌غه بکا، که‌له‌بچه‌یه‌ک نه‌بوو هه‌ردوو باڵیان شه‌ته‌ک بدا.! ئـــه‌وه‌ی به‌ند نه‌کرابێ نرخی ژیانی ده‌ره‌وه‌ی دیواره‌کان و هه‌ناسه‌ی بێ سانسۆر نازانێ!!! هه‌زار جار هیـــوای ئه‌وه ده‌خوازی که ته‌نیا جارێک رێت لێ نه‌گرن و له‌ســـه‌ر

شۆستەی شەقامێک پیاسەیەک بکەی و شنە بایەکی ئێوارانت بەرکەوێ، یەک دڵۆپە باران لە قژت بدا، قیرۆسیا با (پا) پەتی و جل دڕاوو برسی و تێنــو بی، روت و رەجاڵ بی، بێ وارو ماڵ بی، بێکەس و تەنیا باڵ بی، فلووســێکت لە گیرفــان نەبێ. مرۆڤ تا لــە ژوورە تەنگەبەرەکان و لە پشــت دەرگا ئاسنەکاندا گیرۆدە نەبێ نازانێ ئەو مرۆڤانەی لەدەرەوەن چەند بەختەوەرن. نازانن ئازادی چەند پایەکی بەرزی هەیە. مرۆڤ کە لە پشــت تەلبەندەکاندا گیر دەخوا ئەوساکە بەخیلی بە هەموو بونەوەرێکی دەرەوە دەبــا.. من لە ناخی ناخمەوە ئەوەنــدە ڕێگایەی نێوان هەولێرو بەغدام بە خۆشــترین ژیان هاتە بەرچاو قیرِی سیا لەوەی کە بۆ بەیانی دەدرێمە دادگاو چیم بەســەر دێ، چونکـــە بە ئارەزووی خۆم سەیری تەلارو شەقام و دەشت و دەرم کرد.

مرۆڤــی نــاو زیندانەکانی بەعــس دەیانزانی ( ئــازادی) زۆر لەوە زیاتــر دێنێ کــە هەزارانی وەک ئێمەی لە پێناویدا ئەشــکەنجە بدرێ و هەزاران (گەردن) و پەت) دەســت لەملان کەن !!! نەفرەت لەوانەی ئەو قەناعەتــە ی ئێمەیان کاڵ کــردەوە و ئەو قوربانی دانانەیان کلۆڵ کرد.

ئــەو رۆژە تا چاو بڕەکا روانیم، هەناســەی دەرەوەم هەڵمژی هەتا توانیم. ئای کە بۆنی ئەو پێدەشت و تەلان و زورگ و زەوی تەڕی دوای بارانە خۆش بوو. کە گەیشــتینە بەغداش تا پێم کرا ســەیری شەقام و تەلارە بەرزەکان و مرۆڤەکانی ســەر دونیام کرد هەندێک جاران وای بۆ دەچوم کە ئەوە دوا دیدەنی من و ئەو دەورو بەرەیە بۆیە وا بەپەرۆشەوە سەیریان دەکەم

لــە بەغدا ئێمەیان بــردە ( مديريه الامن العامــه ). هەرچەندە من شــارەزاییم لە بەغدا هەبوو، بەڵام لەبەر ســەیرکردن ئێستاش نەمزانی ئایا ئەمە (بتتاوین) ە یان شــوێنێکی ترە. کە لە دەرگای یەکەم چوینە ژوورەوە ئەمنەکانــی لەگەڵمــان بوون وتیان ( ســەرتان نەوی کەن ). کەلەبەر دەرگای دوەم وەســتاین، یەکێک لە پاسەوانەکانی ئەوێ هاواری

کرد (سەریان پێ نەوی کەن) من شوێنەکەم بەرتەسک بوو، کورسیەکەی پێشـــم لێ نزیک بوو باش نەمتوانی سەرم بشارمەوە،یەکێک وەک سەگ تاوی دامێ و لە جامی ســـەیارەکەوە چەند مشتەکۆڵەیەکی لە سەرم دا بەجوێن و هاوار کەوتە گیانم تا ســــەرم زیاتر نەوی بکەم. بەڵام من لەوە زیاتر نەمتوانی ســــەرم زیاتر بشارمەوە.!!! یەکێک لەولاوە هاواری کرد ( کـــورە بەقۆنداغە تفەنگ لێی بدە بەدەســـت لێی مەدە ). بەڵام وازی لێ هێنام کەزانی ناتوانم ســــەرم زیاتر بشـــارمەوە. نزیکەی سعات دەو نیو یان یانزەی بەیانی بوو کە گەیشـــتینە ئەوێ، چارەکێک لەناو سەیارەکە بەو شـــێوەیە ماینەوە، ئەو ماوەیەش ســـەرمان هەر لەژێر کوشنەکە بوو من پشـــتم خەریک بـــوو دوولەت بێ. لەوێ بیرم کـــردەوە ئێمەی کورد دوژمنانمـــان بەردەوام ئاوا هەوڵیان داوە ئێمە ســـەریان بۆ نەوی کەین یان نەعامە ئاســـا سەری خۆمان بشـــارینەوە گوایە کەس نامان بینێ.!

خانەوادەیـــەک کە ژنێک و چەند منداڵێکـــی رووت و رەجاڵی عەرەب بـــوون لەژێر دارەکان خۆیان گرمۆڵە کردبوو. پێدەچو ئەو خانەوادەیەش بەندکـــراوی هەبێ. دوای چارەکێک یان زیاتـــر بوو ئەمنە کان هاتنەوەو ســـواری ســـەیارەکە بوونەوەو لەدەرگا هاتینەدەرەوە. کەهاتینە دەرەوە ســـەریان پێ بەرز کردینەوە. دیسانەوە چەند شەقام و گەڕەکمان بڕی. بـــۆ نیوەڕۆ ئێمەیان هێنایـــە بەندیخانەیەک کە دەیانگـــوت بەندیخانەی (الفضیلیـــة). کـــە چوینە ژورەوە دەســـتمان بەرەڵڵا کرا، ئەو دەســـت کردنەوەیـــە هێندە خۆش بوو وامانزانی ئازاد کراوین. حەوشـــەیەک بوو ســـەری تەلبەند بوو، هەرچـــوار دەوری ژوری بچوک بچوک بوو، دەرگای ژورەکان لەسەر پشت بوون و زیندانیەکان لەبەر هەتاوەکە دانیشتبوون و پیاســـەیان دەکرد. هەر لە حەوشـــەکە چاومان بەو یانزە کەســـە کەوت کە هەفتەی پێشـــتر بۆ دادگا هاتبوون. پیمان ســـەیر بوو.! دوایە تێیان گەیاندیـــن ئەوان بۆ مـــاوەی پانزەڕۆژ دادگایی کردنیـــان دواخراوە. ئەو شـــەوە لە بەندیخانەی (فضیلیة) ماینەوە کـــە خەڵکێکی زۆری کوردی

فەیلـــی لێبـــوو، حزبی بەعس نـــاوی لێنابوون (التبعیـــة الایرانیة). کە چەندین ســـاڵ بـــوو لەوێ بەند کرابوون و کەســـوکاریان بـــۆ ئەودیوی سنوور شـــاربەدەر کرابوون، ماڵ و موڵکیان دەســـتی بەسەرداگیرابوو.

شـــــــەو تـــا بەیانـــی ئەوەندەی کـــردم خەوم لـــێ نەکەوت.. بەیانـــی بانگیـــان کردیـــن و ماڵئاواییمـــان لـــە بـــرادەران کـــرد کـــە ماڵئاواییەکەمان لەگەڵ شـــەهید ( محەمەد قادر) بۆ هەتا هەتایە بوو...

له هۆڵی دادگا کۆمەڵە خەڵکێکی ترمان بینی لەوانە مامۆستا (کمال بایز اسـماعیل دزەیی) برای دکتور ئەرسـەلان بایز لەگەڵ پێنج کەسی تـر کە بریتی بوون لە (صیاد ابراهیم صمد - خەڵکی گوندی سـفەییە - صدیق سـعید گەزۆ -خەڵکی ناحیەی کەلەک - عبدالرحمان بیرداود مولود- خەلکی ناحیەی کەلەک - محسـن صوفی خانە - حسین بایز حسـین صالح - خەلکی گوندی سـفەییە-) ئەوانە لە ناحیەی خەبات دەسـتگیرکرابوون، دەمانچەیەکیان لە دەست گیرابوو بۆ دووەم جار بوو یان سـێ یەم جار بوو دادگایی دەکران. ئەو کابرایەی ناوی (مامۆسـتا موحسـین) بوو لێپرسراوی ناوچەی شۆڕشـگێران بوو دوایە هاتەوە ناو ڕژێم کەسـێکی خوێن ڕێژی لێ دەرچوو بە دەیان کەسـی بە ئاشـکرا کـردن و گرتـن دا.! هەندێکیان لە سـێدارە دران. ئەویش ئەو شـەش کەسـەی ئاشـکرا کردبوو لە دادگاش لە پێش (عوادالبندر) لە یەکێک لە دادگایی کردنەکانیان هاتبووە پێشـیان وشـاهیدی لەسـەر دابوون.

ئەو هۆڵەی لێ ی دانیشـتبووین کەمێک لە ژووری دادگا نەویتربوو. وەجبە وەجبە بانگ دەکراین، ئێمەیان بانگ کردو چووین لەناو قەفەزەکە بەرانبەر دادوەر ڕایانگرتین، داواکاری گشـتی لەلای چەپمان وپارێزەری دادگا لەلای راستمان بوو، داواکاری گشتی تاوانەکەی ئێمەی خوێندەوە، بەڵام لە کۆتایی نەیگوت (داوادەکەم توندترین سـزا بدرێن..) تەنیا ئەو تۆمەتانەی خوێندەوە کە ئاڕاسـتەمان کرابـوو. گوایە ئێمە لەو کاتەی کـە ڕژێم ویەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان لە دایەلـۆگ دابوونە ئەوانە سـۆزدار وپەیوەندیەکیـان لەگەڵ یەکێتی هەبووە، بـەڵام دوای ئەوەی گفتوگـۆ کۆتایی پێ هاتووە ئەوانـەش پەیوەندیان نەماوە. ئەوە هەموو ئـەو تاوانانە بوو کە ئێمەی بەرەو دادگا بـرد. کە (عواد البندر) داوای لـێ کردین (تاوانبارین یان بێ تاوانین.. ئەگەر بێ تاوانین با پارێزگاری لە خۆمـان بکەین..) ئێمە پارێزگاریمان لە خۆمـان کرد ونکۆڵیمان لە هەر شـتێ کرد کەپێی تاوانبار بکرێین. بەڵام قسەکانمان وەک ئەوەبوو لـە دەممان جیانەبووبێتەوە وئەوان گوێیان لـێ نەبووبێ بۆیە (البندر)

هەر گوێی نەدایە قســـەکانمان. لەولاوە کە نۆرە هاتە ســـەر پارێزەرەکە گوایە دادگا بۆ ئێمەی داناوە، ئەو پارێزەرە کۆمەڵێک بەڵگـــەی یاسایی هێنایـــەوە کە ئێمە بێ تاوانین چونکە لە کاتێک دا هاوســـۆز بووینە کە یەکێتـــی گفتوگۆی هەبـــووە و لەبەرەی گەل نزیک بـــووە، وایان زانیوە گەڕاونەتەوە ریزی نیشـــتمانی و.! کە زانیویانە ئەوانە نەگەڕانەوە ڕیزی نیشـــتمانی ئەو هاوسۆزیەیان لەگەڵ پچڕاندووە. دیارە لەکاتی گفتوگۆش هیچ هاوســـۆزیەک ســـزای لەســـەر نی یە. ئیتر ئێمەیان بردە خوارەوە، چاوەڕێـــی ئەنجامی دادگامـــان دەکرد. لە نێوان خۆمـــان هەر چوارمان قســـەمان کرد (تۆ بڵێ ی قســـەکانی پارێزەر جێگیربـــێ و بەبێ تاوان ســـزا بدرێین. یان ئەو قسانە تەنیا ســـیناریۆیە) لە دواجار لای خۆمان گەیشـــتینە ئەو قەناعەتە لەوانەیە بۆ ماوەی پێنج ســـاڵ حوکم بدرێین.

دوای دوو سەعات بانگیان کردینەوە. لەکاتی سەرکەوتنم بەسەر هەر چوار پایەکە بۆ ژووری دادگا، هەموو منداڵەکانم هاتە بەرچاو ئاخۆ هەتیو دەبن یان جارێکی تر چاوم پێیان دەکەوێتەوە، چونکە ئەو ژوورە و ئەو پیاوەی پشت مێزەکە ئێستا ئەو بڕیارە دەدا کە منداڵەکانم هەتیو بن یان هەتیو نەبن.. ئەو ســـاتەی لەبەردەم (عواد البندر) وەستاین بۆ ئەوەی بڕیارەکەی بخوێنێتەوە، ســـاتێکی پڕ تاسەبوو. عیزرائیل وئیسرافیلم لە هەردوو چاوی ئەو کابرایە بەدی دەکرد. ئەو ساتە ناخۆشترین و سەخت ترین ســـاتەکانی ژیانە!!! تۆ مان و نەمانت ئێســـتا لەو چەند وشـــەیە قەتیس دەمێنێ کە لە دەمی ئەو درندە بێ بەزەیی یە دەردەچێ.. ئێستا بەچەند رستە ودەستەواژەیەکی کەم ژیانت و تەمەنت و دابڕانت لە قاڵب دەدا. دادوەر بەناوی گەل بڕیارەکەی خوێندەوە کە بۆ هەریەکەمان بە پێ ی مادە (١٧٥ ق ع) بۆ ماوەی پانزە ساڵ لەجیاتی پێنج ساڵەکەی ئێمە زیندانی کردنمان بۆ بڕایەوە. وەک لە بڕیارەکە خوێندرایەوە تاوانەکەمان ئەوەبـــوو کە پەیوەندیمـــان هەبووە دوایە وازمان هێنـــاوە بەڵام هەواڵی لایەنی بەرپرسمان نەداوە.

ئیتر گەڕاینەوە ناو هۆڵەکە وبرادەرانی تر دەوریان داین ئەنجامەکەمان

پێ گوتن. دیاربوو (مامۆســـتا کمال) وبرادەرانی ئەو هەواڵەیان زۆر پێ خۆش بوو. ئێمە پێمان وابوو حوکمەکە یەکجار بێویژدانی تیا بووە، جگە لەوەی هەر گرتن و ئازاردانمان بێ ویژدانی و دڕندەیی نیشان دەدا. بەڵام ئەوان هەر دەیانگوت (سوپاســـی خوا بکەن. سوپاسی خوا بکەن. ئێوە وادانێـــن ئازادبوون. هەزار خۆزگەمان بە ئێـــوە..). بەداخەوە کە ئەوان بۆ بەردەم دادگا بۆ خوێندنەوەی ســـزایەکە بانگ کران، هەر شەشـــیان نەگەڕانەوە و هەر شەشـــیان بۆ ئەو ژوورە بردران کە ســـزادراوەکانی بە خنـــکان حوکم دەدران دەچوونە ئەوێ.. لە دەرگاکە دیمان یەکێکیان لە هـــۆش خۆی چووبوو نازانم کامەیان بوو بـــە دوانیان هەڵیان گرتبوو بۆ ژوورەکەیان دەبرد. چونکە ئەوەی سزای سێدارەدان بووا نەدەگەڕایەوە ناو هۆڵەکە. ئەو ڕۆژە بیســـت کەس دادگایی کران. ئێمە حەوت کەس سزای جیا جیامان بەسەردا سەپێندراو سیانزە کەسیش سزای لە سێدارە دانیان بە ســـەردا سەپێندرا.. کە سواری سەیارە داخراوەکەیان کردین جگە لەو حەوت کەسە دوو کەسی خەڵکی دهۆک مان لەگەڵدابوو کە بە لەسێدارەدان ســـزا درابوون. یەکێکیان گەنجێکی باڵابەرزی زۆر قۆز بوو، تا گەیشتینە بەندیخانـــە هەر لاوکی چڕی، ئێمەش پەیتـــا پەیتا دڵمان دەدانەوە. ئەو دوو کەســـە کەلەبچە کرابوون بەڵام ئێمە کەلەبچەمان لەدەست دا نەبوو. گوتیان دەوام کۆتایی هاتوە بۆیە ئێمەشـــیان لەگەڵ دوو کەسەکە بردە یەک شـــوێن. دوایە زانیمان بەشی حوکمە قوڕسەکانەو ئەو شوێنە نزیک ئـــەو ژوورانەیە کە ئەو زیندانیانەی تیایە بە حوکمی خنکان ســـزا دراون. زوو دوو گەنجەکەی دهۆکیان لە ئێمە جیا کردەوەو ڕویان لە دیوار کردن.

ئێمەیان بردە ژورێک کەسی ترمان لەگەڵ نەبوو. دوای کەمێک یەکێک هاتە لامان دیار بوو ئەویش بەندکراو بوو بەڵام چاودێر بوو. پێی گوتین ( چیتـــان دەوێ)؟) پێمان گوت کـــە دوو ڕۆژە نانمان نەخواردووە ئەگەر شتێک هەبێ.. ڕەزامەندی خۆی نیشاندا کە ئێستا نانمان بۆ دێنێ، بەڵام کە ڕۆیشت تا ئێوارە نەگەڕایەوە. ئێوارە دوو قاپی هێناو هەندێ مەرەگەی شێلمی بۆ هێناین کە من بۆ یەکەم جارم بوو مەرەگەی شێلم ببینم نانمان

تێکوشـــی و خواردمان. هەریەکەو دینارێکی لێ سەندین. ئێستاش نازانم ئەو دینارەی بۆ لێ سەندین.! لەبیرم نەماوە کامەمان پارەما پێ بوو کە پارەکەمان پێی دا. ئەو شـــەو لەو ژورە لێمان پاڵدایەوە، ژورەکە فراوان بوو، پێشـــتر چەندین مانگ بوو بە ئارەزوی خۆمان نەمانتوانی بوو قاچ ڕاکێشین، کەچی ئێستا وا پیاسە لەو ژورە دەکەین. بۆ بەیانی کە دەوام دانرایەوە هەر حەوتمان بە کەلەبچە لە یەک قایم کراین و بەپێ ئێمەیان بۆ بەشی (الاحکام الخاصە) گواستەوە. لەوێ ئێمەیان لە ژورێکی تەنگەبەر کرد، وەک ژورەکانی ئەمنی هەولێر بوو. ئەو ژورە پێیان دەگوت (معجر) هەر زیندانیەک تازە دەچوە ئەوێ دەبووا حەوت ڕۆژ لەو ژورە بەسەر ببا. ئەو ڕۆژەی کە چوینە ئەوێ بەرواری ١٩٨٧/٢/٣ ڕۆژی سێشـــەممە بوو.

ژورەکە کۆمەڵە خەڵکێکی لێبوو، لەسەرەتاوە وامان زانی ئێمەیان بۆ شێتخانە هێناوە، چونکە سێ شێتی لێبوو، مامۆستایەکی دکتۆرای ماتماتیک بوو، وەک باســـیان دەکرد لە هەموو عێراق پێنج کەس ئەو بڕوانامەیەی هەبووە لەســـــەر شیوعی گیرابوو، لەژێر ئەشکەنجە ژیری لەدەست دابوو. لە باری ئاسایی دا کابرایەکی زیرەکی تەژی لە زانیاری بوو، بەڵام کەتوڕە دەبوو هەموو شتەکانی تێکەڵ دەکردو دەستی بە جوێندان دەکرد. شێتێکی تری لێبوو ناوی (کامل) بوو بەڵام پێدەچوو بە درۆ خۆی شـــێت کردبێ، کە حەزی لە جگەرە بووا دەیان جار لەبەر خۆیەوە دەیگەت (رحمه الله علـــی والدیه اللـــی ینطینی جـــگاره) کە دەیانجار لەبـــەر خۆی ئەو قســـەیەی دەکرد ئەگەر کەس جگەرەی نەدابایە ئەوجارە دیگوت ( نعلة الله علی والدیه اللی ماینطینی جگاره). شـــێتێکی تری لێبوو گەنج بوو زۆر جار (ســـجان) ەکان دەهاتنە ژورەوە بۆ گاڵتەکردن بەو شێتو کەیە.

هـــەر لە ژورەکە هەندێ ســـزادراوی لێبوو لە دەمی ئەوانەوە دەنگ و باســـی ناو زیندانمان زانی و زانیمان هەڵســـان و دانیشتن لەوێ چۆنەو لە حەفتـــەی دوەم و حەفتەی چوارەمی هەمـــو مانگێک دیدەنی هەیەو تادوای دەوام ئەوانەی ســـەردانمان دەکـــەن دەتوانن لامان بمێننەوە. بۆ ڕۆژی دوشـــەممەی حەفتەی دواتر کە دەیکردە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٢/٩ ئەو

برادەرانـــەی کە هەفتەیەک پێش ئێمە بـۆ دادگا هاتبوون لە (فضیلیە)، چاومـــان بە یەک کەوتـــەوە کەمێـک دوای نیوەڕۆ بوو بـــەزۆر کەوتن بـــەڵام کاک (محەمـــەد قادر) یان لەگەڵدا نەبوو، کە هەواڵیمان پرسـی بەداخـــەوە پێیان ڕاگەیاندین کە ئەو بەرەو پەتی سـێدارە ڕۆیشـت !!!

بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی سـێ شـەمە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٣/١٠ ئێمەیان هێنایـە ناو خەڵکەکـە دە هەڤاڵەکەی تر لە (مەعجـەر) مانەوە .لەوێ جلەکانمان زۆر شڕوشـیتاڵ بوو،یەک و بەرگـی قاوەییمان وەرگرت کە لەبەری بکەیـن بەتایبەتی لەکاتی دەوام،چونکـە لەکاتی دەوام دەبووا بەرگـەکان قاوەیی بووان کە ئەوان پێ یان دەگوت (کانە). کاک (محمد عثمان علـی – محمد مخمووری) پێش ئێمە لەوێ بوو،من و مامۆسـتا مەغدیدی دەناسـی پیاوەتی یەکی چاکی لەگەڵ کردین کە لە حانووتەکە یەکـە و بێجامـەی نوێ ی بـۆ کڕین،لەبەر ئـەوەی ماوەیەک بوو جلی نـوێ و بۆن خۆشـمان نەدیبوو من ئەوەندە دڵم پـێ ی خۆش بوو تا ئێسـتاش بە دەیانجار باسـم کـردووە و هەر جارێ کـە کاک محەمەد مەخمووری هاوڕێم دەبینم بۆنە خۆشەکەی ئەو بێجامەم بۆ نوێ دەبێتەوە.

لەبەر ئەوەی زۆر باسـی ناو بەندیخانەی (ئەبوغرێب – بەشـی سزا تایبەتـی یەکان) کراوە بە پێویسـتی نازانم باسـی هەمـوو وردەکاری یـەکان بکـەم حەز دەکەم بە خاڵ هەندێ شـت دەستنیشـان بکەم:-

١- لەو بەندیخانەبـە ڕادیۆ قەدەغە بوو،تەلەفزیۆن قەدەغە بوو،گرد بوونەوەی چەند کەسـێک بەیەکەوە و قسـە کردنیان قەدەغە بوو،کتاب خوێندنـەوە (جگە لە کتابەکانی کتێبخانەکەی خۆیان کە هەر هەموویان باسی ئەمجادی حزبی بەعسیان دەکرد) قەدەغەبوو. لەو کاتەی کە تاقە تەلەفزیۆنەکـەی ناو (جەمەلۆن) کە خۆیـان دایان نابوو دەبووە هەواڵ لە سەعات هەشتی ئێوارە .نووستن،قسەکردن،خۆخەریک کردن،پاڵدانەوە قەدەغـە بـوو. چونکـە بۆ هـەر هـۆڵ و جەمەلۆنێـک تەلەفزیۆنێک هەبوو،سەعات هەشت لەسـەرت ئەرک بوو دەبوا بەرانبەر تەلەفزیۆنەکە بەبێ دەنگ دابنیشی،قسـەکردن و پاڵدانەوە و خۆخەریک کردن بە هەر

شتێک قەدەغەبوو، تا هەواڵ و دەنگ و باس کۆتایی پێ دەهات..زۆر جار وابوو ســەجانێک ژمارەی (بەیانی ســەربازی) لێ دەپرسی کە ئەوساکە سەردەمی شــەڕی ئێران — عێراق بوو خۆ ئەگەر نەتزانیبا دەیانبردی و عەســیر مەیدانیان دەکردی،گوایە گوێت لــە تەلەفزیۆن ڕانەگرتووە یان گرنگیت پێ نەداوە..دوای ئەوەی کە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن لە ســەعات ((١٢)) ی شــەو کۆتایــی دەهات دوای ئەوســاکە دانیشــتن قەدەغە بوو،خــەوت بهاتبایە یان نەهاتبایە دەبوو تــۆ بخزێیتە ناو نوێنەکەت..

من لە گۆڕەپانی جەمەلۆنــی دوو بووم، (علاء العاني) کە کابرایەکی خەڵکــی (عانە) بــوو چاودێرمــان بوو.کابرایەکی حیز بوو شــەیدای پیــاوی نێرباز بوو،نازانم لەســەر چی گیرابــوو کابرایەکی هیچ و پووچ بوو،زانیاری ناو هوڵەکــەو بەندیەکانی بۆ ئیدارەی بەندیخانەی دەبرد... وێســتگەیەکی پەخشــی ناوەندی هەبوو کە ڕادیۆی بەغدای لەسەر بوو. لەو وێســتگە ناوەندی یە داوا دەکــرا کە مەمەڕەکان دابخرێن یان بانگی کەســێکیان بکردایە هەر لە ڕێگای ئەو وێستگەیە بوو..ناوە ناوە بانگی دەکــرد (علاء العانــي — مراقب الجملون الثانــي — يرجى حضورك الى الســيطرة..) شــتە قەدەغە کراوەکان زۆربوون.بەو دوایی یە ڕێگایان دا بــە کۆمەڵێک تەلەفزیۆنێک بۆخۆیان دابنێن و لــە دەرەوە بۆیان بێنن.

٢- ڕۆژانــە دوو جار ســەرژمێری دەکراین ئەوان پــێ یان دەگوت (مســطار) بەیانیان لەگەڵ یەکەم خولەکی دەوام لە گۆڕەپانە (حەوشە) گەورەکــە کە پێنج پێنــج ریزیان دەکردیــن و دەیانژماردین.هەندێک لە عەرەبەکان بەو بەیانی یە سەرمایان دەبوو بەتانیان لە خۆیان لوول دەدا و دەهاتنە دەرەوە — وەک ئاژەڵ دەیانژماردین.جاری دووەم نیو سەعات پێــش کۆتایی هاتنی دەوام بە هەمان شــێوە ســەرژمێری دەکراین.کە ئاگاداری زیندانیان دەکرایەوە بۆ ئەو (مســطار)ە لە وێستگە ناوەندیەکە بۆ چەنــد جار دووبارە دەکرایەوە (على النزلاء الخروج الى المســطار) واتــە ئێمە بە ((نزلاء)) بانگ دەکراین کە وشــەیەکی عەرەبی یە کۆی وشــەی (نزيل)ە بەو کەســانە دەوترێ کە دەبنە میوانی میوانخانەکان.

٣- وەک پێشتر باسم کرد وێستگەیەکی پەخشی ناوەندی هەبوو کە لە هەموو جەمەلۆن و گۆڕەپان و هۆڵەکان بڵندگۆی بۆ دانرابوو. بەردەوام ڕادیۆی بەغدای لەسەر بوو. هەر لە ڕێگای ئەو پەخشە ناوەندیە ئاگاداری یەکانی (مسطار) و کارەکانی چاودێرەکان دەکرایەوە یان گەر بانگی گیراوێکیان بکردبایە ئەوا لەو وێستگەیە بانگ دەکرا. هەر لەو وێستگەیە داوا دەکرا کە دەرگاکان دابخرێن یان ڕێڕەوەکان دابخرێن. ئەگەر بە ڕۆژ لە کاتی دەوام بانگەواز بکرابایە ڕێڕەوەکان دابخرێن، دەمانزانی شتێکی نائاسایی هەیە کە ئەوەی کە زۆر گوێمان لێ ی دەبوو.(یرجی غلق الممر یرجي فتح الممر) بوو. ئێواران پێش ڕۆژئاوابوون ئێمە لە ژوور دەکراین و دەرگاکان لەسەرمان کلۆم دەدرا تا بەیانی کە خواردن دابەش دەکرا ئەوسا دەکرایەوە.

٤- ڕۆژانە چەند زیندانی یەک بۆ کار دەبران کارەکە یان بۆ زبڵ فڕێدان بوو یان بۆکاری ناو چێشتخانە گەورەکەبوو کە تەماتەو شێلم و کودی وردکردن شوشتنی قازانە گەورەکان بوو. زبل فڕێدان لە هەموو ئیشەکانی تر ناخۆشتر بوو کە هەفتەی جارێک بوو. دەبووا زبلی یەک هەفتە بە خاکەناس لە لۆری یان قەلاب بکەین. ئیشی چێشتخانەکە بریتی بوو لەشوشتنەوەو ورد کردنی ئەو شتانە کەبۆ شلەی ئەو ڕۆژە ئامادە دەکرا. نیوەڕۆیان برنج و شلە بوو، قازانی گەورە گەورە هەبوون بە فەردە برنجیان تێ دەکرد و دەیانکردە پلاو برنج بۆ زیندانیەکان. بەلام ئەوەندە خراپ لێ دەندرا خواردنی زۆر ناخۆش بوو. ئەوانەی دیدەنی بەردەوامیان هەبوو ئەو برنجەیان نەدەخوارد.

٥- زیندانیەکی زۆر بۆ ئەوەی لەلایەک کاتە دورو درێژەکان بەسەر ببەن و لە لایەکیش ئەگەر گوزەرانیان زۆر خراپ بووا لای کەم شتێک پەیدا بکەن بەچنین خۆیان خەریک دەکرد. چنینی ملوانکەو گیزدان و کلاش. بۆ ئەو مەبەستە چەند کەسێک هەبوون لە ناو بەندیخانە پێداویستیەکانیان دەفرۆشت پێیان دەگوتن (بستیە) یان (بەستەچی). وەک زەنگیانەو پولەکەو داوو چنارەو قوماشی ڕەنگاو ڕەنگ و دەرزی لەزم و داوی

پەڕەشـــوتی کلاش چنین و ژێر کلاش و گەلێ شـــتی تر. هەندێکیش بە قوماش و سیکۆتین و دار و مقەوا شتی تریان دروست دەکرد وەک بورجی ئێڤل و گیزدانی گەورەو پەیکەری خانو و تەلارو منارەو گەلێ شتی تر.. من شـــارەزای چنین بووم بەڵام هەر بۆخۆم بۆ ماڵەوە چەند ملوانکەیەکم بۆ یادگاری دروســـت کـــرد. بە داخەوە لە کۆچڕەوەکـــە ئەو یادگاریەی بەندیخانەمان لێ دزرا. من کاتێکی کەمم بۆ ئەو کارە دانابوو، چونکە خۆم بە نوسین و گفتوگۆ لەگەڵ هەڤاڵان خەریک دەکرد، بەو شێوەی خوارەوە:

یەکـــەم:- دانی ئێـــواران کە دەوام نەبوو بـــەردەوام لە گۆڕەپانەکە دەسوڕاینەوە ئەگەر شتێکمان لابووا ئەوا فێری ئەو خەڵکانەمان دەکرد کە ئەوەندەی ئێمە شارەزاییان نەبوو، بەتایبەتی گەنجەکان. بۆیە هەندێکمان وەک مامۆستایەک ڕۆڵمان بینی، بەتایبەتی لەبابەتی سەرەتاکانی مارکسی و لە ئەرکە نیشتیمانی و نەتەوەییەکان و شتێک دەربارەی ئابوری و مێژوو ئەگـــەر لامان بووا.. ئەوانەی لەو کارانە ڕۆڵیان هەبوو کاک (موحســـین ئیبراهیم، نەسرەدین مامە کەریم، محەمەد مەنگوڕی، قاسم شێروانی، ئەنوەر عەبدوڵاو هەندێک لە برادەرانی سلێمانی بوون کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە) بە داوای لێبوردنەوە لەو هەڤاڵەی کەڕۆڵی هەبووەو ناوەکەی نەهاتوە لەبەر کۆڵەواری بیرهاتنەوەم!!! ئەنوەر عەبدوڵا ئەحمەد و مامۆســـتا محەمەد حەســـەن مەنگوڕی دوای ئێمە ئەوانیش دادگایی کران و هاتنە لای ئێمە.

دووەم:- زۆربەی دانی بەیانیان و شەوان چیرۆکم دەنوسی و شوێنێکم دروســـت کردبوو دەفتەرەکەم تیا دەشـــاردەوە و دوایـــەش لە دیدەنی ڕەوانەی ماڵەوەم دەکردەوە لەســـاڵی ٢٠٠٥ لەژێر ناوی (شـــــــەوە ســـــــاردەکان) لە دوتوێی کتێبێک دا بەشێکیانم لی بڵاوکردەوە.

٦ – ئەوانەی کە بەیەکەوە نانیان دەخوارد پێیان دەگوترا (سفرداش) دیارە پەیڤی (کانە) و (عەنقەرچی) و (ســـفرداش) هەموویان وشـــەی عوســـمانین، تا ئـــەو کاتـــەش بەندیخانە بەکاری دەهێنا. من و قاســـم

شێروانی مەحمەد مەنگوڕی و ئەنوەر عەبدوڵاو کوڕێکی تر ناوی فەیسەل بوو خەڵکی گوندی عارەب کەندی نزیک هەولێر بوو، بە یەکەوە سفرداش بوویـــن. لە بەر ئەوەی خواردنەکەی بەندیخانە زۆر خراپ بوو، لە دەرەوە لـــە کاتـــی دیدەنی خواردنمان بـــۆ دەهات واتە جگە لـــەوەی ئێمە هیچ ســـوودمان بۆ ماڵ و مناڵمان و کەس و کارمان نەما، زیانیشـــمان بۆیان هەبـــوو. لە دیدەنیـــدا ئەگەر مانگێک دووجار نەهاتبـــوان مانگی جارێک هـــەر دەهاتن. جگە لەوەی ئەو ڕێیە دوورەیان دەبڕی وشـــەو لە هوتێلی پیس وهەرزان دەمانەوە، بەیانیش بەخۆیان وکۆڵە پشـــتیان ومەنجەڵی پڕ لە کفتە ودۆڵمە بێن وماوەیەکی زۆر لە تابووری خەڵکەکە بوەســـتن وبەرگەی ئازاری قەرەباڵغی ومل لەبەر مل هەڵســـوین وپاڵدان بگرن. تا دەگەنە ژوورەوە. من کە ئەو شتانە باس دەکەم ناتوانم بە رستە وپەیڤ ودەســـتەواژەی وا بدۆزمەوە کە گوزارشتی راستەقینە لەو ئازارانە بکەم یـــان بە تراژیدیاترین دیمەن وێنای بکەم. تەنیا ئەوانەی ئەو ڕێگایانەیان دیـــوە دەزانن چۆن بووە. بەکردەوە بڕۆن لەوانە بپرســـن کە ســـەردانی مێردەکانیـــان، کوڕەکانیان، باوکیان، برایان کـــردووە لە ئەبوغرێب.. با ئەوان باســـی ئازارەکانـــی ڕۆژی دیدەنی بکەن. چەند کەس مەنجەڵی پڕ کفتەی بەسەر داڕژاوە، چەند کەس کەوتۆتە ژێر دەست وپێ یان.. چەند کەس بووراوەتەوە، چەند کەس بەدارو شـــەقی سەجانەکان گیانی زامار بووە.. من ڕۆژێک دایکم گەیشـــتە لام پێش ئەوەی دەســـتی لە ملم بکا بەگریانەوە گوتی (ســـەعدی کورم لێیاندام..) ئیتر تۆ ئەو هەڵوێســـتە ببینـــە وجەرگت چۆن نەبێتە بریـــان، دایکێکی پیرەژن لە هەولێرەوە بۆ دیدەنی کورەکـــەی بێتە بەغدا، لەوێش بکەوێتـــە ژێر رەحمەتی قامچی یەکانی ســـەجانەکان. ئـــێ خۆ منیش بەندم چیم لە دەســـت دێ.. ژن ومناڵەکانـــم نان بـــۆ خۆیان نەبوو بیخۆن دەبوا بـــۆ دیدەنی پارەی رێ ومەســـروف قەرز بکەن یـــان دەبوا خێریان پێ بکـــەن وهەمان کاتیش شـــفتە ودۆڵمە بۆمن بێنن.. ئەگەر خۆیان جلیان لەبەر نەبووا، هەردەبوو لەنێوان چەند دیدەنیەک جارێک بهاتبانایە، ئاخر ئەوە زیندانی یە وئەگەر

خەڵکەکە هەمووی سـەردانیان بهاتبایە یەکێـک چەند مانگێک یان یان چەند جارێک سـەردانی نەهاتبایە، زگی بەخۆی دەسـووتایەوە، دەبوا چاوی لەدەستی ئەوانیتر بووا بۆ خواردن، یان ناچاردەبوو خواردنە پیس وخراپەکەی بەندیخانە نۆشـبکا.. بەشێکی زۆرمان ئەوانەی ژن ومناڵیان هەبووە، خەڵک زەکات و سـەرفترەیان پـێ داون.. خەڵک لە ڕەمەزان خێریـان پێ کردوون، لـە جێگایان گەڕاون کەس بەخـۆی نەگرتوون.. جـا نازانم ئێمە ئێسـتا دەسـەڵاتی خۆمان یان ئەو حزبەی لەسـەری گیراوین چیمان بۆ بکەن تا پاداشـتمان بدەنەوە!!! کە لای کەم لای ژن ومناڵەکانمـان زمانمان کورت نەبێ!!! لای کـەم ئەوەندەیان پێ بڵێین (ها دیوتانە ئەوەی ئێمەی لەسـەر زیندانی کراو ئەوەی ئێوەی لەسـەر ئازاردرا ئەمە بەرهەمەکەیەتی..) بەڵام بەداخەوە ئێسـتاش هەندێک لەو زیندانیانە ولە ژن ومناڵی ئەو زیندانیانە زەکات وسەرفترەیان پێ ڕەوایە..

ئـەی خۆمان چی بۆ مـاڵ و مناڵ وئەو کەسـانە بکەین کە بەهۆی گیرانـی ئێمـە تووشـی ئـازار ودەردەسـەری زۆربوون. تـۆ بڵێ ی شـتێکمان بۆ کرابێ شایسـتەی ئـەو ماندووبـوون وقوربانیدانەبێ..؟

تـۆ بڵێ ی یەکێکی وەک ئێمە ئێسـتا جیـاوازی لەگەڵ یەکێک پێ بکـرێ کە ئێمە لە بەندیخانە دەمان ناڵانـد ئەویش لە بارەگاکان لەگەڵ هاوڕێ ڕەفیق حزبی یەکانی تر بە سەرخۆشـی یادی دامەزراندنی حزبی بەعس وڕۆژی لەدایک بوونی سـەرۆکی فەرماندەیـان دەکردەوە...؟ تۆ بڵـێ ی مناڵی ئـەو جۆرانە لەگەڵ مناڵەکانی ئێمـە جیاوازی هەبێ لە کاتێـک دا مناڵانـی ئێمە خێرەومەنـد دەفتەر وقەڵـەم وجانتا وجل و بەرگی قوتابخانەی بۆ دەکڕین ولەسـەرمان کچەکانمان کۆنە قەمسەڵەی کوڕان وکوڕەکانیشـمان قەمسـەڵەی لەنگە وپینەکراویان لەبەردەکرو لە چلەی زستان کەوشـی لاسـتیکی بێ گۆرەویان لەپا دەکرد مناڵەکانی ئەوانیـش بە ئۆتۆمبێلی دوا مۆدێل وجلی پۆشـتە وسـکی تێر دەبرانە قوتابخانـە..؟ تۆ بڵێ ی وتۆ بڵێ ی چی..؟ من نازانم باسـی هاوار لە دەسـت سـوێی کامە ئازار بکەم کە هەریەکەیان لەوی تر بەسۆ ترن و شایانی سەدان هاوارن و هێشتا قەتماغەیان وشک نەبۆتەوە...؟

دایکی مناڵەکانم بۆی باس کردوم، شـــەوێک لەو شەوانەی بۆ دیدەنی من هاتوون چوونەتە ئوتێلێک وەک دەڵێن ئەو ئوتێلە لە قەزای فەلووجە بـــووە گوایە ســـایەقەکە ئەوێ ی پێ باش بووە کە بـــۆ بەیانی ڕێگاکە ڕاســـتەرێ یە و لە ئەبوغرێب نزیکە. جگە لەوەی هەرزانە وکرێ یەکەی زۆر نـــی یە. دیـــارە ژمارەیان زۆر وچەند خێزانێـــک بوونە. لەبەرئەوەی ئوتێلەکـــە زۆر کۆن دەبێ و ســـەری بە قور وکاریتـــە گیراوە. ژوورەکان جورج تیایـــدا تەراتێن دەکەن.. دەیگێڕایەوە دەیگـــوت (بەو خودایەی هەتا ســـبەینێ لەدیـــار ئەو پۆلایەی عەرەس بـــووم گۆتم نەوەک جورج کەپووی بقرتێنی) پۆلا تەمەنی لە ساڵێک کەمتر بووە. قەناعەتی وابووە کە بەچەنـــد جورجێک دێن کورەکەی دەخۆن.! یـــان لای کەم گوێچکە ولـــووت ودەم ولێـــوی دەقرتێنـــن.! چونکە جورجەکان گـــەورە بوونە. بۆیە تا بەیانی نەیهێشـــتووە خەو پێڵووی چاوەکانی بخاتە ســـەریەک. بەیانیـــش بە بار وبارکۆڵـــە وکۆرپە لە ئامێز بۆ دیدەنـــی من هاتووە..

لە ماوەی دوو ســـاڵ ونیوی گیرانم ئەوەی یارمەتی مناڵەکانمی دابێ یان کەس وکاری هەردوو لامان بووە، یان ئەو خێرەومەندە موسڵمانانەی باوەڕیان بە خێر هەبووە.! یان هەندێک کورد پەروەری دڵســـۆزی خاک ونەتەوەکەی، کە دەیزانی من لەســـەر کوردایەتی گیراوم یارمەتی دەدان. بـــەڵام ئەو حزبەی کە لەســـەری گیرابووم نـــەک درهەمێکی لە گیرفانی مناڵەکانم نەنا کە دەمزانی ئەوان لەناو شـــاخن وتوانایەکی کەمیشـــیان لەبەر دەســـت دابووە. بەڵام گلەیی ســـەرەکیم ئەوەیە تەنیا کەسێک لە ڕێکخســـتن بێ یان لەناو هێزی پێشـــمەرگە تەنیا بۆ یـــەک جاریش لە دەرگایـــان نەدان لای کەم بـــۆ دڵنەوایی. تەنیا بۆ ئـــەوەی پێیان بڵێن ئـــەو پیاوە لەســـەر کوردایەتی وئەندامـــی ئێمە بووە گیـــراوە. بەهۆی ئارام گرتنی ولەســـەر حسابی جەســـتەی خۆی چەندین کەسی لە گرتن وڕاوەدوونان پاراستووە.. تەنانەت ئەوانەی لەگەڵ خۆشم بوون و لەدوای من ئەوان لە شـــەقامەکان پیاســـەیان دەکرد ئەوانیش ڕۆژێک لە ڕۆژان لایان بـــەلای خانەوادەکەم نەکردەوە. من کە ئەو گازاندانە دەکەم مانای

ئـــەوە نییە کە منەت لەســـەر کـــەس بکەم، چونکە کـــە کردوومە وەک ئەرکێکی نیشـــتمانی ونەتەوەیی وام بەســـەر خۆم هێناوە، بەڵام خۆ لە پەیـــڕەوی ناوخۆی هەمـــوو حزبێک هەیە کە کاتێ ئەندامێکی تووشـــی گرتن وکارەســـات دەبـــێ. دەبێ هاوکاری خـــۆی وخانەوادەکەی بکرێ. کامە حـــزب هەیە ئەو مەرجەی لە پەیڕەوی خـــۆی تۆمار نەکردبێ...؟

٧- لەناو بەندیخانەش خەڵکانێک هەبوون، بووبوونە چاوساغی ئەمن و موخابەرات، چونکە ئەوانەی بەناوی سیاسی یەوە گیرابوون نە هەموویان سیاسی بوون ونە هەمووشیان پاک وبێ خەوش بوون. لەناو بەندیخانەی (بەشی سزا تایبەتی یەکان) دایەرەی ئەمن وموخابەرات هەبوون، ئەگەر یەکێک لە ئێمە سزا بدرابایە ئەوا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرا ولە (معجر) زیندانـــی دەکرا، واتە لەنـــاو زیندان زیندانێکی تر هەبـــوو. لەبەرئەوەی خەڵکانێک بەناوی سیخوری گیرابوون ئەوانە پەیوەندیان بە موخابەراتەوە هەبوو. ئەو کەسانەی لە زیندان بۆ ئەمن موخابەرات کاریان دەکرد پێیان دەگوتن (منافق) لەبەر ئەوانە دەبوا ئاگات لە هەڵس وکەوتی خۆت بێ. ڕۆژی ١٩٨٧/٦/١٠ هەندێـــک خوێن گەرمی گیراوەکانی ئێمەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســـتان سەردانی یەکتریان کرد وپیرۆزبایی دامەزراندنی کۆمەڵەیـــان لەیـــەک کرد. دوای چەند ڕۆژێـــک (٣٠) هەڤاڵیان برد و لە ئێســـتگە ناوەندیەکە یەک یـــەک ناویان خوێندرایەوەو بۆ ماوەی ســـێ مانگ لە شـــوێنێکی تر بەندکران و ئازاردران ودیدەنیان لێ قەدەغەکرا.. مامۆســـتا ئەنوەر عەبدوڵا کە بـــۆ یەکەم جار دێتە ئەبوغرێب لە (معجر) دەبێ، لەوێ باســـی چەند کەسێک دەکا کە لەگەڵ ئەو دادگایی کراون و ناوی یەکێک دینێ کەسزای لە ســـێدارەدانی بەسەردا سەپێنراوە. لەوێ کوڕێکی لێ دەبێ ناوی (لوقمان) بەکرێگیراوی ئەمن دەبێ. نازانم لەسەر چی ڕەوانەی (معجر) کرابوو. کەخۆی بەمامۆستا ئەنوەر دەناسێنێ داوای لێ دەکا باسی دادگای بۆ بکا. ئەویش بێ ترس قسەکانی بۆ دەکا. دوایە کـــە هێنایانە لای ئێمە بۆ مـــاوەی هەفتەیەک یان زیاتر لە ناو خەڵکەکە بـــوو، ئێوارەیەک ناوی لـــە بڵندگۆیەکە خوێندرایـــەوە بردیان و تادوای

مانگ و نیویک نەماندیتەوە. کێشـــەکە لەوەدابوو پێشتر هەواڵی دایکی و ماڵەوەمـــان دابوو کە بێنە دیدەنی. کە دایکی هـــات نەمانزانی چی پێ بڵێیـــن.! زۆرمان ســـوێند خوارد کە ئەنوەر لێرەیە هێشـــتا دانەبەزیوە. دوایـــە وارێک دەکـــەوێ دایکی لە گەڕانەوەی دوای ئـــەوەی لەدیتنی بێ ئومێـــد دەبێ لـــە گەڕانەوەی بەبـــەر دەرگای (معجـــر) دا تێدەپەڕێ، ئەنـــوەر لە کونجێکـــی بچوک دەیبینێ و بانگی دەکا (حاجی شـــوکری ئەمن لێرەم، زۆر باشـــم خەمت نەبێ). ئێستاش ئەو حاڵەتەمان زۆر پێ ســـەیرە، کەسانێک ڕژێمێک سزای دابێ و بەند کرابێ دوایە هەر لەماوەی ســـئازادانەکەی و لە ناو زیندان کار بۆ ئەو ڕژێمە بکا.! بۆ دەبێ کەسانێک هەبـــن و وەک ئێمە مرۆڤ بن کە حەزی لە مل شـــکانی خەڵکی تر بێ.

٨ – جگـــە لە جەمەلۆنی یەک و دوو گۆڕەپانەکانیان و مەتعەم دوو مەدرەســـە هەبوون. هەڵبەتە گۆڕەپانی هـــەردوو جەمەلۆنەکە گۆڕەپان نەبوون، بەڵکو دوو هۆڵی گەورەبوون سەریان بە جەمەلۆن گیرابوو بەڵام هەر پێیان دەگوت گۆڕەپان، لە هەموو شـــوێنەکانی تر ناخۆشـــتر بوو. زیندانێک هەبوو پێیان دەگوت (قاف) جا قاف یەک و قاف دو هەبوون. ئەوانەی لە پشـــت دەرگاکانـــی ئەو دوو قافە بوون هـــەر بەناو زیندانی بـــوون ئەگینا بە مردوو هەژمـــار دەکران، وەک لـــە دەرەوەش کەس و کاریـــان زۆربەیـــان بە مردوو دانابـــوو. خەلکی وای تیابوو پانزە ســـاڵ دەرەوەی ژورەکـــەی نەدیبوو.! ئەوانە دیدەنی و هاتنە دەرەوەیان نەبوو. هیـــچ پەیوەندیەکیان لەگـــەڵ دونیای دەرەوە نەمابـــوو. ئێمە کە بەبەر دەرگاکانیان گوزەرمان دەکرد قەدەغە بوو بووەســـتین. هەر ئەوەندەمان دەزانی خەڵکانێک لە پشـــت ئەو دەرگا ئاســـنانەوە هەن. ئەوەش بەوە دەمانزانی کە نانیان بۆ دەچووە ژورەوە. هیچ لێبوردنێک نەیدەگرتنەوە. دوایە لە ســـاڵی ٢٠٠١ بیستم کە هەندێکیان لەو گۆڕە هاتونەتە دەرەوە.

٩ – ئەو ڕۆژەی کـــە دیدەنی بوو گۆڕەپانەکەی بەندیخانە پڕ دەبوو لە چادر، زۆربەیان بە ( گوش) ی لێکدراو دروست دەکران. لەبەر ئەوەی زۆربەی کاتەکان گەرما بوو، بۆ دروســـتکردنی سێبەر زیاتر ئەو خێمانە

که خۆمان دروســـتمان کردبـــوو هەڵدەدراو هەر زیندانیـــەک یان چەند زیندانیەک ئەگەر خزم و ناســـیاو بونایە یان بـــرادەر بوونایە بە یەکەوە دەبوون. تا نیوەڕۆ هەر کەس لەگەڵ خانەوادەکەی لەژێری دا دادەنیشتن، گەلێ جاریش بەیەکەوە نانیان دەخوارد. دوای نیوەڕۆ کە گۆڕەپانەکە چـــۆڵ دەبوو خێمەکان لول دەدرانەوە ئەوســـا چوار چـــوار پێنج پێنج بەیەکەوە لە گۆڕەپانەکە بە یەکەوە پیاسەیان دەکرد بۆ ئەوەی دەنگوباسی دەرەوە بزانن، بەتایبەتی چالاکی هێزی پێشمەرگەوخەلکی تازە کەگیراون و جوڵانەوەی رژێم و مەســـەلە کۆمەڵایەتیەکان و مردن و لەدایک بوون.
یەکێـــک لە گەرمترین و بە پەرۆشـــترین دەنگوبـــاس کە حەزمان دەکرد بیزانین دەنگوباسی لێبوردن بوو،چونکە کەچوینە ئەبوغرێب شتێک نەما کە چاوەڕێی بکەین بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە ناو کۆمەڵ و خەبات تەنیا چونە دەرەوە بوو بۆ دەرەوەی ئەو چواردیوارە، نزیکترین هیوای ئەو شـــتەبوو کـــە ڕژێم ناوی نابوو (لێبوردنی گشـــتی). چونکە لای ئێمە لێبوردن بۆ کەســـێکە تاوانێکی کردبێ.! کەتنیکی کردبێ.! بەڵام دەمانزانی لەو بارو دۆخە ناخۆشەدا تاقە ڕێگابوو بۆ چونە دەرەوەی ئەو دیوارە بەرزانە. دانی ئێوارەی ڕۆژی دیدەنی بەشێک بەوە خەریک دەبوون کەچۆن خواردنەکان لەناو فلینەو تەپەدۆرەکان جێ بکەنەوەو چۆن لەناو سەهۆڵەکە جێگیری بکـــەن تا بۆگەن نەبێ. بەڵام کەم جار وابووە شـــتمان لێ بۆگەن نەبێ.
ســـاڵی ١٩٨٧ ئاســـایی بەڕێ کرا،مـــــــــن ئـــەو چیرۆکانەی لەو ساڵەدا نوسیم ژمارەیەک چیرۆک بوون بەڵام کە ڕەوانەم دەکردنەوە ئیتر نەمدەدیتنەوە، تا دوای بەربونم ئەوســـا چاوم پێیان کەوتەوە.. ســـاڵی ١٩٨٨ ساڵێکی شووم بوو، بەداخەوە لەسەرەتای ئەو ساڵەدا هەموو ئەو هەواڵانـــەی کە لە دیدەنیەکان بۆمان جێ دەما هەموو هەواڵی تراجیدیاو جەرگبڕ بوون. کەمەر شکێن و ورە ڕوخێن بوون. دەنگ و باسەکان بریتی بوون لە هەواڵی کیمیابارانی شوێنە یەک لە دوای یەکەکان و لە هەموان کارەســـات ترهەواڵی پڕ لەناســـۆری کیمیابارانی هەڵەبجە بوو. لە دوای ئەمانەش هەواڵـــی ئەنفال و وێران کردنی گوندەکانی بەدوادا هات. ئێمە

لەناو زیندان تاقە چەکمان (خەم) بوو ئازارەکانی ســاتی دوای بیستنی هەواڵــەکان بوو. بەڵام ئەوەی کرا کرا ئەوەی بە میللەتێکی بێ چارە کرا لەو ســاڵە شوومەدا کرا.. ساڵی ١٩٨٨ ســاڵی وێرانکردن و سڕینەوەی دیرۆکی میللەتێکی ستەم دیدە بوو. ساڵی قڕ کردنی مرۆڤەکانی وڵاتێکی بێ ناوونیشان بوو. ساڵی هەڵوەشانەوەی یاساکانی مافی مرۆڤ بوو لەو دەڤــــــــــەرە. ســاڵی پێشێل کردنی هەموو عورف و عاداتی نەتەوە خواناسەکانی سەر گۆی زەوی بوو. ساڵی وێرانکردنی مزگەوت و کەنیسەو تەکیەو خانەقاو خوێندنگاو بیمارســتان و باخچەی ساوایان و دایەنگەو گوند لە دوای گوند بــوو. خەلکانێکمان لەگەڵدابوو کە چەندین ئەندامی خانەوادەکەی بەر شــاڵاوی ئەنفال کەوتن و چیتر ڕۆژی دیدەنی چاوەڕێی ڕێڕەوەکــەی نەدەکرد تا ناســیاوێکی لێ بەدی بــکا.! لەناو ئەو دیوارە بەرزانەوە لە دەمی ئەژدیهاو لەناو خەمە وشــک بووەکانمان و لە پشــت زەمەنی ئەو دونیایە دەژیاین و تەنیا گوێچکەمان بەشداری ئەو کارەساتە یەک لەدوای یەکانەی دەکرد. مللەتێک کە ئێمە خۆمان بۆی خســتە ناو ئەو بەندیخانەیە تا ئەوان لەدەرەوە ســەرفراز بن، ئێمە بۆ ئازادی ئەوان ئازادیمان لێ زەوت کراو بەند کراین،کەچی ئێمە ئێســتا لەوان ئاســودە ترو بێ ترســترین، پێشــتر خۆمان بە بەندکراو دادەناو ئەوانیش ئازاد، کەچــی بەدیار کەوت لەدیــوی ناوەوەو دەرەوەی ئــەو دیوارە بۆ کورد ئازادی قەدەغەیە. بەڵام ئەوە یاســای ژیانەو ئیتر دوای هەر قوربانیەک سەبر سەبرە هەستەکان ئاســایی دەبنەوە. ئێمە هەر بە هەواڵ زانیمان بــە هەزاران خەڵکی بێ تــاوان بێ سەروشــوێنکراون. لەبەر ئەوەی لە چوارچێوەیەکی تەســک دەسوڕاینەوە دەنگ و باسەکان ڕۆژانە لەگەڵمان نەبوو، بارودۆخی خۆشــمان ئەوەندە باش نەبوو، لەوانەبوو هەر ساتێک ڕژێم ئێمەشــی ڕاپێچ کردباو بۆ تاقیگەی چەکە بایەلۆجیەکان بکراینایە سوتەمەنی.! بۆیە ماوەیەک خەمەکانی دەرەوە کپ دەبوونەوە کە دیدەنی تازە دەهاتەوە خەمەکانیش تازە دەبوونەوە.

## • له دیوی دەرەوەی دیوارە بەرزەکە:

یـــەک لـــە هەواڵـــە ناخۆشـــەکان لـــە١٩٨٨/٨/٨ بوو کە لەســـەر تەلەفزیون بۆ دەیان جار باســـی ڕازی بوونی ( خومەینی) کرد لەســـەر وەستانی شـــەڕ.. ئیتر تەلەفزیۆنەکە (سەدام حوسێن)ی وەک پاڵەوانی سەرکەوتووی شەڕ نیشان دەدا کە لە گۆڕەپانەکانی شاری بەغدا دەهاتە ناو خەلک و قســـەی دەکرد. هەر لە شاشـــەی تەلەفزیۆنەکان ئەو هەمو ســـەماو گۆرانی ریفی عێراقی و (کاولی) یانەیان ڕۆژانە نیشان دەدا کە بەبۆنەی ســـەرکەوتنەکانی (قادسیەی ســـەدام )یان ( قادسیەی دوەم) ئاهەنگیان دەگێڕا.! دیارە دوای ئەوەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو ئەوڕوپیەکان چەندین یارمەتی لۆجستی و هەواڵگریان پێشکەش بە ڕژێمی بەعس کرد، توانی بە ئاســـانی بەندەری فـــاو بگرێتەوەو زیانێکی گەورە لە ســـوپای ئێران بـــداو دوابەدوای ئەویش هەر بـــە یارمەتی ئەمەریکاو ئەوڕوپیەکان توانی ئێران لەســـە، جەم خاکی عێراق وەدەرنێ کە لەکاتی شەڕدا داگیری کردبوون. ئێران ئەوساکە تێدەگاو دەزانێ شەڕ لەگەڵ کێ دەکاو ئەوە عێراق نیە شـــەڕی لەگەڵدا دەکا.! بۆیە خومەینی وەک قسە بەناوبانگەکەی کە کردی ( کە ئاگربەست ڕادەگەیەنم وەک ئەوەیە بەدەستی خـــۆم پەرداخێک ژەهر نۆش بکەم) بڕیار دەدا کە شـــەڕ بووەســـتێنێ.

بەو پێیە سوپای عێراق دەستی والآ بوو. بۆیە بە هەموو هێزو توانایەوە ڕوی کردە شوێنە ئازادکراوەکانی کوردستان و بە ئاگرو ئاسن وغازی خەردەل و کیمیاوی تەڕو وشکی بەیەکەوە سوتاند و.. یەک لە هەواڵە گرنگەکانیان کە تەلەفزیۆن خوێندیەوە، دەســـت بەسەرا گرتنی (سەرگەڵو بەر گەڵو) بوو. وەک لە بەیانەکە گوتی: مەقەڕی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی بەکرێگیراو. ئیتر لە یەکێک لە دیدەنیەکاندا تێگەیشـــتین کەڕژێم ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی هەموو داگیرکردۆتەوە. هێزی پێشمەرگە دوای سەخت ترین بەرگری و پاشە کشە ئەوەی ماوە چونەتە دیوی ئێران. بێ ئومێدی لەدوای ئەو هەواڵانە گەورەی هەڵوێستەکانمان بوو. ئێمە چیمان

کردو مللەت چی بەســەر هات.! جارێکی تر دەبێ کەس ئەو ئومێدەی لا دروست بێتەوە و خەباتی چەکداری هەڵسێنێتەوە.؟ دیسانەوە نسکۆیەکی تر وەک نســکۆی ساڵی ١٩٧٥ دوبارە بووەوەو لولەی چەکەکان ژەنگیان هەڵێنا. بەڵام ئەوجارە کۆســتەکە زۆر گەورەتر بوو چونکە کوردســتان بووبووە (زەوی سوتاو). دارو بەردی بەسەر یەکەوە نەمابوو، لە زۆربەی ناوچەکان کوندە پەپوو بایەقوش لەسەر کەلاوە ڕوخاوەکان دەیانخوێند. گوندێک بەپێوە نەمابوو. مەسەلەی دەربازبوونمان لەو بەندیخانە نەگریسە هەرچەندە تاقە هیوامان بوو بەڵام بۆ وڵاتێکی لێوان لێو لەمەرگەســات و بــێ ئومێدی. مادام لەناو چوار دیــواری بەندیخانەین بیرکردنەوەمان لە بەربوون هێشتا بەشێکی مێشکی داگیر کردبووین.لەناو ئەو چوار دیوارە بیر لە هەر شتیک بکەیتەوە بیر لە هەر کەسێک و هەر شتێک بکەینەوە خەم بۆ هەر شــتێک بخۆین دەبێ لــە دیوی دەرەوەی ئەو دیوارە بەرزە بێ.تۆ بڵێ ی ڕژێم لەدوای ئەوەی لە شــەڕی ئێران دەربازی بوو لەدوای ئەوەی هێزی پێشمەرگەی شکست پێ هێنا و لەدوای ئەوەی بە هەزارانی ئەنفال کرد،دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کەسانێکی لەبیرکراوی ناو زیندانەکان شــتێک لێ بکا..؟ تۆ بڵێ ی لە خۆشــی و شــەکراوی سەرکەوتنەکانی ئەوەی بە خەیاڵ دابێ کە چەند مرۆڤێک هەن لە پشت دەرگا ئاسنەکان قەتیــس ماون..؟ ئــەوە کۆمەڵێک پرســیار بوو لە خۆمــان دەکرد..

ئێــواران دوای ئــەو هەموو نەگبەتــی یە کە بەیەکەوە پیاســەمان دەکرد،ئەو پرســیارانەمان لە یەکتر دەکــرد و هەر یەکە بەپێ ی دید و تێڕوانینی خۆی لێکدانەوەی بۆ دەکرد.بەڵام مەســەلەی دەرچوونمان لەو بەندیخانەیە وەک جاران لا شــیرین نەبوو. بەڵام دەڵێن ئەوەی شــتێکی نەبــێ لای وایــە نەهامەتی هەموو دنیا لەو شــتەیە کە ئــەو نیەتی و بەختــەوەری هەموو دونیا لەو شــتەیە ئەگەر دەســتی کــەوت. بۆیە مەســەلەی دەرەوەی ئــەو بەندیخانەیەمان بە جۆرێک لــە ئازاری تاکە کەســی دادەنا.ئەگەر ئازار و خەمەکان گشــت گیر بــوون تاک هێواش هێــواش خەمەکان بچووک دەکاتەوە تا دێتە ســەر ئــەو ئازارانەی کە

تایبـــەت بە خـــودی خۆیەتی. بۆیە ئێمەش خەمەکانمـــان لەوە لە بازنە درا کە لە بەندیخانەیـــن و ئەگەر نەچینە دەرەوە ناتوانین خەمەکانی تر لەکۆڵ خۆمـــان هەڵدەینەوە.لە ڕووی دەروونی یـــەوە دڵی خۆمان بەوە خۆش دەکرد کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەردەبین و هەوای دەرەوە هەڵدەمژین و لە شـــەقام پیاسە دەکەین و لە شـــوێنێکی فراوان دەخەوین و..هتد..

پیاوێک هەبوو نـــاوی (حەیدەر) بوو،پیاوێکی نەخوێندەواری قســـە خـــۆش بوو،زۆر جار لەگەڵی دادەنیشـــتم،حەزم لە ســـادەیی ئەو پیاوە دەکرد،لـــە حەفتەیەک جارێک یان دوو جـــار پێم دەگوت:- (ئەرێ کاک حەیدەر دەبی ئەو ســـار بە خەوی ســـەربانی ڕابگەیـــن..؟) ئەویش بەو پەڕی ئومێدەوە دەیگوت:- (ئینشـــاالله پێ ڕادەگەین بەرانەکینێ برەک زەعمەتیشە.) دیارە مەبەســـتمان ئەوە بووە بەر لەوەی سەرمای پایز و زســـتان دابێ دەبێ ڕژێم ئازادمان نەکا..؟ ئێـــوارەی ڕۆژی ١٩٨٨\٩\٥ کاک حەیدەر لەســـەر یەک لە خێمە لوولدراوەکان دانیشتبوو ئەو خێمەیە ئەو خێمانە بوو کە بە گوشـــی دروســـت کرابوون کە لە ڕۆژی دیدەنی لە گۆڕەپانەکـــە هەڵـــدەدران و دوای تەواو بوونی دیدەنـــی لوول دەدران و بـــە کۆمەڵ لەبن دیواری جەمەلۆنـــی یەک ڕیز دەکران.چوومە لای کە بە دڵتەنگی دانیشتبوو، دیسان گوتم: (کاک حەیدەر دەبێ بە خەوی سەربانی ڕابگەیـــن..؟) بە نائومێـــدی یەکی زۆرەوە گوتی (ناوەالله،ئەوســـاریش تـــازە تەواو ئەوە پایزە خواعەفوتکا..ســـەربانی چیـــو عاری چی.؟) بۆ بەیانی ســـەعات نزیکەی یەک و نیوی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨\٩\٦ بێژەرەکەی تەلەفزیۆنی بەغدا هەواڵێکی بە پەلەی ڕاگەیاند کە بەیانێکی گرنگـــی دەربارەی ( (الاکـــراد)) و (منطقة الحکم الذاتـــي) هەیە پاش کەمێکی تـــر ڕایدەگەیەنن.. ئیتر ئەوانەی لـــە دەرەوەی جەمەلۆنەکەش بوون هاتنە ژوورەوە،چاو و دەم و گوێچکە بوو بە یەک و هەموو بەرانبەر تەلەفزیۆنەکان نوقەیان لەخۆیان بڕی.ماوەی یەک سەعات هەر ناوە ناوە بێژەرەکە (مقداد) بوو دەهاتە ســـەر شاشەکەو دیگوت ( پاش کەمێکی تر بەیانێکی گرنگتان بۆ دەخوێنینەوە ). لە ســـعات دوو نیو بەیانەکەی

خوێندەوە کە بریتی بوو لە لێبوردنی گشـــتی...ئیتر لە هەموو بەشەکان بووە فیکە لێدان و چەپڵە و هەراو هۆریا. یەک لەو ســاتە خۆشــانە بوو کە مرۆڤ لە ژیانیدا هەســتی پێ دەکا. هەســت کردن بەوەی جارێکی تریش دەبیتەوە مرۆڤی ناو خەلک و ژیانی ئاسایی.! چیتر خانەوادەکەت شلەی کفتەو مەرەگەی بە سەرو گوێلاکی دا نارژێ. بۆ ریز گرتنی هاتنە ژورەوە بەر دارو کێبلی (سەجان)ەکان ناکەون. جارێکی تریش دەچینەوە ناو بازاڕو ســەر شــەقام و ناو کــۆڵان و گەڕەک و نــاو ژن و زارۆک و پیرەمێردەکانــی لای خۆمــان. جارێکی تر تا چاومان بڕ دەکا ســەیری دوور دوور دەکەین و دیوار نابێتە بەربەست.. جارێکی تریش چاومان بە لوتکەی شاخ و یاڵ و قەدپاڵ و خاکە سورەکە دەکەوێتەوە. جارێکی تر لــە بڵند گۆکە بانگ ناکەن (غلق الممر — فتح الممر —یرجی من النزلاء الخــروج الی الســاحە لغرض التعداد...) چیتر ئێواران (ســجان) ە کان وەک ئاژەڵ ئەو خەڵکە پێش خۆیان نادەن و لە ژورەکانیان ناپەســتن.

دوای تــەواو کردنی خوێندنەوەی بەیانەکە ئەو خەڵکە (کوردەکان ) بە تێکڕایی چونە نــاو گۆڕەپانەکەو پیرۆزباییان لە یەکتر کرد. هەندێک لە بــرادەران بۆ ماوەیەک بوو لە یەک زوێر بووبــوون، ئەو رۆژە لەگەڵ یەک ئاشــت بوونەوە. من کاک حەیدەرم بینی لە دوورەوە زەردەخەنەی دەهاتێ. چومە لای و وەک جاران وتم (کاک حەیدەر دەبی ئەوســاریش بە خەوی ســەربانی ڕابگەیــن.؟) ئەویش بەو پەڕی دڵخۆشــیەوە وتی (کــورە ئا..ئا. خوا عەفوتکا.. ئەریوەللە تێر لە ســەر بانی دەنووین.!)

بەو پێیە لە بەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٩/١٤ یەک یەک ناوەکان لە بڵندگۆ خوێندرانــەوە. لە گۆڕەپانی (مطعم) یەک یەک پەنجەمۆریان پێ کردین. مــــن لە دەمژمێر (پێنج و ســیو یــەک) خولەک لە ئێوارەی هەمان ڕۆژ قاچم خستە دیوی دەرەوەی دەرگا ئاسنەکەی (مطعم)...لە دورەوە ســەیرم کرد لە دەروازەی ســەرەکی بەندیخانە کە دەکاتە سەر جادەی ســەرەکی ( ئەبوغرێب — فەلوجە) خەلکێکی زۆر وەســتاون چاوەڕێی زیندانــی خۆیان دەکەن. هەر لە نێوان پێنــج خولەک یان زیاتر یەکێک

بـــەڕێ دەکرا و خەلکەکە لە دوورەوە بەدیان دەکرد، ئاخۆ ئەوە زیندانی کێیە.؟ کە نزیک بوومەوە، هێشتا زۆرم مابوو بگەمە دەروازەکە، چونکە نێوان دیوارە بەرزەکەی (ســـزا تایبەتیەکان ) لەگەڵ دەروازەی سەرەکی نێوانیـــان زۆر بوو.لە دوورەوە دیتم یەکێک لەگەڵ پاســـەوانەکان بینەو بەردەیەتـــی، دەیەوێ بێتە ژوورەوە، پاســـەوانەکان ڕێگەیان لێ دەگرت، بـــەڵام لە دواجار ڕێگەیان دا. بە پەلە بۆ پێشـــوازیم هات. کە لێم نزیک بووەوە زانیم خوا لێ خۆشـــبو ( نەبەز تایەر) ە. لە دورەوە باوەشـــی بۆم گرتەوە و چاوەکانی فرمێســـکی گەرمیان باراند.! چونکە ماوەی دو ســـاڵ و نیو بوو منی نەدیبوو. لە دەرەوەش ئەحمەدی برام ســـەیارەی هێنابوو. کە هاتمە دەرەوە جگە لە ئەحمەدی برام توشی چەند کەسێکی ناســـیاو بووم کە هەر یەکەیان پرســـیاری زیندانی خـــۆی دەکرد. یەک لەوانـــە (حاجی قـــادر مامە) ی دوگردکان بوو. لـــە دوای چاک وچۆنی مـــن بێدەنگ بـــووم چونکە دەمزانی چ پرســـیارێکم لـــێ دەکا!!! ئاخر کوڕەکەی لە ســـێدارە درابوو، دەیویســـت قەناعەت بەخۆی بێنێ دەشێ هەواڵـــی لە ســـێدارەدانی درۆ بێ.! چوینە نـــاو دارخورماکانی بەرانبەر دەروازەی زیندان، لـــە بەرەکەی تری شـــەقامی ( ئەبوغرێب- فەلوجە) کورتەک و شـــەرواڵ و کراسیان بۆ هێنابووم.چونکە من تەنیا شەرواڵ و کراســـێکی قاوەییم لەبەر دابوو. هەر لەنـــاو دارەکان خۆم گۆڕی و پێم وتن بچینە ناو شـــار پێڵاوێک دەکرم چونکە تەنیـــا نەعلێکم لەپێ بوو.

بە شەقامەکاندا شۆڕ بووینەوە. بۆمن رۆژێکی سەرفرازو یەکجار خۆش بـــوو. لە ڕێگا ئەحمەد زۆر بەخێرایی ســـەیارەکەی لێدەخوڕی،بەڵام من داوام لێـــی کـــرد ئەوەندە پەلە نـــەکا من ئەوا دوســـاڵ و نیوە چاوەڕێ دەکـــەم دەتـــەوێ بـــۆ چوار ســـعات لێم تێک بـــدەی.! کە لە شـــاری (توزخورماتو) بۆ نان خواردن لامان دا چێشتخانەیەک،لەکاتی نانخواردن بـــوو کرێکارەکان لەنێوان خۆیاندا باســـی ئەوەیان دەکرد گوایە ئەمڕۆکە دەرگای بەندیخانـــەی ئەبوغرێـــب خراوەتە ســـەر پشـــت، زیندانیەکی زۆر ئـــازاد کـــراون. نەبەزیش ئاماژەی بۆ من کـــرد گوتی (ئەوە یەک لە

زیندانیەکانــە کەتازە بەربووە.!). ئەوان لە ســەرەتاوە باوەڕیان نەکرد کە من پۆشــتەمەو کورتەک و شــەرواڵ و پشــتێنم لەبەردایە،بەڵام کە دڵنیا بوون، نزیکەی دە کەس لەســەر مێزەکەم وەســتان و هەریەکەی چەندین پرسیاری ئاڕاستە کردم. ئێستاش نازانم چۆن نانەکەم خوارد...

گەیشتینەوە بازگەی هەولێر، لەوێش کۆمەڵێک خەڵک وەستابوون،لاماندا لایان و بەخێر هاتنەوەی منیان کرد کە هەندێکیانم دەناسی. تێم گەیاندن کــە ئەوانی تریش لە ڕێگان و لەوانەیە درەنگی شــەو یان بەیانی بگەنە جێ. دیارە دوای داگیر کردنی شــوقەکەمان لەلایەن پاسەوانی تایبەتی (ئیبراهیــم زەنگەنە) خانەوادە دەربەدەرەکــەم خانویەکیان لە گەڕەکی کووران بەکــرێ گرتبوو. ڕوبەرەکەی بە حەوشــەکەیەوە (٥٠) م بوو. لەو کۆڵانەی لای مەیدانی کرێکاران و چایخانەکە لەسەر ڕێگای مەخمور. بــەڵام ئەگەر بەتەنیا بگەڕابوومایــەوە ماڵی خۆم پێ نەدەزانی. کەنزیک ماڵەوە بووینەوە سعات دوای دوانزەی شەو بوو،هەرسێ منداڵە گەورەکانم گوڵاڵە — سکاڵا — هاژە- لەگەڵ ( غازی) خاڵیان بەو شەوە درەنگە لە سەر شەقام وەستابوون. ئێمە هۆڕینمان بۆ لێدان و ئەوان سەیارەکەیان ناسیەوە، بەڕاکردن گەیشــتنە ماڵەوە. بەو نیوەشەوە دراوسێیەکی زۆر لەماڵمان بوون کەمن کەســیانم نەدەناســی.. بەو شــێوەیە جارێکی تر پێــم نایە قۆناغێکی تر لە ژیانێکــی تر و گەڕامەوە ناو کوانووی گەرم و خواردنی گـــــــــــەرم.

دوای هەفتەیەک ویستم بگەڕێمەوە فەرمانگەکەم و سکاڵام پێشکەش کــرد، بەڵام نەیــان گێڕامەوە.زۆر بەدوای کارێک گــەڕام تالە ئەنجام لە ڕێــگای برای زۆر بەڕێزو خۆشەویســتم ( عوســمان جەمیل عەلی ) و بەڕێز (ڕەفعەت ئەندازیار ) کــە یەکەمیان بەڕێوەبەری کارگێڕی بوو لە دیوانی پارێزگای هەولێر و دوەمیان بەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاوی هەولێر بــوو. لە فەرمانگەی ناوبراو / پرۆژە ڕاســتەوخۆکان بە شــێوەی کاتی دامــەزرام و ئەو دامەزراندنەم بووە ســەرچاوەی ژیانم و گەشــە کردنی گوزەرانم بۆیە ئێســتاش خۆم بە قەرزاری ئــەو دوو جوامێرە دەزانم!!!

لـــه کۆگایـــەک کارم دەکـــرد کە پێ یـــان دەگوت (کـــۆگای پرۆژە راستەوخۆکان) ئەوساکە بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکان پرۆژەی ئاویان دروست دەکرد. کورێک بەرپرسی ئەو کۆگایە بوو ناوی (خالد) بوو. لەو شوێنە تا ١٩٩٠/٨/٢ مامەوە کە رژێم کوێتی داگیرکرد وپرۆژەکان لەکار وەســـتان.

لەو ماوەیە هیچ پەیوەندیەکی رێکخســـتن نەمابوو. ئەوانەی کە هەش بوون شانەی زۆر بچووک بچووک بوون بەداخەوە لە ساڵی ١٩٨٩ ئەوانیش تووشـــی ئاشکرابوون هاتن وزۆریان گیران. کاکە زیاد عومەر یادی بەخێر کە بەر لە گیرانم من بەرپرســـیاری ئەوبـــووم رایەڵەیەکی هەبوو، بەڵام لەبەرئـــەوەی من تازە بەربووبووم نەیدەویســـت لێـــم نزیک بێتەوە، ئەو هێڵەش ئاشـــکرابوو، کاکە زیاد وچەند کەســـێکی تر گیران ودرانە دادگا وســـزادران ولە دوای راپەرین بە لێبوردن ئازادکران. ئێمە لەگەڵ زۆربەی ئەو برادەرانەی بەیەکەوە گیرابووین وەک مامۆستا بایز- قاسم شێروانی- نهاد یوسف- نەبەز جواد- تاهیر مەلا محەمەد- مەنگوری- د.نەجات- محەمەدمەخموری- وچەندین کەســـی تر بـــەردەوام لەیەک نزیک بووین بەڵام هیچ پەیوەندی رێکخستنی راستەوخۆمان لەگەڵ خەڵکی تر نەبوو. د.نجات کە لە ســـاڵی ١٩٧٣ لە کووران دراوســـێ بووین من نەمزانیبوو گیرابـــوو بەڵام لە بەندیخانـــەی ئەبو غرێب یەکترمـــان بینی ویەکترمان ناســـیەوە. ئێستا بۆتە (حاجی نەجات) وبرادەری یەکترین. لەبەرئەوەی ئەو بـــرادەرە ئازیزانەی بەیەکەوە گیرابووین ژمارەیان یەکجار زۆرن بۆیە داوای لێبوردنیـــان لێ دەکەم کـــە ناویان نەهاتـــووە. چونکە من تەنیا ناوی ئەو برادەرانەم هێناوە کە کەوتۆتە ســـەر رێگای باســـەکەم یان لە وێســـتگەیەک تووشی بوومە. چونکە نووسینەکەم بە شەمەندەفەر داناوە چ کەوتۆتە ســـەر رێگام ئەوم باس کردووە ئەگینا بە دەیان رووداو هەیە نەکەوتۆتە ســـەر رێگا و وێستگەی شەمەندەفەرەکەم و ناویان نەهاتووە. زۆر ناویش هەبووە بە داخەوە لەبیرم نەماون.



هاوڕێ یانی زیندان لە راســـتەوە: نەجات عەزیز – شـــەهید م.بایز – نووسەر – محەمەد مەخموری




هاوڕێیانی زیندان لە ڕاستەوە: حەویز علی جوکل- نووسەر- نیهاد یوسف شریف- نەبەز جواد قادر- تاهیر مەلا محمد

## - ئەنجامی بیست ساڵی تەمەن:-

بیســـت ســـاڵی پڕ لە هەوراز و نشێو بیست ســـاڵی پڕ لە نەهامەتی وســـەرکەوتن ودابەزین. بیست ســـاڵی ناوەڕاســـتی تەمەن وخۆشترین وهەستیارترین ساتەکان. هەندێک جار لەلای برادەران دەڵێم من گەنجێتیم نەدیوە، لەبەرئەوەی گەنجێتی من ئەو بیست ساڵە بوو کە بەسەر سەدان کۆســـپ وبە پەڕینەوە لە ســـەدان وێســـتگەی ئازار ولە نزیک بوونەوەی چەنـــدە جارە لە مەرگ پـــازم داوە.. کە دەڵێم گەنجێتیم نەدیوە چونکە گەنج بووم و بووم بە ســـەرباز،لەدوای ســـەربازی بـــەدوای پەیدا کردنی پاروەنانێ وێڵ بووم. دوایەش هەموو خۆشەویســـتی و عشـــقم بەخشیە نیشـــتیمانەکەم و نەتەوەکـــەم. ژیانی ئاســـایی خۆم توشـــی تەنگژەی بەردەوام کرد. لەماوەی ئەو بیســـت ساڵە لەوانەیە پێنج ساڵی بە ئارامی نەژیابم. وەک لە پێشـــەوە باســـم کردوە هەر تەنیا ساڵێک لە سەربازی تەندروســـتیم باش بوو، دوایە بەهۆی خراپی خـــواردن ( بەدخۆراکی ) توشـــی نەخۆشی بووم. دوای دەرچونیشم لە سەربازی توشی ڕاکە ڕاکی دوای نان پەیداکردن بووم. بە تایبەتی من کابرایەکی دەســـت وپێ سپی بووم کاروکاســـبیەکی ئەوتۆم نەدەزانـــی تەنیا ئەو کارانەم پێ دەکرا کە بـــە نوکی قەڵەم ئەنجام دەدرا. مەســـەلەی گەڕان بـــەدوای کارو دوبارە نەبوونەوەی سیناریۆکانی پێشتر، زۆر ماندووی کردم چونکە ئەو کارەی بەمن دەکرا وەک لە سەرەوە باسم کرد بە ئاسان دەست نەدەکەوت،دوای دامەزراندن و جێگیر بوونم لەکارو کاسبی ئیتر حزبایەتی و کوردایەتی و خۆشـــاردنەوەو گیران بوو... بەڵام ئەوەی لەو بیســـت ساڵە فێر بووم. ئەوەی جێ ی داخە بەرهەمی ئەو بیست ساڵە وەک هیوا و مەبەستەکانی ئێمە نەبوو. ئێمە بە خەون هیوای ئەوەمان دەخواست کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕژێمی بەعس وەک مۆتەکە لەسەر سنگمان لاکەوێ. ڕۆژان هات و ڕۆژان چوو،ئەو مۆتەکەیە لەسەر سنگمان کەوتە خوارەوە، بەڵام ئەوانەی وەک

ئێمــە ژیانیان بەڕێ کرد و ئەوانەی ژیانــی ئێمەیان ئاوا لێ کرد خراینە یەک تای تەرازوو.. من پەشیمان نیمە لەوەی کردوومە. چونکە ئەوساکە کەس زۆری لێ نەکردبووم. بەویســت و ئارەزووی خۆم گەڵ و نیشتمانم کردە تاقە خۆشەویســتی خۆم.کەس نەهات زۆرم لێ بکا.تەنانەت کەس تکاشی لێ نەکردووم.بەڵام ئەوەیان ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوەی تێک دەداو ئــەوەی چاک دەکاتــەوە هاوتا بن.. یان بە یەک چاو ســەیر بکرێن...

خۆ ئێمــەش دەمانتوانی پشــت لە هەموو پرەنســیپەکان بکەین و سیاســەتی خۆگونجــان لەگەڵ ڕژێمــی بەعس بەکاربهێنیــن. لەوانەیە زەمەنەکە بۆ ئێمە زیاتریش لەبار بێ.. ئەگەر بە هەڵە نەچووبم لە هەموو دیوانی پارێزگای هەولێر تەنیا سێ کەسمان نەبووبووینە بەعسی ئەویش کاک (حەمە زیاد — کە ئێستا بەڕێوەبەری خۆیەتی یە لە هەمان شوێن) و کاک (رەشیدی عارەب — کە ئێستا لە وەزارەتی دارایی یە) و (من).!

پێم وایە ئەگەر شــتێک هەبێ شــانازی پێوە بکەم ئەوەیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بــۆ غەمزەی چاوێکیش نەچوومەتە بــەرەی دژی گەلەکەم. !هەر ئەوەندە سەرمایەشــم لە ژیاندا هەیە بۆ خۆشم و بۆ منداڵەکانیشم.ئەگەر شــتێکم بۆ ملل‌ەتەکەم پێ نەکرابێ ئەوە پێم نەکراوە بۆیە نەمکردووە...

من توانیم بیست ســاڵی سەختی تەمەن بەڕێ بکەم و لە تەمەنێکی درەنگ کڵاو ڕۆژنەی ئاســوودەیی و ئارامــی لە ژووری ژیانم دا کرایەوە. بەڵام ئێستا ئاسوودەم کە ئەوەندەی لە توانامدابەدیم دەکرد خستمە کار.. تا ئەو ســاتەی ئەو نووسینەش دەنووســم هەر دەست لەسەر سنگ بۆ سەرووەری (خاک و خەلک) وەستاوم!!! بەڵام وەک ئەو قەناعەتەی کە لام هەیە.نە لەو قەناعەتە لادەدەم و نە لاشم داوە.دەزانم قوربانیدان لەپێناو سەربەرزی ملل‌ەتەکەت و کەرامەت و شەرەفی دا. کە کەرامەت و شەرەفی خۆشــمان بەشــێکە لە ئەو،زۆر لەوە زیاتری گەرەکە.دیارە من تا ئێستا هەر ئەوەندەم لە توانا دابووە.ئەگەر ئێســتاش خەبات و ماندووبوونمان بە گرنگ نەزاندرێ دڵنیــام لەوەی ڕۆژێک و نەوەیەک دێن وەک دیرۆکی ڕەوشنی نەتەوەکەمان ئەو ڕووداوانە دەخەنە دوو توێ ی کتابی مێژوو..



## کۆتایی کتابی دووەم
٢٠١٠/١٢/١٠

### له بڵاوکراوەکانی نووسەر:

١- زامەکەم مەکولێنەوە – کۆمەڵە چیرۆک ٢٠٠١
٢- شەوە ساردەکان – کۆمەڵە چیرۆک ٢٠٠٥
٣ - هەگبـــەی دڕاو – ڕۆمـــان ٢٠٠٨
٤- هەناســـە و هـــەوراز – ڕۆمانە یـــاد بەرگی یەکەم ٢٠١١

## ناوەڕۆک

### سەردێڕ